... کە ئاوڕت دایەوە پێدەشتێکی پان و بەرینت جێ دەهێشت، ڕووت وەك بەری دەست، بە ئاسمانەوەش، نزیك بە سەرسەرتەوە، قاژەقاژی دەیەها پۆلە ریشۆڵە کە خۆی دەدا لە هەزاران کاسیان دەکردی، هەر دەتوت بۆ مەرگ و دیلیەتی ئەو سەدەها ریشۆڵە بەندکراوەی ناو تۆڕەکەی سەر پشتی کەرە دێزەکەت دەیانقریشکاند، ترسایت لەوەی بە هێزی هەزارەها دەنووك و چڕنووك تۆو دێزەو تۆڕی پڕ لە ریشۆڵە بە ئاسماندا هەڵفڕێنن، هێشتا گەڕەك لێتەوە زۆر دوورە، وای لەو گەڕەکە کۆن و پەڕپووتە، هەر دەڵێی کەچە جلێکەو لە هەزار لاوە پینە کراوە، لەوەدایە هەر هەموو پینەکانی لێك هەڵوەشێن چونکێ خودا لە ئان و ساتی دروستکردنی پەلەی بووەو جەمسەری پینەکانی جوان بەسەر یەکەوە نەدووریوەتەوە، لە شارێکدا کە گوایە بەر لە هاتنی هەر هەموو پێغەمبەرەکان هەر هەبووە، نە بوومەلەرزەیەك رماندوویەتی، نە لافاوێك بردوویەتی، نە لەشکری تورك و عەرەب و عەجەم توانیویەتی ئەو قەڵا تۆکمەو بەرزەی بڕمێنێ، نە گڕکانێك سووتاندوویەتی و نە نەفرەتی یەکێك لەو پێغەمبەرانەش نغرۆی کردووە.

وەك بڵێی کەیفخۆش بیت بەو ڕاوە بە بەرەکەتە یان ترس و تەنیایی و سوێی ساردی ئەو دەمەوئێوارەیە لە خەوت بڕەوێنێتەوە، کەوتیتە سەر ورەوری چڕینی حەیرانێك، پەنابردنە بەر حەیران یەکەم فێڵ و دوا فێڵی سەردەمێکی زۆر کۆنی خۆتە، خوویەك کە فرچکت پێوە خواردووە، چ یادێکی شیرینی ڕۆژانی زوو، چ خەم و حەسرەتێك و قەهرێکی هەنووکە، چ ترسێك بێ لە

داهاتوو.. تۆ دەچریکێنی، کە مەیلی گوتنی حەیرانێك لە دڵتا.. لە ڕۆحتا وەئاگا دێ و دەتبزوێنێ، هەوایەك لە کەللەت دەدا، لەشت گران دەبێ و قورگت دەخورێ و دەمت پڕ دەبێ لە لیك و زمانت بە مێروولە دەکەوێ و تەوێڵت گەرم دادێ وەك کەسێك کە گرانەتای گرتبێ، لە نێوان کەیفێك و ژانێکدا رادەمێنی وەك هەنووکە، تا دێ هەناسەت خۆشتر دەبێ، ئەوەتا ئێستاش لە بەندێك دەگەڕێی.. بەندێك لەو سەدەها بەندەی وان لە دڵتا، وەك مۆسیقاژەنێکی عاشق کە گەمە بە ژێیەکانی کەمانجەکەی دەکا ژێیەکانی ناو قورگت پاك دەکردەوە، بە خرۆشێکی خۆشەوە سەدای ئاوازێك لە دوورەوە دەهاتە بەرگوێت کە هەر سەدای دڵی خۆت بوو، پێچاوپێچ دەهات و تێکەڵ بە شێوەی شیرینی (هەمین)ێ دەبوو.. لە ناکاو تێت چریکاند، چریکەیەك بەسەر قاژەقاژی ریشۆڵاندا زاڵ، چریکەیەك کە ئەو دەشتە چۆڵ و سامناکە ئاوەدان بکاتەوە و سەداو ناڵەی غەریبت بگاتە گوێی هەمینێ:

*حەیران حەیرانە..*

*حەیران هەمینە..*

*قۆندەرەی زەردە و گۆرییەی چەلینە..*

*بەژنی رەشە رێحانە..*

*گەردنی شانەشینە*

*روومەتی بەفرو خوینە*

*سەری مەمکانی شەکرن.. بنیان هەنگوینە*

*برۆننە کاری خودای گەلە گەلەك رەنگینە*

* * *

*ئەوجا دەڕێم حەیران حەیرانە.. حەیران (هەمین)ە..*
*گەردەنی زەردەو مەمکی هەنگوینە*
*روومەتی گوڵەو سینگی سپینە*
*سوندەکەم خواردیە بە (سوڵتان عەولاّ)ی..*
*بە (حوسێنی غازی)*
*پاش ئەو غەدار بابەی چ دۆستان ناگرم..*
*چ یارم نینە*

*  *  *

*ئەوجا کیژ دەرێ: هەتیمە لاوە*
*ئەورۆ ئێوارێ وەرە مارێ مە*
*دەستی راستەت باوێ سەر شاملیێ بە کەزی*
*بۆن کە خاڵیێ لە گەردەنی*
*راستو چۆپی قەنەفران..*
*دەربینە شەمامان*
*هەتا مەلای سبەینێ دەرێ: ئەڵلاهو ئەکبەر*
*ئەستێرەی جەدی هەڵدێو کازیوەی دەدا*
*لە بۆ خۆت شەمامان بۆن کەو.. غەمان بڕەوێنە..*

*  *  *

گرمەی گەواڵەیەكو لە خرۆشی حەیرانو چریکەی خۆشی کردی، کتو مت لەوە دەچوو لە خەو رابچڵەکیت، سەرت بەرز کردەوە، ئاسمانی پڕ لە هەورو هێڵ لەوەدابوو داتەپێ، دەیپرووشکاند، بەیانی زوو کە هاتیتە دەرێ" هەمین سێ جاران مەچەکی گرتیو پاڕایەوە:

(لەبەر خاتری من.. دەبا ئەورۆ نەچیتە راوێ..!)

نا.. بە گوێت نەکرد، بۆ خۆی گوت، ئەوەتا بە خۆو بە تۆڕێکی پڕاوپڕ لە ریشۆڵە دەچیتەوە، قاژەقاژیان ئەم دەشتەی ئاوەدان کردۆتەوە، پێ هەڵدەگری تاوەکو فریای ئەوە بکەویت بەرلەوەی تاریکی و سەرما و باران گەرەك خامۆش بکا.. تۆ سەرسامیان بکەی، ئاخ گەر ئەو هەورو هێڵە نەبووایە، ماڵی ئەوە بوو کە دوو سێ بەندان بچڕی، ئەو هەورو هێڵەی بەری قیبلەی گرتووەو.. وا بەتاو دێ، کەمجار وا رێك کەوتووە، خودایە بەخێری بگێڕی، ئەو تاوە خۆشی و دڵگەشی‌یەی لێ نەشێوێنی، بەیانی‌یەکەی هەر ئەوە بوو کزەیەکی دەست و پێ تەزێنی هەبوو، چ بە ترس و بیمە هەوری رەش و سوور تێکەڵی ئەم ئێوارەیە، لە نیوەڕۆوە کزەکەی نەما و کردی بەو (با) سەرشێتە، ئەو (با)یەی بۆتە فووی (ئیسرافیل) و هەوران پف دەدا، هەوران رادەدا، بە ئاسمانان پەرش و بڵاوەیان پێ دەکا، هەوران لێکیان دەخوڕی، گەر بباریێ دەیکا بە لافاو، لافاوێکی بێ ئامان، هەمین خەونێکی گەلەك ناخۆشی گێڕایەوە، زستان بێ بەقا و متمانەیە، دەربەست نی‌یە کە تۆ شادیت یان غەمگین.. تێریت یان برسی.. دەربەستی ئەوەش نی‌یە چەند کەلاوەو کۆلێتی هەژاران دەڕمێن، چەندانی وەك تۆ وا لە نێو دەشت و دەرو سەحرا دان، بێ کە پەنگ و چەترو دەوار، بێ سایەو سەربان، تۆ خەمی خۆت نی‌یە، خەمی ئەوەتە هەنووکە (هەمین)یش بەڕێوە بێ، بەوە چاکە ئەو وا لە ناوشاری، دەتوانێ بە چارۆگەکەی یان بەرانپیلەکەی سەرو پرچی لە باران بشارێتەوە، بچێتە ژێر چەترێك یان خۆی بداتە پاڵ دیوارێك، یان

ژێر تاقی سەر دەرگایەك... هەنووکە وەختی خۆیەتی.. ئان و ساتی ئەوەیە هەمین لە ماڵە ئاغاو بەگلەران بگەڕێتەوە.. تا نەگەڕێتەوە ئەو ماڵە خامۆشە رووناك نابێتەوە.. (عەمرەکەم هەمین.. چاوەکەم هەمین)، ئەویش دەڵێ: (بە بێ بایزی دونیا وێرانە).

ئەڵڵاه.. ئەگەر برسیەتی و دڵەڕاوکێ و ترسی دوژمنداری نەبووایە.. ئەم دونیایە چەندە خۆش دەبوو دەروێش.. لەوە پتر چیت دەوێ..؟ نێرەکەرێك و تۆڕێکی پڕ لە ریشۆڵەو.. (باڵای هەمین)ێ.. ئەڵڵاه.. دەبا بباریێ.. قابیلە کۆنە سەپانێکی وەك تۆ رقی لە باران بێ؟ مەحاڵە.. هەر دڵۆپێك و گوڵەگەنمێك، هەر گوڵەگەنمێك و پاروە نانێك، هەر نانێك و گوڕوتینێك، هەر گوڕوتینەو هەنگاوێك و... هەر هەنگاوێك و سەفەرێك و خۆشی‌یەك و ماچ و دەست لەملانێ و قریوەیەك، دەبا بباریێ، بارانی خۆشی و بەرەکەت و هات، بارانی نەجات.. خودایە بەخێری بگێڕی، بەری قیبلە سوورەو رۆژئاواش رەش، پەڵەیەکی رەش وا هات و سکی داداوە، دەڵێی دەعبایەکی ئاوسەو ها ئێستا نا ها تۆزێکی دیکە دەزێ، دەزێ و وێڵاشی دەتەقێ و خوێناوێك وەك باران، بارانێك وەك خوێناو شار دەشواتەوە.. خێر بڵێ دەروێش.. ئەم هەورە لە چارۆگەی رەشی هەمین دەچێ (با) بیشۆینێ..

(هەمین وریا بە.. با نەخلیسکێی ژنێ)

هەمیشە لەبەر خۆتەوە دەیدوێنی.. لەوپەڕی دونیابێ وەڵامت دەداتەوە...

تەواو.. تا دێ ئاسمان رووی خۆی تاڵ دەکا، تۆ دەتوانی بە

پێی پەتی بە نێو ئەو وەردو شیوەدا مل بنێی، زۆرت بۆ هات، چش لەو قوڕە زێلاقەیە، پێڵاوە لاستیکییەکان دادەکەنیت، نێرەکەریش ترسی نییە، بەر لە خۆت دەگاتەوە ماڵێ، دەڵێی زانیویەتی شتێك دەقەومێ، دەنا ئەو نەرمە غارەی بۆچییە؟ تەنها بنیادەم نەبێ.. دەنا هەر هەموو جڕوجانەوەرێك.. مارو مێرووی سەر زەوی هەمووی چاوی غەیبی هەیە، پێشبینی دەردو بەلاّو گڕکانو بوومەلەرزەو لافاویش دەکەن.. عەجایب.. ئەی ئەو هەموو نوێژو تەهلیلەو ویردو خەڵوەتکێشییە لە پای چی؟ دەی دەروێش کەشفو کەراماتێك.. هاواری شێخ کە، لەم دەشتە چۆڵە، هەنووکە، بایەقووش دیار نییە.. گەر بکەویتە ناو قوڕو لیتاوێك، کەندێك، چاڵێك.. کەسێك نایە بە دەنگتەوە، تۆ جێ دەمێنیو کەرەکەشت بە بارێك ریشۆڵەوە لە هەمینێ وەژوور دەکەوێ، هەمین دڵی دادەخورپێ.. لە تەنگەتاوی خۆی گوێی کەرەکە رادەکێشێو هاوار دەکا:

(ئەدی بایز؟)

هاوار دەکەی.. لەو چاڵەی تێی کەوتووی، یەکێ لەو چالاّنەی کە خۆتی تیا مەلاّس دەدەی تا ریشۆڵەکان ڕاو بکەی، ئەو چالاّنەی بە دەستو پەنجەو نینۆکە شەقاربووەکانت هەڵیدەکۆڵیت، بە ئارەقەی نێوچەوانت قوڕە خەستەکەی شل دەکەیتەوە، لەو چاڵە چۆڵەی نێو ئەو دەشتە کپو خامۆشە.. هاوار دەکەی.. بارانیش بەسەرتا دەبارێ، چاڵێکی ئەوەندە قووڵیش نییە، بەلاّم برسیەتیو ماندوێتی بڕستیان لەبەر بڕیویت، تۆ (یوسف) نیت تا کاروانێکی سەرەڕۆ بە رێکەوت

بەوێدا بڕواو هەڵتکێشێ، (عەزین)ێکیش بتکرێو (زولەیخا)یەک جەستەی لە ئارەق شەلاڵت بشواتەوە، پاشان عەترت پیا بپژێنێ.. زولەیخا کێیە دەرویش؟ سەد زولەیخا بە قوربانی پەنجەیەکی هەمین بێ، بە تۆ چی زولەیخا؟ کێ وەک هەمین تۆ دەبینێ؟ کێ وەک ئەو لەگەڵ حەیران و لاوک و درۆکانت دەخرۆشێ..؟ کێ..؟ ئەو شەوەی کە دڵت لێی کرمێ بوو.. پێی وتیت:

(باپیر ئاغا کێیە؟ سمایل بەگ چ کەرێکە؟)

کۆشکی چیو کەلاوەی چی؟ دڵنیا بە جگە لە خۆت چ سوارێک نییە ئەو ماینە بێ لغاوو زینە رام بکا...

مەترسە گەر باریو کردی بە لافاو، گەر کەوتیتە چاڵێکو لە قوڕ چەقیت.. هاوارکە:

(هەمین)..

یەکان دەر دوو زەوی بەرت دەدا، لە هەر کوێ بێ گوێی لە دەنگتە، چەندین جار پێی وتیت، هەورو هێڵ بوو مەچووە دەرێ، (ئەو رزقەمان لە خودای دەوێ).. ناکرێ.. یەک دوو مانگی ترەو ریشۆڵەکان دەچنەوە کوێستان، ئەم مەلە جیقن و هیچانە چەندە عاشقە زستانن، کەی بەفر باری ئەوسا پتر کەیفیان سازە، نێرەکەر لە نەرمەغار کەوت، ئەو تۆڕە پڕە هێسترێکی گەرەکە، قاژەقاژی ریشۆڵەکان ئەوەندەی تر زەندەقی بردووە، کەری تاین سەری لەو قاژەقارە دەرناچێ، کەر نەبووایە دەیزانی بەندەواریو بە تۆڕەوەبوون چ زەحمەتە، تازە ئەوان تەواو.. جارێکی تر نە ئاسمان دەبیننەوەو نە دەچنەوە کوێستان، دوو سێ رۆژی دیکە دەبن بە مەزەی چەند ئارەق خۆرێک، هەزار حەیفو مەخابن، تۆ

بەو سەرماو سۆڵەیە ئەو ریشۆڵانە راو بکەیت و ئەو مەست و مل هوڕانە بیخۆن.. گوایە دەڵێن:

(خەفەت لابەرە..)

جا تۆ چ بزانی؟ لەوە ترسای لە نیوەی رێ ببارێ، تا دەگەیتەوە ماڵێ ئێسقانەکانیشت تەڕ دەبن، خەمی ریشۆڵەکانتە، جا ئەو مەلە مەلعونانە چ باکیان بە تەڕبوونە؟ سکیشت پێیان دەسووتێ، عومرێکە ڕاویان دەکەیت و کەچی تا ئەمڕۆ ریشۆڵەیەکت سەر نەبڕیوە.. (سلێوە) لەوە داخدارەو هەموو جارێك هاوار دەکا:

(ئیسلامی حیزو دز پیاوکوشتن ئاو خواردنەوەیە لە کنتان.. بەلانەکینێ رەشۆڵە سەر نابڕن.. ها؟)

(سلێوە پیاوم بکوشتایە چم دەکرد لە هەولێرێ.. هەنووکە لە کاولە گوندەکەی خۆمان دەبووم)

(باشە کە ئەتوو ئەوەندە بە رەحمی لۆ راویان دەکەی؟)

(برسیەتی سلێوە.. برسیەتی)

(سەد کاروکاسبی دیکە هەیە)

(جا گاوری گاورباب چ ماوە نەیکەم..؟ چایەچی، قاپ شۆری لۆقنتەکان، توونچی، حەمباڵی، چەرچی...)

(ئەدی نابینم هیچت بە هیچ کردبیتن؟)

(لە فرت و فێری بازاڕ نازانم.. پاشانیش رازی نابم کەس هاوارم بەسەردا بکا.. ئەمن ملم لە بەرملی ئاغاکان دەنا، ئەو ئاغایانەی دەیەها زەلامیان لە چاڵ دەناو کەس نەیدەوێرا بڵێ: لەل)

(قسەکانت زلن دەروێش..)

(زل یان گچکە.. راوە رەشۆڵەم پێ شەریفترە.. هیچ نەبێتن خۆمو دەشتێکی کاکی بە کاکین.. رازی نابم بۆ پاروەوە نانێک کەس بمکا بە کەری خۆیو گوێم رابکێشێ)

(باشە ئەفەندی ئەتوو دەزانی ئەو رەشۆڵانەی توو بە کێ دەفرۆشم؟)

(چاك دەیزانم.. ئەو مەیخانەیەی تەنیشتت)

(یانێ ئەتوو بەو زستانە ئارەقەی ڕەشو شین دەردەدەی تا ڕاویان دەکەی.. ئەوان دەیکەن بە مەزەی ئارەق خواردنەوە)

(چ لە توو بکەم کە خودا ناناسیت..)

(جا دەروێش کە ئەتوو دەیانکوژیت.. چ شێخەکەت بیخواو چ ئارەق خۆرێك، پاشان وەکی توو خودای دەناسم).

(جا ئەگەر زکم پێیان نەسووتابا خۆم سەرم دەبڕین.. بۆ سەر بڕینەکەو پاککردنەکەی پارەی پترم لە جەنابت وەردەگرت)

ئەو جارە زیاتر پێی لێ داگرتو لێتی پرسی:

(ئەگەر ئەتوو ئەو پەپوولەیەی، لۆ هاتیتە شاری؟)

ئا.. نەکەی.. ئەو حەرامزادەیە دەیەوێ قسەت لێ بدزێ، دەیانەوێ ئەو نهێنییە بزانن، دەشیزانن.. بەڵام نا.. قەت نابێ لە دەمی خۆتەوە ببیستن.. دەیانەوێ بڵێی:

(ژنێکم هەڵگرتو گوندم بەجێ هێشت)

با بەو قەهرەوە بمرن، ئابڕووی (هەمین) ئەوەندە هەرزان نییە لە کنت..!

ئاوڕێکی دزانەت دایەوە، هێشتا گردی (کلك مشك) لێتەوە

دیار بوو، هەر لەم ئاقارەوە.. هەر لەم ڕێگەیەوە هاتنە هەولێرێ.. هەردووکتان پیادە بوون، ئەوەندەی بیرت مابێ هێشتا بەهار بارگەو بنەی نەپێچابۆوە، تا گەیشتنە ئێرە سێ جاران لە پشتێت کرد، ترس راوەدووی دەنان، ترس لە (باپیر ئاغا)و لە پیاوەکانی، لە باوكو براکانی، لە شوانو گاوانو سەپانو پاڵەو کوڕ گەلی گوندی راوەدووی دەنان.

زوو زوو پێی دەوتی:

(دامنێ بایز.. حەرامە..!)

تۆش لەو تەماسە خۆشەی هەردوو مەمکی بەسەر هەردوو شەپیلکی شانتەوە خۆش نەدەبووی، ئەو کەیفە کەمە بە ئاستەم لەو ترسی راوەدوونانو هەڵات هەڵاتەی کەم دەکردەوە.

تۆش زوو زوو پێت دەوت:

(عەلی شوون هەڵگریان هینابی.. جێی پێیەکانمان دەبینتەوە.. با لە هەندەك جێ.. شوێن پێی یەك ڕێبوار دەستخەڕۆیان بکات.)

هیچت پێ نەبوو، جگە لە قەڵەمبڕێك کە جاروبار بە دەم ڕێوە گیاو گوڵی بەهاریت پێ دەقرتاندو کێویانە داتدەکرماندو بەشی (هەمین)ت لێ دەدا. ئاخر (ئاغا) وەك بڵێی زانیبێتی نیازت خەراپە تفەنگەکەی لێ سەندیتەوەو پێی وتی:

(بایز.. ئەتوو حەیرانبێژی.. تفەنگت ناوێ!)

جگە لە بوخچەیەکی پڕ لە شڕوشیتاڵو چەند پارووە نانێك هیچی دیکەتان پێ نەبوو، بە دەم (با)ی غارەوە ساتمەی دەکردو دەکەوتو دە جاران دووبارەی کردەوە:

---

(بایز.. دەترسێم وەکی "مامەند"ی بتکوژن و لۆ عیبرەتی دونیایێ ئەمنیش وەکی "زێڕین"ێ لێ بکەن.. لە نێرەمووکەکی یان شێتەکی مارەم بکەن.)

بۆ ئەوەی پێ هەڵبگرن و بگەنە شاری و خۆتان دەنێو کوچەو کۆڵانەکانی ون بکەن، دە جاران عیبرەتی (عەیشێ)تان بۆ یەکدی گێڕایەوە، چی‌یان لە (سمایل و عەیشێ) نەکرد؟ دوای یەك شەو لە بەدووکەوتنەکەی عەیشێ، چل سمێڵ بابڕی داخدارو تووڕە کەوتنە دوایان، بەر لەوەی بگەنە (قەرسیلۆك)ی سیامەند ئاغا و خۆ دەخیلی دیوەخانەکەی بکەن، وەك دوو قەتێی باڵ شکاوو ماندوو ڕاوکران، لە بەرەبەیانی‌یەکی زوودا هەردوو عاشقە رووتەیان لەو چۆڵ و قەفرایە کوشت، بە هەڵەداوان گەڕانەوەو بەسەر ئەسپەکانیانەوە نێرانە دەلەنگینەوە، وەك نێرەکەوو ماکەوێکی کوژراو بەسەر پاشەڵی دوو ئەسپی بەڵەکدا دوو قەد شکابوونەوە، باسکی (عەیشێ)یان بە بازنەکانەوە بڕی و لەسەر دەرکی دیوەخانەدا هەڵیانواسی تا ببێ بە عیبرەت بۆ هەر هەموو کچانی گوندی، کچان و ژنانی ئاواییش سەرکزانە لە هاتن و چوونیاندا چاویان بەرایی نەدەدا سەیری ئەو دەستە بکەن کە سەدەها جار لەو چۆمەی خوار ئاوایی گۆزەی لە ئاو پڕ کردووە.

قۆناغە ڕێیەك و لە مەزاری (ئەسحابە رووتە)ی لاتان دا، هەمین کێلەکەی لە باوەش گرت و هەردوو باسکی تێوەرێنا، بە کوڵ و دڵ دەگریا و لە خوداو ئەسحابەو پیاوچاکان دەپاڕایەوە کە ڕێی ئاغاو پیاوەکانی، باوك و براکانی هەڵە بکا، پڕ بە دڵ حەزت دەکرد، ئەو حەلە، لە بری کێلەکە تۆی لە ئامێز بگرتایە، لێی

گەڕای فرمێسکان بڕژێنێ تا هیچ نەبێ کەمەکێ هێور بێتەوەو ئەو ترسەی لە رۆحیا بارە کەم بێتەوە.

بە شەرمێکەوە پێت وت:

(هەمین بەسە با بڕۆین دەنا دەگەنە سەرمان)

بە قەهرێکەوە وتی:

(ترس نەبایە ئەوشۆ لە ژێر ئەو گومبەتەی دەنووستین.)

لە گومبەتێ هاتنە دەرێ، هەر لە نزیکی مەزارەکەوە نووشتایتەوە، گوێت بە زەوییەکەوە نا تا بزانی ئاخۆ گورژنی سمی ئەسپان نایە، هەمین لە دوای ئەو گریانە بە کوڵە خەنییەوە، هەر زوو خەندەکە لەسەر لێوانی کوژایەوە.. کت و پڕ لێی پرسیت:

(بایز.. گەلەك دەترسێم بچینە شاری و لەوێ نامرادو هەناسە ساردم بکەی.. نامرادم ناکەی بایز..؟)

(هەمین ئەوەندە بە نامەردم دەزانی؟)

(حاشا بایز.. بەس هەر ئەوەندەیە دەترسێم..)

بە ئومێدی پیاوێکی عاشقەوە دڵنیات کردەوە:

(مەترسێ هەمین.. قەت مەترسێ.)

ساتمەیەك و خۆت بە پاشەڵی کەرەکە گرتەوە، هەورەتریشقەیەك و رەشۆڵەکان کەوتنەوە سەر قاژەقاژێك کە ئیدی برانەوەی بۆ نەبێ، لە ترسی قاژەقاژەکە کەوتەوە نەرمەغار، کەوتیتەوە سەر خەیاڵی مەرگی ئەو مەلە جیقنانە، سبەی ئێوارێ دەبنە مەزەی ئارەق خۆرەکان، خۆت چەندە ئالوودەی سەربەستی و کەچی ئەو مەلە رەشانە لەو خۆشی فڕین و ئازادییە

بێ بەری دەکەی، دەیانخەیتە ناو تۆڕێكو دیلیان دەکەی، دەیانفرۆشیت، ئەو ئێوارەیەی راوەکەت گەورە بێ" خەڵکی گەڕەك منداڵە چڵمنەکانیان دەنێرنو هەر یەکەو درهەمێك لە نێو لەپی چڵکنو ئارەقاوی خۆیدا دەشارێتەوە، کزۆڵەو سەرسام دێنە بەردەمت، وەك ئەوەی دڵی خۆیان دەنێو مشتیانا بێ چاوەڕێن.. سێ چوار رەشۆڵە بەسە بۆ ئەوەی تامی شلە ساوارەکە خۆشترکا، هیچ نەبێ تامەزرۆی ئەو مناڵە چڵێسانەی پێ دەشکێ، ئەوان بیخۆن خێرترە لەوەی ئارەق خۆرەکان بیکەن بە مەزە.. بەڵام چ دەکەی؟ ناچاریت بیاندەی بە (سڵێوە)، زۆرجاران پێیان دەڵێی:

(درهەمەکان ببەنەوەو بیانخەنە ناو دەخیلەکانتان)

کتو پڕ رۆژێك مانت گرتو بە خەڵکی گەڕەکت گوت:

(تەواو.. داوای رەشۆڵە لە من مەکەن!)

هەر هەموو دەستیان بە یەك داداو حەپەسان:

(ئاخر چ بووە؟ چ کرایە؟)

هاوارت کرد:

(ئەو بیژیانە لە خۆتان کافرترن.. لەبەر چاوی من بە مووسی کول ملیان دەقرتێنن..!)

(ئێ خۆ "سڵێوە"ش هەر سەریان دەبڕی..!)

(گووی دەخوا لەبەر چاوی من سەریان ببڕی)

نەیان دەزانی چۆن چۆنی دڵت نەرم کەنو لەو غەزەبەت کەم کەنەوە، ناچار پەنایان بردە بەر هەمینێ، بە دوو دەست لە ملانێ ساردی کردیتەوە، بە دزییەوە پێت گوت:

(باشە هەمین.. بەس با دوو هەفتە هەر بە درۆ خۆم گران

کەم..!)

بە هەزار تکاو پاڕانەوە، ئاشتیان کردیتەوە، بەڵێنیان دا ئیتر خۆیان بێنو مناڵە چەتوونو چڵێسەکانیان نەنێرن، ئەو منالانەی خۆیان بۆ راناگیرێو گوێزانێکی کول یان چەقۆیەکی ژەنگار لە ملی باریکی ریشۆڵەکان هەڵدەسوون، نان پەیداکردن وا نابێ دەروێش، خودا لە گوناهی هیچ نەتخاتە دۆزەخ، لە پای گوناهی ئەو تەیرە بێ دەستەلاتانە ئاگری جەهەننەمت پێ خۆش دەکات.. دواجار.. شێخ قادریش لێت هەستایە سەر پاشووان..

(بایز ئەتوو دەورێشی تەکیەی منی.. تەکیە ئەوەندەی هەیە نانی خۆتو ژنەکەت بدات)

(یا شێخ خودا لۆ ئەوەی دروستی نەکردیمە دەست لە گونان درێژتر ئەێی دانیشمو.. شۆربای تەکیە بخۆم.)

(شۆربا چییەتی ناشکور)

(هیچی نییە.. بەلانەکینێ خودا رقی لە پیاوی تەوەزەلە.. ئەو خۆی فەرموویەتی: لە توو هەرەکەتو لە من بەرەکەت.)

(جا ئەتوو رەشۆڵەگرتن بە هەرەکەت دادەنێی.. ئەتوو وا خەریکە لە نوێژو ویردو تەهلیلەش بێ بەری بیت)

(ناچارم..)

(ناچار نیت.. ئەتوو چاك دەزانی کە سڵێوە رەشۆڵەکانت بە کێ دەفرۆشیتن.. خێرو بێری توو دەچێتە ناو ورگی ئارەق خۆرەکانی ناو هەموو مەیخانەکانی هەولێرێ.. دەیکەن بە مەزە.. دەزانی خودا لە پای ئەو گوناهە، لە رۆژی قیامەت، چیت لێ دەکا؟)

---

کە ئەو پرسیارەی دەکرد دوو لوولەی باریکی بریسکەو گڕ لە چاوەکانی دەپڕژان، یەکە یەکە بەوپەڕی ترسەوە لە هەر هەموو دەروێشەکانی روانیو دەیویست بە چاو پێیان بڵێ کە ئاگری دۆزەخ وا لەبەر دەمیاندا.. دووبارەی کردەوە:

(دەزانی چت لێ دەکا؟)

(نەء..)

(کێمو زوونو سیانو پەنگرت لۆ دەکا بە مەزەو دەتداتێ)

(هەر ئەمن پێی نافرۆشم)

(بەس راوچی‌یەکانی دیکە وەکی توو پیاوی تەکیەو تەریقەت نین.. پاشان ئەتوو گوناهێکی گەورەترت هەیە.. تا کەنگی "هەمین"ی ژنت دەنێریتە ناو کۆشکو تەلاری ئاغاکانو بەگلەرانو ئەفەندی‌یە تەوالێت لووسەکان؟ کوڕم گوناهت دەگاتێ.. با واز لەو شیرو هێلکە فرۆشتنە بێنێ.)

(هەمین ئاگای لە خۆیەتی یا شێخ.. پاشانیش ئەو بە رووتی ناچیتە ناو کۆشکو تەلارەکان؟)

(بەس لەو شوێنانە فەرزەندەکانی شەیتان گەلێ زۆرن)

(گەر وابی.. ئەوە شەیتان لێرەش هەیە.. لە ناو رۆحی منو توو دەروێشەکانی دیکەشدا هەیە.)

(بەس هەموومان بە زیکرو تەهلیلە دەری دەکەین.. ئەو زیکرو تەهلیلەی کە ئەوە سەری دوو مانگە ئەتوو توخنی نەکەوتی)

(ئەمن لە "هەمین"ێ ناترسم)

(کوڕم گەر قسەکەی توو راست بووایە ئەوە پێغەمبەرانو

ئەسحابەکان و پیاوچاکان ژنەکانیان لە کونی ژوورێدا نەدەبەستەوە؟)

(هەزار درورد لە رۆحی هەموویان.. کەس لەوان پێویستی بەوە نەبووە خۆی و ژنەکەی برەنجێن تا پاروو نانێك پەیدا بکەن..)

(هەر قسان مەکە.. با فریشتەکان نەفرن و تەکیەکەم بەجێ بهێڵن.)

(بابە شێخ.. قسەکانت لە جەرگم دەدا.. ئەتوو لە کنت وایە ئەمن لە خۆشیان خۆ دەدەمە بەر باوو بۆران.. نێرکەریش خۆی لەو دەشتە سارد و چۆڵەدا راناگرێ.)

(رۆڵە.. ئەتوو پیاوی تەریقەتی.. ئەوە دوو مانگە دووجاران نەهاتیتە ناو هەڵقەی زیکرو تەهلیلە.)

(راست دەکەی بابە شێخ.. بەس راوە رەشۆڵەش هەر ئەو دوو مانگەیە.. گەر دوو عانە پەیدا نەکەم.. مشك بکەوتە ناو کەندووم کلکی ئارداوی نابیتن!)

ئای دەروێش.. یاشێخیش هەر وەکو سڵێوە دەتدوێنێ، لەبەر سێبەر کەروێشکە خەو دەکاو خەون بە حەفتاو دوو حۆری رووتەوە دەبینێ، رووباری شیرو هەنگوین، میوەجاتی سەد رەنگ و بۆن، غەریقی بۆنی بخورد، سەری لە ژێر گومەزێکی بۆنخۆش و ژێریشی فەرشی کاشان، لە گەرمیان و کوێستانەوە مەرو بزن دێنن و لە بەر پێی موبارەکی ئەودا سەریان دەبرن، ئەم چوزانێ لەبەر چی خۆت هاوێشتە ناو تەکیەو پێنج ساڵانیش هەر لە لای خۆی چایەچی بوویت.. ئاشپەز، تەنها لەوێ.. لە ژێر پەنای شێخ و دەنێو هەڵقەی زیکردا نەیاندەتوانی بتدۆزنەوەو

بتکوژن.. کێ دەیزانی کە ئاواهی بەم تەمەنەوە.. وا بە جحێڵی دەبیتە پیاوی تەریقەت و جێنشینی تەکیە؟ هەر هەمینی کەلەکەوێت بوو تۆی راپێچا و پێی وتیت:

(بایز خۆت بخە ناو خانەی خوداو پێغەمبەران.. دەنا هەردووکمان دەبیننەوەو دەمانکوژن)

(کچەتیم.. ئەمن هێشتا هەڕەتمە.. هەموو شەوێك دوو جاران دەپەڕمو کە دەشنووم شەیتانی دەبم.. تەریقەتم پێ راناگیرێ.. هەمین وازم لێ بینە با نەکەومە بەر لەعنەتی خوداو پێغەمبەران)

(وە نەکەی دەتبیننەوەو دەتکوژن)

ساتمەیەك و.. رابوویتەوە.. بە پێی پەتی دوو هەنگاوت نا، پێڵاوە لاستیکییەی پێی چەپت لەو قوڕە خەستە جێ ما، لیتاوێك نەیدەهێشت هەردوو پێت لە ناو پێڵاوەکاندا جێگیر بن، تاوێك پێڵاوی چەپ و تاوێك راستەت لەو قوڕە عاسێ دەما، قەیتانەکانی پساون.. پێرێ شەو هەمین راستەی بە تەلێك بەستەوە، چەپەشی بە داوە بەنێك لە مووی کلکی کەرەکەت، بەم دوو پێڵاوە لاستیکەوە نەدەگەیشتیتەوە نەرمەغاری نێرەکەرەکەت، ماکەرەکەی جارانت گوێ رایەڵتر بوو، ئەویشیان پێ گۆڕیت، چما ئەو خەڵك و خوایە چیت پێ ناگۆڕن؟ خوا، کارو کاسبی، ژن، ماڵ، ماکەر، دین و ئیمان.. دەبێ هەر هەمووی بە کەیف و هەوای ئەوان بێ.. کەیف و هەوای باپیر ئاغا.. شێخ قادری لەپ کەسك.. سڵێوە.. پێیان وتیت:

(دەروێش عەیبە.. ئەو ماکەرە بفرۆشەو نێرەکەرێك بکڕە.. لۆ دەروێشێکی وەکی توو جوانی نییە بکەویتە دووی قوونی

ماکەرێکەوە.)

ڕەنگە دێزە بۆنی بەڵایەکی کردبێ، دەنا قەت وا خۆی شێت نەدەکرد، یان هی نەرمە بارانەکەیە.. (با)ش هەوری ئاسمانانی رادەداو لەسەر ئەو دەشتە وەك عەبای ڕەش هەڵیدەخست، مارو مێروو چوونەوە کونی خۆیان، باڵندەکانی ئاسمان دیار نەمان، نە سرتەیەو نە ورتە، زورگەکانیش لە دوورەوە کەوتبوونە ژێر تەم تومانێك، بۆنی خاکی تەڕو هەوای ساردو.. تا دێ ساردتر.. دەستەکانت دەخەیتە نێو هەردوو گیرفانی شەڕواڵەکەت، ئەو دوو دەستەی لە سەد لاوە شەقار بوون، ئەو دەستانەی شەختە بەندەکان دەشکێنێ و.. سەعات و دوو سەعات لە گوریسەکان گیر دەبن و چاوەڕێی قەتارەو ڕەوەی بە بەرەکەتی ریشۆڵەن، چاو دەبینێ، رادەمێنێ، هەموو زەین و خەیاڵ و ئاوەزت لایانە، لەوە دەترسیت گوریسەکە رابکێشیت و بە پشتدا وەرگەڕێیت و تۆڕی بەتاڵ و هەزاران ریشۆڵەی قورگ پڕ گەنم و جۆ هەڵفڕن، لە دەمی خۆت و هەمینێ دەگریتەوەو لە بەردەمی ئەو ریشۆڵانەدا رۆی دەکەی، زیت و زیرەکن، زۆر جار فریوت دەدەن، تاوێك نیشتن و تاوێك هەڵفڕین، چاوەکانیشت وەك جاران نین، ئەمێستا کزترن، ئەو دەستە بۆرو زبرو شەقاربووانەی هیچ ئافرەتێك حەزیان پێ ناکات، کەچی هەمین شەوانە نانوێ گەر ماچیان نەکات، هەموو شەوێکیش دەستی راستەی نەخاتە بەر باخەڵت خەوی لێ ناکەوێ، تۆ بڵێی هی ئەو ترسە نەبێ، ترسی ڕەدووکەوتن و هەڕەشەی باوك و براکان؟ بایەکی سارد ئاو لە چاوانت دەهێنێ، دەم و لووتت بە جامانەکە دەشاریتەوە، وەك ئەو دزانەی شەوانە

دێنە سەر ماڵان، خەوت سووکە، دەنا ئەو شەوە مانگاکەیان دزی بوویت، دەرگایەکی تەنەکە چی‌یە؟ بە لەقەیەك دەکرێتەوە، وا چاکە دەرگایەکی ئاسن بە رادان بدەیت، دونیا پڕ بووە لە دزو حیز، ئەوە شارەو.. شاریش پڕە لە سەگ‌و گورك، دەرگاکەت بگۆڕە، دزان مرخیان لە مانگاو نێرەکەرو مریشکەکانت خۆش کردووە، بەوە چاکە کە خەوت سووکە، کەوتنی گەڵایەك، جریوەی چۆلەکە، خشپەی پشیلەش وەئاگات دێنێ، هێشتا پاشەڵت تەڕەو تەزوویەکی سارد لە بڕبڕەی پشتتەوە تا تەوقی سەرت مێروولە دەکات، رەوە ریشۆڵەیەك رووەو رۆژئاوا باڵ لێك دەدەن، گوێ گرانت بۆ فڕکەی باڵیان هەڵدەخەیت، چ هاش‌و هووشێکی ترسناکە، سەرت تەپەو لەشت گران، کێ ناڵێ دوای دوو سێ رۆژی تر ئەو رەشۆڵە ئازادانەی سەر لە بنی هەورەکان هەڵدەسوون نابنە دیلی تۆ؟ لە تۆڵەی ئەو خەیاڵە خەراپە جیقنە بارانیان کردیت.. بە سەری پەنجەی شایەتمانە ئەو کەم جیقنەیەی سەرکەپووت سڕی‌یەوە. چ قەدەرێکە بە رووی دونیادا دەجەنگێ، تارمایی‌و ترسی ئاغاکان، هەڕەشەی بابە شێخ، فڕو فێڵی سڵێوە، ترسی لێ خۆش نەبوونی براکانی هەمین، تارمایی ئەو ترسە وەك سێبەر هەر بە دواتەوەیە، لە لا کۆڵان‌و نێو قەیسەری‌و سێبەری مزگەوتان، لە نێو قەڵەبالغی بازاڕی کۆنەفرۆش‌و سەفارچی‌و تەنەکەچی‌و کوتاڵ فرۆشان، چایخانەی کەوبازان، گوزەری ئاسنگەران‌و دارتاشەکان، دەلاڵخانەو کۆڵانە تاریکەکانی خمچی‌یان، حەجمانت لە بەر بڕابوو، قاپ شۆرینی لۆقنتان؟ کاری ژنانەیەو چیدی نایکەم.. ئەی چی بە هەمینێ

بڵێی..؟ چایەچی؟ نەدەکرا، لەوەدا بوو هەر بە ڕێکەوت یەکێکیان ڕێی بکەوتایەتە چایخانەکەو بتیکوشتایە، ببە پۆلیس.. هیچ نەبێ تۆڵەسێنەکانی گوندی، براکانی هەمین لە تفەنگی شانت سڵ دەکەنەوە، پۆلیسیش هەر دەکا پیاوی خەڵکی، هەر شەوەی پاسەوانی کوچەو کۆڵانێک، دەبوو تا ماویت بە دوای پیاوی جەربەزەو ئەشقیاوە غار بدەی، ڕۆژێکیش بە دەستی چەتەیەك دەکوژرای، هەر ئەو گاوربابە راوە ریشۆڵەی لە لا خۆشەویست کردیت.. لە هەموو کارێك چاکترە، لەو دەشتە چۆڵ و هۆڵە خۆت بزر دەکەیت، نا.. رۆژێك دێ بتدۆزنەوەو بتکوژن و لاشەکەت بکەنە خۆراکی قەل و داڵ، زۆربەی بەیانیانیش ژان دەچێتە دڵتەوە، ئەو بەیانیانەی دەیەها ریشۆڵەی دەنووك شکاو لەسەر شۆستەی جادەکان دەبینیت، لە نێو قوڕو لیتاو خەڵکی بێ ئاگا پێیان لێ دەنێن، دەپلیشێنەوە، ئەوان چوزانن چۆن راویان دەکەی، چی ئەو ریشۆڵانەی گەیاندۆتە سەر شۆستەکان؟ وای لە منالە چەتوونەکان، ئەم شارە بەسەر دارلاستیکدا وێران دەبێ، تۆ بڵێی دەنێو دەنووکی واشەو هەڵۆکانەوە بەر ببنەوە..؟ هەر دەڵێی هەموو شارەکە دەستی لە کارو کاسبی هەڵگرتووەو ریشۆڵە راو دەکەن، جاران دوو سێ راوچی بوون، هەنووکە لەوەتەی ژمارەی مەیخانەو ئارەق خۆرەکان زیادی کردووە، راوچیش خەریکە زۆر دەبن، بەوەی باشە هەمووان بەرگەی سەرما و سۆڵەی زستان ناگرن، رۆژانی وەك ئیمڕۆ سارد زۆربەیان غیرەت ناکەن لە ماڵێ بچنە دەرێ، گەش بوویتەوە، هەمووان بەغیلیت پێ دەبەن، (نامەردینە.. من نەك هەر لەم دەشتە لە

هەمووتان نێرترم.. نێرەمووکینە.. هەمین خۆیم بۆ شل بکات هەموو شەوێك دەپەڕم.)

راوچی‌یەکانی برادەرت بە یەك دەنگ قۆشمەکەت دەقۆزنەوە:

(ئەشەهەدوو.. دەروێش ئەشەهەدوو.. پیاوی تەریقەت نەبوویتایە.. کەس نەیدەوێرا لەو دەشتە لەگەڵ توو بمێنێتەوە.)

(نەء.. هەموو شتێك و ئەوە نا)

عەیامێکی زۆریش خەونت ئەوە بوو سلێمان پێغەمبەر ئاسا ببیتە پادشاو سەرداری هەر هەموو تەیرو باڵندەی ئاسمانان.. نابیت.. تۆ کابرایەکی دونیاییت، ئەم ریشۆڵە بەستەزمانانە راو دەکەیت و دەرخواردی مەیخۆرەکانی دەدەی، تۆ بڵێی جگە لەو پیرە هەولێرەی لە چ شارو وڵاتێکی دیکەی دونیا کەسپی وا هیچ هەبێ؟ هەموو ساڵێك چەند دانەیەکی هەڵقە لەپێ راو دەکەی.. تێ ناگەی کێ ئەم هەڵقە وردانەی لە قاچی چەپ یان راستی رەشۆڵەکان بەستووە؟ دەبێ ئەو کەسەی ئەوەی کردبێ چ مەبەستێکی هەبووبێ؟ هەندێ جار کە بەختت یار دەبێ، ساڵانە یەك دوو جار دەیەها هوزارو مەلی رەنگین دەکەونە ناو تۆڕەکەتەوەو بە پارەی مۆڵ لە بازاڕی کەوبازەکان دەیانفرۆشیت، هەندێ جار رەشۆڵەکان بە دەنووك بەر دەبنە گیانی ئەو مەلە رەنگین و غەریبانە، سەیرە.. دەستیان لێ دەدەی، هەست دەکەی لەشی رەشۆڵە مێیەکان و هەر هەموو مەلەکانی دیکە لە هی نێرەکانیان گەرمترە، دەبێ حیکمەتێکی تیا بێ، هەر کە کۆچیش دەکەن بە پەڕو باڵی تازەوە کۆچ دەکەن، لە ترسی دوژمنەکانیان رەنگی هێلکەکانیان دەگۆڕن، برسیەتی نەبێ ئەوە کەی راوی

پیاوە؟ لەوەتەی دونیا دونیایە مرۆڤ مەڵو ماسیو حەیوان راو دەکا.. چ خەمێکی گەورەیە کە نابڕێتەوە. جا تۆ خەم لە چی دەخۆی؟ ئەوەتا ئەمڕۆکە پیاو راوی پیاو دەکات، مرۆ لە رۆژانی ئەشکەوتەوە تا هەنووکە وازی لە راو نەهێناوە، هەموو گیاندارەکانی سەر زەویو ئاسمانان هەر هەمان راو دەکەن کە لە سەرەتای بوونەوە هەبووە، تەنها.. هەر بە تەنها مرۆڤ نەبێ کە هەزار فڕو فێڵو تەڵەو فاقەو بەندو باوی بۆ راو دروست کردووە، حیکمەتێکی تێدایە، شتێك لەسەر شتێکی دیکە دەژی.. دەلەوەڕێ.. دەخوات.. هێی چ ناشیرینە ئەم حیکمەتە.. هەمین زوو زوو پێت دەڵێ:

(دەروێش.. ئەمن لەوەی دەترسێم رۆژەکیان خودا قودرەت بداتە ئەو رەشۆڵانەو بە گوریسو تۆڕەوە لۆ حەفت تەبەقەی ئاسمان بتفڕێنن..)

بۆ نا..؟ ڕێی تێ دەچێ.. لە تۆڵەی ئەو هەموو ساڵانەی راو بتبەنە ئاسمانێك جگە لە هەورو هێڵو بەفرو بارانو تەرزە هیچی دیکەی تێدا نەبێ، نێرەکەر زیاتر تاوی سەند، ئەوەتا ئاوایی لە ژێر تەنکە تەمو تاریکی ئاسمانێکی بە هەورو هێڵ وەدەرکەوت، چاوت هەڵبڕی، گەڕەك لە دەعبایەکی هیلاكو خەوتوو دەچوو، هەنووکە هەر لە دوورەوە تا دەگەیتە بەرماڵەکەی خۆتان مناڵانی گەڕەك لە کۆڵانە دوورو نزیکەکانەوە دادەبارێنو خۆتو کەرەکەت سەغڵەت دەکەن، زاقو زریقی ئەوانو قاژەقاژی ریشۆڵەکانو هاتو هاوارو سڵاوو جنێوی باوكو دایکانیان ئەو گەڕەکە دەخاتە سەر هەلەکەسەما، ئەو ئێوارانەی بە تۆڕی بەتاڵەوە

دەگەڕێیتەوە پیاوانی گەڕەك و ژنان و منالەکانیان مەزاقیان پێ دەکردی، ئیمڕۆ ئێوارە سەر بەرزانە.. نێرانە گۆچانەکەت با دەدەیت و بە چەپ و راستدا سلاو دەکەیت و وەك سەرهەنگێك جەنگێکی کوشندەت بردبێتەوە سەر دەلەقێنی و زەردە دەتگرێ، ئەم ئێوارەیە تۆلەی هەموو ئێوارەکانی دیکە دەکەیتەوە، ئەو ئێوارانەی دلساردانە پێلاوەکانت لە دوای خۆتەوە رادەکێشا.. ئەو ئێوارانەی پێیان رادەبواردی..

(ئەمڕۆش هیچ..!)

سانایە.. سانا.. ئەوەتا ئەمڕۆکە بەختت یار بوو، پشتێنەکەت شل بۆوەو تا لە قاچەکانت نەئالابوون دەرکت پێ نەکرد، لە نێو قوڕو چلپاوەکە خشی بوو، ئێوارە بە هەمین دەلێی بێ نوێژ بوویت و دەیشوات، مەنجەلە ئاوێکت بۆ گەرم دەکات، هەمین هەرخۆی دە دوانزە ریشۆلەش سەر دەبڕێ، چونکە تۆ دلت نایە، وەی لە سینگی تورتی ئەو ریشۆلانە، بۆنی گۆشت و کەفاوی سابوون و خۆشی راوێکی تێرو هەوەسی گەرمی نێو حەمام خوێنت گەرمتر دەکات.. پشتت دەشوات.. بە سەری پەنجەکانی هەردوو کۆلنجت بۆ دەگرێ.. دەمارێك شل و دەمارێك رەپ، هارتر دەبیت ئەو وەختەی پشتت چەور دەکاو بە ناو لەپی دەست کۆلنج و لاملت دەشێلێ..

(دەروێش، ئەو رۆژە ژنەکەی ئەمین ئاغا داوای لێ کردم کۆلنجی بگرم)

(جا گرتت..؟)

(ئا.. بەرام گۆتی: ئەوەندە باسی ئەو شێلانە جوانەی تووم لۆ

ئەمین ئاغای کردی‌یە.. حەز دەکا بیشێلی..)

(شتی وا نەکەی هەمین)

(کوو دەیکەم؟)

(هەمین.. ئەمن لەو کابرایەی بە شکم.. عومری من‌و توو شکیان نەگۆتی‌یە.. بەس تووخوا واز لەوێندەرێ بێنە..)

بە گوێی کردیت.. پێی بڵێی: بمرە.. دەمرێ..

ئەوەتا لە دوورەوە بە هەڵەداوان هاتن.. ئەو لەعنەتی‌یانە.. هەریەکەو چاوەڕێیە ریشۆڵەیەکی بخەیتە دەست، هەرجارەو دە دوانزەیەك بەریان دەکەوێ، تا هەتیوەکان وەستا بن نایدەی بەوانی تر، تا منالأنی حەماڵ‌و گاوان‌و کۆنە جووتیارو پاڵەو شاگردە چایەچی‌و کەبابچی‌و لۆقنتەچی وەستا بن نایدەی بە کوڕە پۆلیس‌و سەربازەکان، دەمەوئێواران لە بەردەرگاکان‌و نێو دوکانەکان سێ‌و چوار کۆ دەبنەوە، گلەیی لە زەمانەو بەختی هیچی خۆیان دەکەن، کەسانێکی برسی‌و رەش‌و رووت، تووڕەو تۆسن لە تاو زەرەرو بێ بەشی‌و بێ کاری، دەرویش.. تۆ لەوە سەرت سوڕماوە، بۆ دەبێ ئێوە برسی بن‌و کەسانێکی دیکە تێر؟ نە مەلای گەڕەك، نە بابە شێخ وەلامی ئەم پرسیارەت نادەنەوە..

(بەخێر بێیتەوە.. ئەو رۆکە شێر دیاریت)

(ئەی خۆ رێویش نیم)

ئەو هەموو منالأنە.. سەرکەو بنکە.. دەتوت لە کونە دیوارەکانەوە، لە کەلێنی خشتە خوساوەکانی دیوارە گلێنەکانەوە، لە ژێر بەردو داری حەوشەکانەوە، یان نێو گەلی دایکیانەوە دەردەپەڕن، قاقای پێکەنینی ئەو پیاوە ماندووانەی

بـۆنی گریانیـان لـێ دێ، نرکـەو ناڵـەی بێهێـزو کـوژاوەی ئـەو دایکانەی لە ناو ژوورەکانیانەوە هاواریان لە مناڵەکانیان دەکرد کە بێنەوە ژوورێ، ئەو ژوورە تاریکانەی کە جگە لە شەڕو گریانو برسـیەتیو تـەڵاقو پێکـدادان هیچـی دیکـەیان نـەدیوە، کاریتـەو شـەقڵەی رەش، حەسیری داڕزیـوو هـەڵتۆقیوو داکـەوتوو لـە ژێـر بارستایی قورسی خۆڵو گڵ، ئەو هاتو هاوارو غەڵبەغەڵبەیەی کـە سـواوە، چەشـنێك دەدوێـن، چەشـنێك پـێ دەکـەنن، چەشـنێك دەگرین تا بیسەلمێنن هێشتا زیندوون، رۆژ تا ئێوارە بە شـەڕ دێن تا بیسەلمێنن ئەمەیان گەڕەکە نەك گۆڕستان، قوڕو چڵپاوی کۆڵان غارغـارێنی مناڵـەکانی گران دەکرد، زۆربەشـیان پـێ خـاوس، زوو زووش هەڵدەخلیسـکان، مـام رەشـید، بـە بەغالەتـەوە، لـە نـاو دوکانەکـەی روو نیشـتووەو لـەو تـۆڕە پـڕ لـە ریشـۆڵەیە رادەمێنـێ، تۆ وەك هەمیشە لەوێدا ساتمە دەکەیتو خۆت بە کەفەڵو قوونی کەرەکە دەگریتەوە، مام رەشی چاوی ئەوەندە پیسە سوار بە سەر ئەسپەوە دەگلێنێ، بەرد شەق دەکا، رۆژێك مابێ نەفەسـی پیسـی تۆو کەرەکەت دەکوژێ، ژنەکان بە مەکرەوە پێت دەڵێن:

(خۆشی لە هەمینێ.. ئەمەش پیاومان هەیە؟)

یەك دوو پیاو دەنەڕێنن: (بڕۆ ژۆرێ.. دەم درێژ...!)

تاوە بارانێك دایکردەوەو مناڵەکان لێت تەکینـەوە، گەیشـتیتە ئاسـتی ماڵەکـەی عـەونی زوڕنـاگیۆ" ئـەو گـەوادەی ژنەکـەی بـۆ قەسابە تورکمانـەکان دەبات، گـەوادی بـێ بـاك، خێراتـر کەرەکـەت تاودا نەبا عەونی سەر دەربێنێو تۆش ناچاری سڵاوێك بکا، خـۆ (کارەبا)ی ژنی.. هەر بۆ خۆی کارەبایە، مێردمناڵانی گەڕەك لە ناو

---

باخچان باخچەوانێکیان بە سەرەوە گرتبوو، بوو بە هەڵلا لە گەڕەکێ، عەونی وتبووی: (ژنەکەم جوانەو بوختانی لۆ هەڵدەبەستن!)

کە دەگەیتە لای (شێمە)ی دوکاندار بە تەوسەوە پێت دەڵێ:

(خودا رزقی داوی!)

ئەم قسەیە یانێ (کوا قەرزەکانم؟).. ئەوەتا قومارخانەکەی (رەسوول کەساس) زرمەی دێ، سیخناخ بە پیاوانی تووڕەو تڕۆ کە ژن‌و دایك‌و خوشکانیان دەغەزار کردووە، کە دەیبەنەوە کەیف ساز، کە دەیدۆڕێنن بەوانی دەڕێژن، لە سەری کۆڵانێ ئاوڕێکت لە مزگەوتەکە دایەوە، پیرەمێردەکانی گەڕەك بە لاکەلاك رووەو مزگەوت هەنگاوی سستیان دەنا، خێرا هەواڵی راوە چەورەکەت وەك ئاگری ناو پووش بە گەڕەکدا بڵاو بۆوە، بێ باك لە باران، پیاوان‌و ژنان دەهاتنە بەردەرگا و لە مناڵەکانیان دەخوڕییەوە، دەیانویست بەشی خۆیان لە تۆ بقاچێننەوە...

(سەرتان بە گۆڕی بابتان.. کەرەکەم شێت مەکەن..)

بە کەیف‌و هەواوە گۆچانەکەت دەوەشاندو بەر شان‌و شەپیلك‌و پاشەڵی مناڵەکان دەکەوت، ئەوانیش هەڵدەبەزینەوە، مناڵانی مل باریك‌و لاق باریك، باریك‌و بنێس، سپێنەی چاوانیان زەرد هەڵگەڕاو، بە دەم رێوە سۆفی برایم بەخێرهاتنەوەی کردی‌و پێی وتیت:

(دەروێش.. لە پێرێوە یا شێخ لێت دەپرسێ)

زارێ رێی پێ گرتی: (دەروێش.. تازە لەوێ بووم.. قاپە شیرێکم دەویست.. هەمین نەهاتبۆوە..)

دڵت داخورپیا.. نەهاتۆتەوە؟ خۆ زۆربەی ئێواران زووتریش لەم وەختە دێتەوە، خێراتر پێت هەڵگرت و نەقیزەیەکت خێوانده لا کەفەڵی کەرەکە، ئەزیەتی پێ گەیشت و.. تاوی سەند، چاوێکت هەڵبڕی.. دوور بە دووری سێ چوار پیاو و ژنت بینی.. نزیک قاپی دەرگای ماڵەکەت وەستا بوون.. نەتناسینەوە.. دەرودراوسێی دەروێش دەیانزانی ئەو پیاوە وردیلەیەی کەوتۆتە دوای کلکی کەرەکەی بە پەلەیە لە ناو دەرگاکەوە (هەمین)ی کە لەکەوێت بە پیریەوە بچێ، ئێوارەیەک و دوو.. دە.. سەدان ئێوارە، هەر تۆزێکی دیکەیە و کۆڵان و بەردەرگاکان چۆڵ دەبن، هاتنەوەی دەروێش نەبووایە ئەم هەڵڵایەش بەم ئێوارەیە سارده دانەدەمەزرا، دێزە وەک بڵێی بۆنی ئالیک و ئاخوڕی خۆی کردبێ چوارناڵە لە غار نەدەکەوت، بە گومانەوە لە پیادەڕۆکان ورد دەبوویتەوە، بە دەست و پەنجەیەکی لەرزۆکەوە کلیلەکەت خزاندە ناو قفڵەکە و پێچێک و دوو.. باتدا.. زنجیرەکەت لە هەڵقەی قفڵەکە دەرکێشا و ماندووانە بە لەقەیەک دەرگات لەسەر ماڵی خامۆش کردەوە، مانگاکە لە جێوە راچەنی و پاش تاوێک کەوتەوە کاوێژکردن، پرمەی نێرەکەرو قاژەقاژی ریشۆڵەکان خامۆشی‌ی حەوشەکەیان شکاند، ئەو ماڵە کپ و تاریک و مردووە بەو قاژەقاژە زیندوو بۆوە، تا دەهات تاریکی بەسەر دڵ و کەلاوەکاندا دادەڕژا، ئەو هەورە رەشەش تاریکتری دەکرد.. ماڵ بێ هەمینێ چ ترسناکە..!

هەر بە پەلە پەقرەجێکت لە بەرمیلەکە پڕ کرد، تۆڕی پڕت لەسەر پشتی کەرەکە داگرت، پەقرەجەکەت خستە بەردەمی، کە زانیت هەناسە بڕکێی پێ کەوتووە، پەقرەجەکەت لابرد و خستتە

بەردەمی مانگاکە، گەرەکت بوو تا هەمین دێتەوە ئەو ترس و تەنیاییەیە بڕەوێنێتەوە، لە کادینەکە پێنج شەش جام (کا)ت هانی و لە بەردەم مانگاکە ڕۆت کرد، لە بەرهەیوانەکەش جامێک (جۆ)ت لە تەلیسێک دەرهانی و تێکەڵی (کا)یەکەت کرد، دێزە لمووزی بۆ برد، تۆ نەتهێشت، بە ئەستوندەگی ناوەڕاستی هەیوانەکەوە بەستتەوە، بە چوار دەوری خۆتدا خولایتەوەو لە هەیوانەکەوە ملت ناو لە ژوورە تاریکەکە دەستت کوتا تا لە دەلاقەکە فانووسەکەت دۆزییەوە، شقارتەیەك.. شووشەکەیت هەڵبڕی و فتیلەکەت ئاگردا، تاوێك بە شەوارە کەوتیت و، هێدی هێدی کەل و پەلی ناو ژوورەکەت ناسییەوە، هەموو شتەکانی جێ پەنجەی (هەمین)یان بەسەرەوە بوو...

(هەنووکە.. هەر دێتەوە..!)

دەمەو ئێواران بە دەم ڕێوە چی پارچە خشت و تەنەکەو بوتڵ و قوتووی بەتاڵ و شڕو شیتاڵی دەست بکەوێ.. دەیانهێنێتەوە، دەیانخاتە ناو بەرانپیلەکەی..

(چی‌یان لێ دەکەی هەمین؟)

بەکەڵك دێن.. هەر بەو خشت و بەردو تەنەکانە حەمامێك و کادینێك و کۆلیتێکی دروست کرد، ژنی ماڵدار هەر لە هیچەوە ماڵ دادەمەزرێنێ، هەمین نەبووایە کرمەڕیز دەبووی، مانگاکە بۆڕاندی، پڕوشەی باران بەر ریشۆڵەکانی بەرهەیوانەکە دەکەوت و لە خۆشیانا یان لە ترسانا لە قاژەقاژ نەدەکەوتن، ئەوەندەی کە تینت تیابوو تۆڕەکەت بەرز کردەوەو رووەو ژوورەکە بەکێشت کرد، سێبەری بەردەوام شکاوی خۆت لەسەر دیوارەکان، قاژەقاژی

ریشۆڵەکانماڵەکەیان لێ کردی بە ماڵی جنۆکان، وەك ئەوەی بترسیت بە تاو تا بەردەرگای حەوشەکە رۆیشتیتو بە چەپو راستی کۆڵاندا روانیت، کەس بە دەرەوە نەبوو، چ زوو بزربوون، یەکەم ئێوارەیە مناڵەکان تا ناو حەوشەکە نەیەن.. عەجایب.. وەك بڵێی بۆ کارەساتێك تۆیان جێ هێشتبێ.. ویستت هاوار بکەیتو هەموو گەڕەك لە خۆت کۆ بکەیتەوە، یەکە یەکە لە دەرگاکان بدەیتو هەر مناڵەو ریشۆڵەیەکی پێ ببەخشیت، هەر تەنها بۆ ئەوەی ئەو ترسە کتو پڕە بڕەوێنیتەوە، ئێوارەیەکی تەڕو تووشە، تاریك.. ناشیرین.. غەمهێن.. خەریکە کەیفی راوەکەت بکوژێ.. هەرچەندت کرد نەتدەوێرا بچیتە ژوورەوە.. عەجایب.. تۆ کەی ئەوەندە بێ غیرەت بوویت؟

(ماڵت شێوێ هەمین.. ئاخر چەند جارانم گوت پێش ئەوەی تاریك دابێ.. بگەڕێوە..)

بێ ئۆقرە هاتیتەوە ژوورێ.. کتڵێیەکت پڕ ئاو کرد.. هێزو سەنگی ئەوەت نەبوو زۆپاکە ئاگردەی، ویستت کەرەکەت ئالیك بدەی، رووەو گەنجینەکە ملت نا.. چوویتە ژوورێ.. نزمترە لەوەی بتەوێ سەر بەرز بکەیتەوە.. هەمین تا شتێك دەدۆزێتەوە بڕبڕەی پشتی دەشکێ، سەد دوعای نابەدڵ لە تۆ دەکا کە بۆ دەبێ بنمیچی گەنجینەکەت بۆ بالا کولەکەی خۆت رایەڵ کردبێ.. حەمام.. ئاودەستخانە.. کادینەکە.. لە هیچیان حسیبێکت بۆ (هەمین)ی کەڵەگەتو بەژن زراف نەکردووە.. بیرت چۆوە بۆچی دەگەڕێی.. گەنجینەی چی؟ پڕە لە شڕوشیتاڵ.. سەری هارو ماری تیایە.. پڕە لە کورسی شکاو.. جۆرەها بوتڵی بەتاڵ، جامی

قووپاو، کۆنە کورتان، تایەی پاسکیل، مێخ زنجیر، دەیەها قفڵو تۆپەڵی کلیل، کتلی و قۆری رەش داگەڕاو، سەر تەبەق، کەوچکی دار، پەقرەجی شکاوو تەنەکەی کون تێبوو، رەحەتی، تەڵەی مشك، داسی دەم خوار، مەشکە، گۆچانی کامەشکاو، مەقاش، دەسگرە، مەقەڵی، قایش، قوتیلەی زۆری پڕ لە گۆگردو قیرو زفتی وشکەوەبوو، تۆپەڵە بەن، دۆخین، لیفکەی داڕزیو، کڵاوی دڕاو، هێلەگ، بێژنگ، سەرکەڵە، تیرۆکی شکاو، پنە، پێڵاوی زۆری تاکەو تاك، پەمپی نەوت، کۆنە تۆڕی لێك هەڵتلیشاو، ... چەندین سەری فلیقاوەی ریشۆڵە.. پەڕێکی زۆرو رژاو.. کە هەر هەمووی بۆنو رەنگی سەردەمێکی زۆر کۆنیان لێ دەهات.. هەر هەمووی بەزمی (هەمین)ە.. کۆنو نوێ نازانێ.. زوو زوو پێی دەڵێ:

(منیش شتێکم لە شتە عەنتیکەکانت..!)

گوێت بە تەقەی دەرگاکە زرنگایەوە، راتکردەوە حەوشێ، سەیرێکی دەرگاکەت کرد، بایەکی لەناکاو هەڵیکردو زنجیرو قفڵەکەی بە دەرگاکەدا دەدا، سەرێکت هەڵبڕی، هەوران شەپۆلی رەش ئاسا یەکدیان رادەدا، سەر لێ شێواوانە بە هەموو لایەکدا بڵاو دەبوونەوە، کە چوویتە ژوورێ لە وێنەکەی خۆت رامای.. ئاە.. ئەمیش وەك شتە کۆنەکانی ناو گەنجینەکەت پیر بووە، زۆر گۆڕاوە، دەستت هیچی نەدەگرت، لبادێکت لەسەر ئەستێرکەکە داگرتو راتخست، بالیفێکی پەڕت داگرتو وەك تەرك خۆت بەردایەوە، لە ریشۆڵەکان ورد بوویتەوە، گەرەکە زوو بەیانی بیانگەیەنیتە دوکانەکەی سلێوە.. کە ئارەقەی لەشت وشك بۆوە تەزووی سەرما لە خوێنتدا مێروولەی دەکرد، لە دیوارەکان

رامـای، خـوراون و خشـتـەکانی دەرکـەوتوون، دەرەوەو ژوورەوە دەسـت پێـداهێنانێکی گەرەکـە، ئاوێنەیـەکی تـەڵخ و ژەنگـارت لـە دەلاقەکەوە دەرهـانی و لـە خـۆت رامـای، دەموچـاوێکی درێژکۆڵـە، دوو چـاوی مانـدوو، بـە قووڵـدا چـوو، هـەردوو لاشـەویلاگ چـاڵ، سـەیرە کـە تـا هەنووکـە هـەمین هـەر پێـت رازیـیـە، لـە بابـە شـێخت بیستووە: رۆژی قیامەتێ پیاوی بەهەشتی حەفتا و دوو حۆری لـێ حەڵاڵـە، حـەفتا و دوو زۆر نیـیـە؟ پیـاو چـۆن دەتوانـێ دەعـەملیان بێنێ؟ ئاسانەو حیکمەتی خودایە، پیاو وەکـی چـۆلەکەی لـێ دێ، هـەر دەپـەڕێ و تێـر نابـێ، بابـە شـێخ فـەرمووی گـەر حـەزت لـێ بـێ حۆرییـەکان بـەردەوام دەبنـەوە بـە کـچ، ئـەدی ژنـان گـەورەم؟ ژنـی بەهەشتی یەك پیاوی لێ حەڵاڵە!.

(یا شێخ پیاو دەتانی ژنەکەی خۆی هەڵبگریتەوە؟)

(جا تووخوا نێرەکەرەکەشت ئـەوە دەکات؟ ئـەتوو کـە حـەفتاو دوو حـۆری ناسـك و نـازدارت دەقـەبێری بکـەن.. چـیت دایـە لـە هەمینی رشکن و پڵکن؟)

یـا شـێخ (شـەکری) خـوارد.. هـا؟ هـەمین و نـەك حـەفتا و دوو حۆری، تـۆ بڵـێی هـەمین، لەوێنـدەرێ، لـە بـەردەمی خـودای لـە مـن هەڵنەگەڕێتـەوە؟ جـا ئـەو لێـرە، لـەو دونیایـەی، لەبـەر خـاتری تـوو پشتی لە ئاغا و بەگلەران کرد، قابیلە لەوێنـدەرێ نائومێدت بکا؟ خۆ لەوێ نە ئاغا هەیەو نە کوێخا، وەناو خەیاڵان کەوتبوویت، کـە نێرەکـــەر زەڕی و وەئاگـــا هاتیتـــەوە، مانگاکـــە پڕمانـــدی و.. مریشـکەکان کەوتنـە گارەگـار، هەسـتایتە سـەر پـێ و بـە یـەك بـاز چـوویتە ژێـر هـەیوانێ، رووەو کولانەکـە هـەنگاوی سسـتت نـاو

خشتی کەڵەکەکراوی پشت دەرگای کولانەکەت وەلادا، دەرگا جگە لەسەر قاپی بەرمیلێکی ژەنگار هیچی دیکە نەبوو، پێڵووەکانت گران دەبوون و دەستەکانت دەلەرزین، هەی هیلاکی رۆژێکی سەختی راو و ترسی نەهاتنەوەی هەمین و سەرمای هەوا بوو، دوێنێ ئێوارەش هەر درەنگ گەڕایەوە، درەنگیش نووستن، نیازت خەراپ بوو، کەچی پێی وتیت:

(جارێ دەروێش.. ئەورۆکە خوینم هەبوو..)، دوای بوونی عەبە و خەجێ سکی نەکرد، ئەوانیش هەردوو بەسەر بێشکەوە مردن، ئیدی هەردوو وەجاغ کوێر بوون، چوونە سەر چاک و پیران، بینینی دەیەها حەکیم بێ هوودە بوو، بە پێ خاوسی گەڕایتەوە ژێر هەیوانەکە و دەستت بۆ جۆڕکی کاوو جۆیەکە برد کە بە مێخێکی قەد دیواری هەیوانەکەوە هەڵواسرابوو، هەنووکە وەختی خۆیەتی جۆڕکەکە بەسەرو قەپۆزی کەرەکە ببەستیتەوە.. بۆ پێڵاوەکانت نووشتایتەوە و هەڵتدایە بەردەمی بەرمیلەکە تا دوایی لە قوڕو لیتەکە پاکی بکەیتەوە، چش لە سەرما، لە بەرهەیوانەکە لەسەر کەچەجلێك روونیشتیت، سەرما کار لە ئێسقانی پەنجەکانت دەکا، تەزوویەکی زۆر سارد لە پەنجەکانی پێتەوە تا تەوقی سەرت مێروولە دەکا، مێشکی هیلاکت دەرزی ئاژنە، پێڵاوە لا هەڵزراوەکانت ئاویان دزیوە و گۆرەوی‌یەکانت وەك شەختە بەستوویانە، پێیەکانت ئەوەندە سڕن، هەر دەڵێی دوو پێی کەسێکی دیکەن، بەوپەڕی وەرسی‌یەوە گۆرەوی‌یەکانت هەڵدا.. ئەوسا ئێیە.. ئەوسای جحێڵی و خوێن گەرمی، خوێنێك لەگەڵ نیگایەکی هەمین زوو کەفی دەکرد، ئەوسا.. ئەوسای

سەرشێتی و نەترسی، وەلێ هەنووکە پیر بوویت، چ ئاسان پێیەکانت دەتەزن، دەستەکانت دەلەرزن، هەر دەڵێی بەشێکە لەو خاکە پڕ بەستەڵەکەی تۆزێك لەمەوبەر جێت هێشت، هەرچەند سەعاتێك لەمەوبەر دڵە چکۆلانەو.. ماندووەکەت خێراتر لێی دەداو تۆش توندتر گوریسی تۆڕەکەت دەگرت و زیاتر سەرت نەوی دەکرد تا دەبوویت بە بەشێك لەو قۆرتە پڕ قوڕو لیتەیە، ئەو قۆرتەی دەتووت ڕەحمی دایکتەو سەرلەنوێ دەتشارێتەوە، بەڵام کوا ڕەحمی دایك ئەوەندە ساردە؟ ئەو ڕۆژانەی سەرما ئێسقانەکانت دەخوات خۆزگە دەخوازی هەر لە نێو ئەو ڕەحمە تاریك و گەرمەدا بوویتایە، نەك ئەم دونیا ڕووناك و ساردە، ساڵانێکە بەخۆو بە دوو چاوی ڕەش و بە قووڵداچوودا، دوو چاوی نیمچە نووقاو لە خێرو شەڕی دونیا ورد دەبیتەوە، ئەو دوو چاوە چکۆلانە بوون فریودەری هەمین، هەر بەم دوو چاوانەش لە سامان و هەوری باران بار رادەمێنی، لە ریشۆڵە ڕەش و وردیلەکان، لەگەڵ فڕینی ئەو ریشۆڵانەدا دڵت هەڵدەفڕی و بە نیشتنیان دڵت دەبێ بە یەکێك لەو ریشۆڵانەو هەڵدەنیشێ.

تا دێ ئاسمان ڕەشتر دەبێ، ڕەش وەك کراسی ئاودامانی هەمینێ، ڕەش وەك بەختی سیا، لە سپێدەوە تاوێ دایدەکاو تاوێ خۆشی دەکاتەوە، تۆ بڵێی هەر هەمووی بۆ ئەمشەو هەڵگرتبێ؟

(دە زووکە هەمین.. وەرەوە.. سۆماییم داهات)

با بباریێ.. با گوڵەگەنمەکان وەك کچانی بەژن زراف باڵا بکەن، کەروێشکە سەما بکەن، بەهاریێ لەبەر هەتاوی زەرکەفت ئارەقە

دەردەن، با لە هەموو شوێنێکدا خەڵەو خەرمان بێ، وەلێ بەچی دەچێ کە تۆ هەموو ڕۆژێك بە تۆڕێکی بەتاڵەوە بگەڕێیتەوە؟

تاریکیو خامۆشی بەیەکەوە دادەڕژان، دەتوت دەستێکی غەیبی ئەو تاریکیو ترسو خامۆشییە بۆ نێو دڵو ماڵی دەرویش دێنێ. ئەوەندە ترسایت کەرەکەو مانگاکەت لێ بوون بە دوو دەعبا، چوویتەوە ژووری، ڕێك رووەو دەلاقەیەك ملت نا کە هەمیشە هەمین لامپاکەی لێ دادەنا، بە دەستو پەنجەیەکی لەرزۆکەوە شووشەی لامپاکەت لابردو فتیلەکەت بەرز کردەوەو چەرخەکەت داگیرساندو فتیلە تێر نەوتەکە سووکێ گڕی گرتو ژوورو هەیوانەکە پرشنگێکی دیکەی تێ کەوت، دەتویست لە دەرگای هەموو ماڵەکان بدەیتو چراو قوتیلەو فانووسو لامپاو مۆمیان لێ قەرز بکەیت، هەر هەموویان لە ماڵەکەی خۆتدا دابگیرسێنی تا کەمەکێ ناو ژوورەکەو هەیوانەکەو دڵت رووناك بێتەوە، حەجمانت لەبەر برا، بێ ئۆقرە جێت بە خۆت نەدەگرت، تاریکە.. تاریکە.. تاریکە.. هێشتا مابووی کونو قوژبنی ئەو ماڵە رۆشنی تێ بڕژێ، کوا باقو بریقی مانگو ئەستێرەکان؟ حەزت دەکرد ماڵەکەت ببێ بە چراخان یان بکەوێتە ئەودیوی هەورەکان، لەوێدا کە مانگو ئەستێرەکان رۆشن لە پانتایی ئاسمانێکی پیرۆزەیی مەلە دەکەن، ئەم گەڕەکە هەر دەڵێی نغرۆ بووە، لە هەموانیش نغرۆتر ماڵەکەی تۆ، کەس لە دەرگا نادا؟ ئەوە چییە..؟ نە کەس دێو.. نە کەس دەڕوا.. نا هیچ شتێك لەم گەڕەکە روو نادات، تەکانێکت دا وەك ئەوەی کەوتبیتە بن بەردێك، دەتویست خۆت لەو ترسە وەلادەی، تۆزێك خۆت غافڵ بکەی،

———

پڕشنگی چراو لامپاکە ئەو چراخانەی سەر مەزاری غەوسی گەیلانی بیر هێنایەوە، ئەو ڕۆژەی خۆت و هەمین لە ژێر ڕوناهی‌یەکی چاونووقێندا بە دەوری مەزارەکەدا دەخولانەوە.. ئاە.. غەوسی گەیلانی هەمین بە سەلامەتی بێتەوە، خودا هاوار شەو رادەشکێ و ئەو ماڵ میراتە نەهاتەوە، شێتانە، بەربینایی لێڵ، چاوێکت بە حەوشەکەدا گێڕایەوە.. هەر دەتووت هەموو شتێك لەگەڵ تۆدا چاوەڕێی (هەمین)ە، بگرە پێڵاوە قوڕاوی‌یەکانی بەر بەرمیلی ئاوەکەش، کەرو مانگاو مریشکەکانیش، دوێنێ شەو چەندە جوان، هەمین، چەند کەڵە موویەکی لە کلکی نێرەکەرەکە بڕی‌و، وەك کەزی‌و بسکی شاژنێك بهۆنێتەوە وردورد داوەکانی هۆنی‌یەوەو بە دەمی‌یەوە چ لاوکێکی برینداری دەچڕی، چی خەم و کەسەری مێینەو کچ و ژنە دڵساردەکانی نێو شاخ و کێوو دەشتەکان هەن لە قورگی‌یەوە، بە دەم قوڵپی ئەو لاوکە پڕ حەسرەتەوە دەتەقینەوە، شەرم و ترس و دوودڵی، زوڵمی پیاوە سمێڵ بابڕەکان، پیاوانی تفەنگ بە دەست، تۆش لە ژێرەوە دەتڕوانی و بزەی گاڵتە لە لێوانت دەباری، پاشان ورد و باریك هەروەك بڵێی سیحر بگرێتەوە لە کونەکانی پێڵاوەکەتی هەڵکێشاو پێی وتیت:

(دەی بیگرە دەی.. حەز دەکەی پێی بڕۆ حەج)

بەو قسەیە بزەکەت بوو بە قریوە، قریوەی نێرینەیەك چاك دەزانێ، هەر بە سەلیقە، کە ئەگەر ژنێك مێردەکەی خۆش نەوێ" لە کلکی نێرەکەر قەیتانی پێلاەوکانی بۆ ناهۆنێتەوە، مەگەر قریوەی جاروبارت، لاوکی شەرمنانەو برینداری هەمینێ یان

سەداو چریکەی پڕ لە خرۆشانی خۆت ماڵێکی وا ئاوەدان بکاتەوە، یان بۆڕەی مانگا، زەڕینی کت و پڕی نێرەکەرەکەت، گارەگاری مریشك و جووکەی جووجەڵە تووك لێ نەهاتووەکان، قوقەی کەڵەشێر.. دەنا وەکی دیکە.. هیچی تر نی یە.. ماڵێك کە هێشتا دەرگای حەوشەکەی تەنەکەیەو هی ئاودەست و گەرماوەکەش کەچەگوێنی، سەربانیش سکی داداوەو ها هەنووکە ها تۆزێکی دیکە داتەپێ، دڵۆپەی دەیەها زستانی بە بەفرو باران هەر هەموو کاریتەو شەقڵەو رایەڵ و حەسیرە داڕزیوەکانی رەنگ رێژ کردووە، بنمیچێك غەرقی پەڵەی رەش و بۆرو زەردباو، جار ناجارێك بە تۆپەڵ گڵەبانەکە دادەکەوێ، جاروباریش.. هەر بە رێکەوت بەر تەپڵی سەرە رووتاوەکەت دەکەوێ و دادەچڵەکێ ی، گەر کڵاوو جامانەکەت لەسەر بنێ ی، کەسێك نازانێ قەف و لوولی ئەو بسك و کەزیە پڕەت هی کابرایەکی سەر رووتاوەبێ، کەزیەکانت لەو قژەی پشتی سەرت و سەر هەر دوو گوێ وردیلەکانت هێشتۆتەوە، زۆر جاران بێ ئاگا لە خۆت بسکێك دەکەی بە هەڵقەی پەنجەی شایەتمانەت، بە دەستی چەپیش گەمە بە گونت دەکەی کە بێ شەرم لە بەردەم هەمینێدا ناوگەڵت لێ بڵاو دەکەیتەوەو وەك هێشوویەکی گران هەردوو هێلکەی گونت لە ناو دەرپێ سپی یەکە شۆڕ دەبنەوە، ئەگەر میوانێکی خۆیی یان غەیرە لەوێ بێ، هەمین لێت پەست دەبێ:

(بایز.. سەرت بخوا.. بەس ئەوەندە هەڵیپشێوە!)

(لۆ.. گونی خۆم نی یە.. ئەمن دەزانم کە لە دارەتی دونیایێ هەر ئەو تۆزە گونەم هەیەو کەیفم پێ ی دێ..!)

______

(جا خۆ لێت نافڕێ؟)

(ئەمن دەزانم ئەتوو حەسوودیت بە من دێ..!)

(دەك داڕزێم.. ئەگەر حەسوودیت پێ ببەم)

(توخمەکەتان وایە.. مەگەر کچی دایکە حەوا نەبن.. بە ڕۆژ ڕقتان لێیەتی و بە شەویش هەروەکی فەرخە پشیلە دەست بە پشتی ملیدا دێنن و گۆشتی دەخەنە بەردەم.)

(کابرا حەیات هەبێ.. میوان دانیشتییە)

(جا شەرمی دەوێ.. ئەوانیش هەم گونیان هەیەو هەم هەرامە)

(هەر وس بەو بەردێکی لەسەر دابنێ.. لە کنە خۆ پیاوی تەریقەتی.)

(جا هەقم گۆتییە.. ناوەڵڵا ئەمن پرسیارەکی لە توو دەکەم.. ئەگەر ئەو تۆزە زیادە گۆشتەمان نەمینێ.. ژنان چ حورمەتێکمان دەگرن؟ چتان گۆت جەماعەت؟ بە قورئان کە ئادەم و حەوا کەوتنە سەر ئەو عاردە هیچەی.. ئەگەر ئەو زیادە گۆشتە نەبووایە، حەوا ئەوەندە ماندی و شەقی بە دووی "ئادەم"دا نەدەگەڕا..!)

میوانەکان دەتریقانەوە.. چەندەها جار لەبەر چاوی ژن و پیاوانی دەرو دراوسێ هەر بۆ هەوەس و مەزاق وەك کەڵەشێر بەسەر هەمینێدا دەتسیت......

جار ناجاریش تۆپەڵە خۆڵەکە دەکەوتە سەر سفرەو خوان و قاپی هەرشتەو ترخێنەو نسکێنەو پیرخەنیلەو شلەساوار، تۆ قەت بێز لەو گڵە ناکەیتەوە... دەڵێی:

(خاك و خۆڵ پاکە.. بنیادەم خۆی لە خاك خوڵقاوەو کە دەشمرێ دەبێتەوە بە خۆڵ، ئەوەی بێز لە خۆڵ بکاتەوە، بێز لە

ـــــــــ

خۆیشی دەکاتەوە)، ئەو جارانەی بەر هەمین دەکەوێ، رادەچەنیٚ و شەیتان و خانووی گڵ بە نەفرەت دەکا و دەڵێ:

(ئەدی.. ئەو ژنانەی بە نینۆکی من نابن لە ناو کۆشک و تەلاران دەژین.. کەچی ئەمنیش لەو کۆلیتە سەگەی مردم و رزامەوە)

تۆ دەزانی ئەوەیان قسەی دڵ نیٚیەو دەردی زەمانەیە، بۆیە هەردوو قاچی لیٚ رادەکێشی و بە تەوسەوە دەڵێی:

(کیٚ زۆری لیٚ کردی؟)

دڵت نەدەهات بڵێی:

(کیٚ زۆری لیٚ کردی بەدووم بکەوی؟)

(ئەدی ژنی پیسکەپیاوان هەر رەنج بە خەسارە)

(هەمین خودا دەتگریٚ، ئەمن پیسکەپیاو نیم، رۆژ تا ئێواریٚ لەو دەشتە چۆڵ و ساردە بەفرو باران لێم دەدا، سەدان ئێوارە بە دڵساردی دێمەوەو رەشۆڵەکەم پیٚ ناگیریٚ.. دواییش لە بەردەم دوکانەکەی سڵێوە وەك سەگ وەردەکەوم و قەشمەریم پیٚ دەکا، کچەتیم ئەو کاتەی حەزت لە من کرد.. وەکی هەنووکە بووم..؟)

(نەخێر.. لاسەشۆڕ وا نەبووی، بەس ئەوەش نان پەیدا کردن نیٚیە)

(بەم تەمەنەوە چیم پیٚ دەکریٚ.. ناتوانم وەکی جاران فەردە گەنم بخەمە سەر شانم و غار بدەم..!)

مشکێك بە بەردەمتا جرتەی کرد و چاوتروکانێك و بزر بوو، ماڵەکە بۆتە هێلانەی مشك و مار، شەوانە هەردووکتان گویٚ بۆ زیقەزیق و تەراتێنی مشکان هەڵدەخەن، هەمین لیٚیان دەترسیٚ و

قیژیان لێ دەکاتەوە، هەر کە بیانبینێ تاکە کلاشێکی تۆیان تێ دەگرێ، تۆ توورە دەبی و هەموو جار بە لاقرتێوە پێی دەڵێی:

(گەر خودا ئەو هەموو کونەی لە ئافرەت نەکردبایە، ئاواهی لەو مشکە حیزە نەدەترسان)، هەموو بەیانییەك كە لە خەو هەڵدەستێ یەکشەق رووەو تەڵەی مشکەکان مل دەنێ، چەندە دڵی خۆش دەبێ کە تەڵەکە مشکێکی دیکەی گرتووە، دەیبا و لەسەر گووفەکەکە فڕێی دەدا، دەیکا بە هەراو گەڕەك لە خۆی کۆ دەکاتەوە، ئەم دەڵێ:

(ئەم حەیوانە لەعنەتییانە یان لە زەوی هەڵدەتۆقێن یان هەر شەوە بێچوویەك فڕێ دەدەن، ئەوەندەی بە ماڵە فەقیران فێرن، ئەوەندە توخنی خواپێداوەکان ناکەون، ئەوان هەموو شتەکیان تەقەتەو هی مەش وا لەو گۆڕەیە..)

ئاخر زەوی ژوورەکانو گەنجینەو کادینو ناندینو بگرە حەوشەکەش هەر هەمووی قۆرتو چاڵو چەوێڵو کۆندڕو تونێلی تەسكو تروسك بوون، کاتی خۆی، ساڵانێك لەمەوبەر هەر ئێرە ساکە دەشتێك بوو کە هەر خۆت لەگەڵ دەیەها کۆنە جووتیاری هەڵەتەو دەرکراوی گوندەکان کردتان بە بێستانی گندۆرەو تەرۆزی، هەنووکەش ساڵ نییە چەندین دووپشك لە ناو ماڵەکەدا نەکوژی، هەمیشە لەوە دەترسن لە شیرین خەودا دووپشکێکی زەرد بە یەکێکتانەوە بداو بیکوژێ، چەندین جار تا هەنووکە ماری درێژو ئەستوورت دیوە سێ قەفو چوار قەف خۆی لە کاریتەو شەقڵەکان ئالاندووەو بە دوو چاوی ئادەمیانە لە هەمین راماوە ئەو وەختەی لە شیرین خەودا بووەو پرخاندوویەتی، ویستووتە

---

مارەکە بکوژیو بێ ئەوەی هەمین لەو خەوە خۆشە وەئاگا بێنی، بێ ئۆقرەو شپرزەو دوژمنکارانە، هەردووکتان لە یەکدی رادەمان، چەندین جار ئەو رەشە مارەت کوشتووە.. دەرت کردووە.. کەچی هەموو هاوینان دێتەوە، دەترسای ئەو مارە یەکێك بێ لەو مارانەی کە عاشقی ژنە زۆر جوانو سپیکەلانەکان دەبنو واز ناهێنن، حەز دەکەن بچنە ناو باخەڵیانو سەر بخەنە مابەینی هەردوو مەمکان.. بۆ نا؟ هەر مار بوو (حەوا)ی فریودا، ئادەمیش فریوی حەوای خواردو لە بەهەشت دەرکرا، کە دەتزانی دەرپێیەکەی تا ئەژنۆیان هەڵکشاوە، لە ترسی نیگا حەرامو ئادەمیانەی مارەکە زۆر بە هێواشی دەستت دەبرد بۆ نیفۆکەی تا دایپۆشیتەوە، وەك هەنووکە بێ ئۆقرەو زەندەق چوو دەبوویت بە پاسەوانی ژنێکی خەوتوو.. ژنێکی ماندوو کە هەمیشە بە دەم خەوەوە خەونی بە کوژرانی خۆیەوە دەدیو رادەچەنی، پەلی دەکوتا، پێڵووی دەفڕی، بە دەم وڕێنەوە دەخنکاو هەناسەی لە خۆی دەبڕی، چەند حەز دەکەی ئەمشەو گەر هاتەوە پێی بڵێی:

(هەمین.. چیدیکە مەڕۆ دەرێ، ئەتوو هیلاك بووی، بنوو.. قەت بەخەبەر مەیە.. ئەمن تا ئەبەد بە دیارتەوە دادەنیشمو.. نانووم..!)

لە دیوارەکان ورد دەبیتەوە، بارانو چەندین پەڵەو ماکو دیمەنی سەیرو عەنتیکەیان رەسم کردووە، سنوورو هێڵەکان بە چەشنێك تێکەڵ بوون کە نەتوانیت نەخشەو رەسمەکان لێکدی جیا بکەیتەوە، وەك تێکەڵبوونو ئاڵۆزی دونیاکەی تۆ، دیوارەکانو پشتی هەردوو دەستت تا دێ گەڕتر دەبن، گەڕی

سەرما و شەختەو با، چ شتێك ماوە لە دونیای تۆدا گەڕو گول نەبووبێ، پیرو پەڕپووت و هەلاهەلا، زبرو لەت و پەت، زامارو.. شەقار شەقار، کەرەکەش تا دێ پیرو لەڕتر دەبێ، بێ ئاوەزە.. دەنا چۆن کت و پڕ دەزەڕێ و هەزاران رەشۆڵە دەتۆقێنێ، ئەوەندە کەرە نازانێ کە تۆ لە تاو برسیەتی دەستەکانت لە گوریسەکە توند دەکەیت و پتر خۆت لە قۆرتەکە دەخزێنی و مت دەبیت و جووڵە ناکەیت، شان و شەپیلکت دەکەوێ ئەوەندەی دیوێکی تۆڕەکە بەسەر دیوە راخراوەکەیدا هەڵبدەی، هەزاران رەشۆڵەی لەعنەتیش وەك ئەوەی شەیتان هەڵیانفڕێنێ فرتەی بۆ دەکەن و لەو بەرزایی ئاسمانەوە جیقنە بەسەر تۆدا دەبارێنن، سەرما و باران دەیانبات، لەو حەڵەدا تۆ خەون بە ئاگردانێکی پڕ لە پەنگرو کەندووی پڕەوە دەبینیت، توندتر هەر دە پەنجەت بەسەر گوریسەکەوە دەقرسێنیت، چاو ناتروکێنی، ئا لەو ساتەدا کە نێرەکەرەکە برسی دەبێ و سەرما ماسولکەکانی دەخاتە سەر لەرزە لەرزو گرژبوون، سەر بۆ ئاسمانی هەوران بار هەڵدەبڕێ و پڕ بە ئاسمان، پڕ بەو ساکە دەشتە چۆڵە، پڕ بە قوڕگی دەزەڕێ، زەڕین و بەس.. ئەو زەڕینە کت و پڕە لە خەیاڵ و خەون و ختوورە دادەبڕێ و.. پتر ریشۆڵەکان تەرە دەکا، لەو ئاقارەی خۆت تیا مەڵاس داوە دوور دەکەونەوە و لە نێو پووش و پەڵاش و زەوی یە کێڵراو و بەیارەکاندا دەنیشنەوە، وەلێ ناهەقی ذیە بزەڕێ، تۆ زوڵمی لێ دەکەی، دەیهێنی و دەیبەی، تۆڕی پڕاوپڕی ریشۆڵەی لێ بار دەکەی، باراش، هی خۆت و هەر هەموو دەرو دراوسێ، داری قەڵاشکەر، فەردە رەژوو، کە هیچیشی لێ بار ناکەی، تۆزێك

ماندوو بیت، بە بازێك خۆت هەڵدەدەیتە سەر پشتی‌و خەریکە هەر چوار پەلی باریکی لە ژێرتا بشکێن... کەچی کە ماکەرێك دەبینی‌و هەوەسی پەڕین دەیگری‌و چاوانی پێ سوور دەکاو دەزەڕێ، تۆ بە کامەی گۆپاڵەکەت لە لمووزی دەدەیت‌و کێری رەپی پێ سست دەکەیتەوەو نیوە زەڕی دەکەی، یەکێك وا لە تۆ بکا چ دەکەی؟ دەتەوێ ئەو شەهوەتە نەڕژێنی‌و لە خوێنیدا بمێنێ... ناتەوێ هێزو بڕستی لە بەر بڕێ‌و ئەوەندەی دیکە لاواز بێ‌و هەر چوار پەلی بشکێن، ئالیکی کەمەو بەرگە ناگرێ، کێ دەڵێ وایە... ها؟ خۆ تۆش ئالیکت باش نییەو هەمین خۆی شل بکا زوو زوو دەپەڕی، چاکە.. نێرەکەرەکەت بپەڕێ باشترە یان نەپەڕێ؟ تۆ.. هەر خۆت.. نەپەڕیت خولقی راوت هەیە..؟ ئەو شەوانەی گڕی شەهوەتێك لە دەمارەکانتا خوێنت دەسووتێنی‌و کەفی پێ دەکات، هەمین لێت لالووت بێ‌و خۆی شل نەکات سێ رۆژان مڕومۆچ قسەی لەگەڵ ناکەی، لەوە دەترسیت ئەم نێرەکەرەی تۆ جارێك بپەڕێ‌و دەم بە یەك داداو بمرێ... ئەوسا پارە لە کوێ بێنی کەرێکی دیکە بکڕیت؟ سەیرێکت کرد، لە خواردنی کاو جۆکە ببۆوە... گوایە هەر پیرو پێغەمبەرێك حەیوانێکی هەبووە.. ئاخۆ دەبێ گوڵکی عوزێر پێغەمبەر چی بووبێ؟ دەنێو پێغەمبەرانیش هەژارو نەدارا هەبوون، عیسا دارتاش‌و مووسا شوان‌و داود ئاسنگەرو سەروەری عالەمیش تاوێ کاروانچی‌و تاوێ شوان بووە، گوایە سلێمان پێغەمبەریش سەرداری پەلەوەرو فڕندەی هەموو ئاسمانان بووە، ئاخ گەر موعجیزەی سلێمان پێغەمبەرت دەبوو، بە هاوارێك چی پەلەوەرو فڕندەی ئاسمانان

هەن بانگت دەکردن و وات دەکرد بێنە سەر شانەکانت و قەفەزو تۆڕەکانت لیّ پڕ دەکردن...

خەیاڵت دوور فڕیو زوو هاتەوە، لامپای ژوورەکە کەوتبووە سەر پرتەپرت، تۆ بڵێی نەوتەکە ئاوی تێکەڵ بووبێ؟ بێ هوودە هەردوو ژوورەکە گەڕایت، گەنجینە، کادین، هەموو کون و قوژبنێك، بگرە پەردەی ئاودەستەکەشت وەلادا، گوێذییەکی زەرد و نیمچە رزیو، سەردەمێکی زووی بیر هێنایتەوە، ئەو وەختەی باش حەماڵی بازار بووی، ئەوسا هەرەتی خۆت بوو، کەچی هەر زوو لە ترسی باوك و براکانی هەمین خۆت لە (سایلۆ)کە شاردەوە و کەس نەزانم لۆرییەکانت بار دەکرد، لە کۆلیتەکەش نزیك کەوتیتەوە، ویستت مریشکەکان داکەیت، بەلاّم ئەمەیان کاری هەمین بوو، هاتیتەوە بن هەیوانەکەو حەپەساو لە کۆلیتەکە رامای، ئەم بەیانییە چیت لیّ قەومابوو؟ دەتووت یەکەمجارە هەمین دەبینی.. وەك سەدەها بەیانی دیکە پێی وتیت:

(بزانە مریشکەکان چەند هێلکەیان کردییە؟ دەریان بینەو با دووانی لە رووندا بقرچێنمەوە.)

لە بەردەمی کۆلیتەکە کرۆشکەت کرد و دەستی راستەت بۆ ناو کۆلیتەکە درێژ کرد، یەکێك لە مریشکەکان هەڵفڕی و دەستت بەر هێلکەیەك کەوت، تاوێك دەستت گێڕا و دوو هێلکەی دیکەت دۆزییەوە، هەمین لە تەك کولانەی مریشکەکاندا کا و جۆی بۆ مانگاکە تێکەڵ دەکرد، لەو حەڵەدا تۆ سەریشت بردبووە ناو کولانەی مریشکەکان، ئەم هاواری لیّ کردیت:

---

(ئەوە ئەتوو چ دەکەی؟)

بۆنی ساردەوەبووی ریقنە گێژی کردیت و گلەییت لێ کرد کە بۆچی وا زوو چراکەی کوژاندۆتەوە، ناو کولانەکە زۆر تاریکە، ئەمیش بە قەهرێکەوە سکالای ئەوەی کرد کە نەوتێکی ئەوەندە زۆرتان نییە تا شەوو رۆژ چرا داگیرسێنێ...

تۆش بە سەرسامییەوە سەرت دەرهێنا و بۆ ساتەوەختێك تێی رامای، لەو رادەمای، بەلام خەیالت لە شوێنێکی دیکە میوان بوو، هاواری لێ کردی:

(برۆ ئەولا..)

وتت: (باشتر وەرە خۆت بگەرێ.. با وەك ئەو رۆژە بە دەستمەوە نەشکێن.. ماوەیەکە وەك ئارەق خۆرەکان دەست و پەنجەم دەلەرزن..)

گران راست بوویتەوە، بە خەفەتەوە لە هەمینێ رامای، رووەو لای مانگاکە خزیت و زۆر بە نەرمی دەستت خستە سەر پشتی، وەك قەسابێك کە دەست بەسەر پشتیدا بێنێ تا بزانێ گەر سەری ببرێ چەند کیلۆ گۆشت دەگرێتەوە، دوو سێ جار لەسەر ملییەوەو بەسەر بربرەی پشتی و تا سەر هەردوو کەفەلی دەستت هێنا و برد، لە کەفەلەوە بۆ خوارتر تا هەردوو لا رانی، پشتی رانی و تا هەردوو گوانەکانی نەوەستایت کە پربوون لە شیر، سەری گوانە زەردباوەکانت بەسەری پەنجەکانت دەگرت و دەتخوراندن، هەلتدەگلۆفین، تاوێکی خۆش گەمەت بە گوانی مانگاکە کرد، بە گۆشەی چاویش لە چاوەکانی هەمین رامای، تەنکە تاریکی بەرەبەریان نەیدەهێشت پرشنگی چاوە خەوالووی،

خەو تێ شکاو، ماندووەکانی ببینی، لەو حەڵەدا جۆرکی پڕ لە کاو جۆی لە لمووزی مانگاکە هەڵکێشاو لە پشت هەردوو گوێیەکانییەوە هەردوو جەمسەری پەتەکانی بە یەکەوە گرێ دا، دیسانەوە چاوتان لێکدی کەوت، تۆش بە شەهوەتەوەو نیهاد پیسانە دەستت لە گوانو بن سکی مانگاکە دەخشاندو زەردەیەك لەسەر لێوانت نیشت، هەمینیش بە ترسو شەرمەوە لە چاوە زۆر گجکەو نەوسنەکانت راما، خوێنێکی گەش، خوێنی ژنێکی زۆر شەرمنی دەشتەکی، پەڕییە سەر هەردوو کوڵمە چڵکنەکانی، بێ ئاگا لە خۆت، خنکاو لە ناو چاوانی هەمیندا، ئاسوودەو ئارام گوانەکانت دەشێلا، تا دەهات سەرپەنجەکانت گەرمتر دەبوون، چەند دڵۆپە شیرێکی خەستو گەرم ناو لەپیان تەڕ کردیت، مانگاکە پشتاو پشت رەوییەوە، بە هەر چوار پەلان قوڕو چڵپاوی حەوشەکەی شێلا، سەر مەستو کاسو بێ ئاگا لە خۆت گوانە نەرمەکانیت ئازار دابوون.. خاو.. خاوتر بە شەرمەوە دەستت شل کرد، تا ئەو حەڵەش لە هەمین رامابووی، نەك بە گۆشەی چاو، ئەمجارەیان کە تکە شیرەکان رژانە نێو لەپت پڕ بە هەردوو چاوان سەیری چاوە بەڵەکەکانی هەمینت دەکرد، ئەویش ژنە کرمانجێکی رامـا و لە نێوان ئارەزوویەکی کوژراوو بەیانییەکی ماندوودا... سەری داگرتو نەیوێرا چیدیکە بڕوانێتە چاوە نەوسنەکانت کە خوێنیان تێ زابوو، لە ترسانا لە تۆو لە مانگاکە دوور کەوتەوە، بەم بەیانییە وادەی چ نەوسو هەوەسێکە؟ کەوتە سەر چیچکانو لە بەردەم کۆلیتی مریشکەکان هەڵتروشکا، مانگاکەش لەسەرخۆ کاو جۆکەی دەکرماندو کاوێژی

دەکرد.. کاوێژێك خاوو کوشندە، کوشندەتر لە چاوەڕوانی گەرمی تۆ بۆ هەمین، کاوێژێکی ساردو نەرمو لەسەرخۆ، خرمەی جۆ بە ئاستەم دەگەیشتە گوێی هەردووکتان، مانگاکە ئاوڕێکی ئادەمیانەی لە تۆ دایەوە، لە نێو ئەو تەنکە تاریکییەدا کە مەیی بوو، بەم بەیانییە زووە لە ئادەمو حەوایەکی هیلاكو غەمگین دەچوون کە هەردوو تازە لە بەهەشت دەرکرابن، مانگاکەش هەر لەو مانگایە دەچوو کە ئادەم سەردەمانێك زەوی پێ کێڵابێ، هەردوو چاوی مانگاکە سوور هەڵگەڕابوون، وەلێ لە ژێر بارستایی ئەو تەنکە تاریکییەدا مەحاڵ بوو ئەو سوورایییە ببینی، چاوەکانی تۆش سوور هەڵگەڕابوون، هەمین هەردوو قۆڵی کراسو کەوا رەشەکەی لێ هەڵکردبوو، دوو قۆڵی سافو سپیو گۆشتن لە تەك ئەم کراسو کەوا رەشەدا" لە ژێر تەمێکی تاریکی بەیانی زووی ئەم زستانەدا وای لێ کردیت دەست لە گوانەکانی بەر نەدەیتو هەر یاریان پێ بکەی، قەت لەوە نەدەچوو ئەم زەندو مەچەکە سپییە بەو دەستو پەنجە بۆرو قەڵەشتیو چڵکنانەی تۆوە پەیوەست بن، ئەو دوو دەستانەی لە شیرین خەویشدا هەر گرژو کووڕن، لەم حەڵەدا خەیاڵت فڕی بۆ هەموو ئەو کاتو شوێنانەی شەوانی زستانو هاوینو بەهارو پاییز دەست لەملانێو ماچو مووچو راموسانی هەردووکتانی دیوە، لەو قۆڵە سپییانەی رامایت، خۆ تۆ ئەوە یەکەمجارت نییە ئەم قۆڵانە دەبینی، بەڵام ئەوە یەکەمجارە هەستت کرد هەموو شتێك لەو ماڵەدا کۆنو پەڕپووتو مردووە، بێ تامو بۆنو بەرامە، ساردو سڕە، تەنها شتێك کە تازەو خۆشەویستو گەرمو بەلەزەتو

زیندوو بێ هەردوو دەستی.. باسکی.. هەردوو قۆڵی هەمینن، ئەم دوو قۆڵە گەلێ جوانانە چەندە بەم ماڵە پەرپووتە ئاشنان.. ئەوەندەش نائاشنان.. چ دەکەن لێرە؟ چەندە غەریبو سەیرو لایدەن، ئەم باسکە ناسکانە، ئەو دەستو پەنجانەی هەنگوینی سۆزیان لێ دەتکێ هی ئەوە نین مانگا بدۆشنو کاو جۆ لە بەردەم لمووزی نێرەکەرەکەت رۆکەن، کۆترەکانت دان بدەنو تەپاڵەو تەرسەقولو قشپلەکانی ئەو دەشتو دەرە هەڵبگرنەوەو بۆ زستان لە چاڵیان بنێو، باراش لێ بکاو.. بە تەنەکەو پەقرەج لە ماڵان ئاو بێنێو دیوارە داڕزاوەکان سواغ بداتەوە، لەولاوەش خزمەتی ژنە ئاغاو چەلەبیو بەگزادەو ئەفەندییەکانی شار بکات، ئەو ژنانەی بە قولە پێی هەمین نابن، سیساڵ پترە هەر ئەم باسکانە دوای رۆژانی ساردو گەرم، رۆژانی مەینەتیو ئارەق رشتن، شەوانە دەبوونە شوورەو سەربانو سێبەر، هەزاران جار بەم دوو باسکە لە ئامێزی کردوویت، ئامێزی نەرمو گەرمو شیرینو بۆنخۆش، ئامێزێك کە بۆنی مێخەكو قەرەنفول سەرمەستیان دەکردیت، دەیانبردیتەوە رۆژانێکی زوو، سەردەمێکی دوورو دێرین، تەماوی وەك خەون، هەر ئەم دوو دەستە پڕ لە میهرە بەو سەری پەنجانە فرمێسکی پەنهانی تۆیان سڕیوەتەوە، فرمێسکی پیاوێك کە تا ماوە ناتوانێ بچێتەوە گوندەکەی خۆیان، بەهەشتی دۆڕاو، کەچی نازانێ چۆن لەو پیرە شارەدا بژیو.. خۆی بشارێتەوە.. چی بکا تا خوێنی رژاوی هەمین نەبینێ؟ بۆ تا هەنووکە فەرامۆشیان کردوون؟ تا کەی وا دەبێ؟ چ مردەنییەك بوو ئەو ترسو تۆقینە ئەبەدییە؟ گەر وا نەبووایە ئەو دەستانە

قەت هی ئەوە نەبوون کراس‌و فانیلەو رانك‌و چۆغەو چاکەت‌و پانتۆڵ‌و دەرپێی خوا پێداوەکان بشۆن..؟

هەر ئەم بەیانیی‌یە بوو.. دە دوانزە سەعات یان یەك سەدە لەمەوبەر بوو هەمینی کەلەکەوێت لە بەردەم ئەم کۆلیتەداهەڵتروشکا بوو؟ خۆی بەلایەکدا لار کردەوە، قۆڵی سپی‌و رووتی لە کونی کۆلیتەکەوە بردە ژووری، زارکی کۆلیت ئەوەندە فراوان بوو کە دوو مریشك وێکرا دەچوونە ژووری، کۆلیتەکە چەند خشت‌و بەردو دارێکی کەڵەکەکراو بوون، رایەڵی سەربانەکەی چەند شیشێکی ژەنگارو تەنەکەیەکی پان بوو، کە خۆی پتر لار کردەوە بەسەر قاچی چەپدا، هەموو قورسایی خۆی داگرتە سەر پەنجەکانی پێی، پتریش خۆی نەوی کرد، بسکی چەپی لە قوڕو لیتاوی بەردەمی کۆلیتەکە خشی، بسکی ماش‌و برنجی شاراوەی ژێر خەنەی سنەیی، بە قەدەرایی دوو پەنجە قوڕاوی بوون، خەنەکەش هی ژنەکەی سمایل بەگ بوو، ئەو رۆژەی کە لە هەندەرانەوە بۆیەیەکی تازەی بۆ هات نیو کیسەی مابوو، بە هەمینی بەخشی، بۆنێکی ساردو ناخۆشی جیقنەی مریشکەکان گێژی کرد، گران‌و بێزەوەر وەك بۆنی ماسی سارد، ئەم بەو بۆنە راهاتبوو، هێدی هێدی دەستی راستی بردە ژووری‌و بە شێنەیی لە کاو جیقنەی تەڕو وشکەوەبووەکان دەکوتا.. زیاتر بە تەنیشتتدا لار بۆوە، تا بنەبانێ دەستی رەپێش کرد، بە دوایدا باسکی، باسکی سپی دەنێو تاریکی کۆلیتەکەدا بزر بوو، پتر خۆی نەوی کردو قۆڵ‌و باسکی چەپی رێك کرد بە ئەستونگ‌و ناو لەپی خستە سەر زەویی‌یە قوڕاوییەکە، لە ژێر کراسە رەشەکەوە

کەفەڵی خڕو پڕی دەرپەڕی، تۆش دەستت لە گوانەکان بەر نەدەدا، خۆت راست کردەوەو لە ژێر رانی مانگاکەوە خزاندت، سەرکەوتیتەوە تا لەسەر کەفەڵی ئارامیان گرت، ئانو سات لە کەفەڵی هەمین رامای، رووت... داماڵراو لە کراسی رەش، تەزوویەکی گەرم بە نێو دەمارەکانتا مێروولەی کرد، ناو هەناوو هەردوو گورچیلەت گەرمتر داهاتن، ئەم بێ ئاگا لە تۆ، بە ترسەوە دەستی بە نێو کۆلیتەکەدا دەگێڕا، دەترسا هێلکەکان بشکێنێ، جگە لە کای تەڕو ریقنە دەستی بەر سێ سەرکە پیاز کەوت، لەگەڵ دوو هێلکە، دوێنێ شەو خۆی ئەو سەرکە پیازانەی لە ناو کۆلیتەکە، بۆ راوکەی مریشکەکان، دانابوو، تا پتر لێی ورد دەبوویتەوە زیاتر خوێنی گەرمی هەوەسێکی وا لە ناکاو هەموو دەمارەکانی ناو لەشتی خستە سەر مێروولەکردنو.. ئیدی زانیت تۆزێکی دیکە خوێنت کەف دەکا، ناو دەمت وشکی کرد، دەستی راستت لەسەر سمتو کەفەڵی مانگاکە لانەبرد، جۆگەلەی بڕبڕەی پشتت ئارەقەی دەردا، بە ترسو شەرمەوە، بێ ئاگا لە خۆت، دەستت بۆ گوانەکانی درێژ کردەوە، هەمین، هێشتا، دەستی لە ناو کۆلیتەکە دەگێڕاو هێلکەکانی دەژماردن، هەر هێلکەیەکو لە خۆشیانا تاس دەیبردەوە، هێلکەیەکی سپیو خڕ.. زەردەیەك نیشتە سەر لێوی، شتێکی دیکەی بیر هاتەوە، نوکتەیەکی تۆ.. گرژیەوە.. گرژینەوە بوو بە پێکەنینێکی خنکاو، ژمارەی هێلکەکان بوون بە چوار.. یەکێکیانی خستبووە ناو لەپی، لەزەتێکی نهێنی لەو هێلکە لووسو خڕانە دەدیت، لەزەتێکی وا کە شەرم لە خۆی بکاتو تەریق بێتەوە، بەوە چاکە ناو کۆلیتەکە

تاریكەو كەس بە هێلكەی خڕی ناو لەپی و هەڵگلۆفتنی نازانێ، تۆش شل شل گوانی مانگاكەت دەشێلا، جارجاریش بە پەنجەی گەورەو شایەتمانەت نەرمی و گەرمی گوانەكانت سەح دەكردەوە.. هەڵتدەگلۆفت.. مانگاكەش كۆڵێ لە گیانی خۆش بوو، جووڵەی نەدەكرد، ئەوەندەی پێ خۆش بوو كە تاوتاوێك كلكی ڕەپ دەكرد، كت و پڕ نێرەكەری لەعنەتی زەڕی، پڕ بە حەوشەكەو ئاسمانی گەڕەك زەڕی، زەڕینێك ماڵەكەی لەگەڵ بلەرێتەوە، دەرو دراوسێی لە خەو ڕاپەڕاندبێ، شەیتان و نێرەكەرەكەی تۆیان بە لەعنەت كرد كە هەموو بەیانیانێ زوو لە خەوی خۆشیان دەكا، هەندێ سووكێ خەویان لێ دەكەوتەوە، هەندێكیان خەویان لێ دەزڕاو گوێیان بۆ هەموو كەڵەشێرەكانی گەڕەك شل دەكرد كە لە دوورو نزیكەوە وەڵامی ئەو زەڕینە كت و پڕەیان دەدایەوە، مریشكێكی هەڵنیشتووی سەر كۆلیتەكە بەرەو لای تۆو مانگاكە هەڵفڕی و خۆی كێشا بە لمۆزیدا، مانگاكە ڕەوییەوە، مریشكەكانی دیكە بە ئاسمانی حەوشەكەدا هەڵفڕین، پەڕێكی زۆر لە مریشكەكان هەڵوەری و بەو ناوەدا بڵاو بوونەوە، نەرم نەرم دەكەوتنە سەر عاردی حەوشەكە، حەوشەیەكی تەڕو قوڕاوی، هەمین لە ترسانا ڕاچەنی و بستێك لە زەوی بەرز بۆوە، هێلكەكەی ناو لەپی شكاو ئاوێكی لینج و شلەتێن دەستی تەڕ كرد، تۆش ڕاچەنیت و لە تاوی ئەو زەڕینە لە ناكاوەدا گوانی مانگاكەت توند گوشی و پەنجەكانت لێ گیر كردن و پاشان خاو بۆوە، ناو لەپت پڕ بوو لە شیر، مانگاكەش حەجمانی لێ بڕاو لە تاو گوانی گوشراوی تاوێك بۆ پێشەوەو تاوێك بۆ دواوە خزی، بە هەر چوار پەلی قوڕو

لیتاوەکەی دەشێلا، چەموشانە سەری بەرز کردەوەو لە حەژمەتانا پڕماندی، تۆش دەستت پتر شل کردو شیرە سپییەکە لە پەنجەکانتەوە دەتکایە سەر زەوی، بازنەی سپی ئەو شیرە چەورە درەنگ دەنێو قوڕاوەکە دەتوایەوە، هەمین ساردو هێدی دەستی لە کولانەی مریشکەکان دەرهێنا و هەر زوو زەردێنەو سپێنەو قەپێلکی شکاو بە دەستییەوە مەیین، بێزی لێ دەکردن، تۆش دەستت لە گوانەکانی بەردا، هەمین ئاوڕی لێ دایتەوە، لە مانگاکە نزیک کەوتەوە، بە تووڕەیی سەیری کردیت، وەك کابرایەکی تاوانبار سەرت نەوی کرد، پارچە پەڕۆکێك بە تەنافی حەوشەکەوە بوو، رایکێشاو دەستی پێ پاك کردەوە، بۆنێکی سارد کە پتر لە بۆنی ساردی شەهوەت بچێ" لەو هێلکە شکاوەوە دەهات، بۆنی ماسی ساردو هێلکەی شکاوو شەهوەت زۆر لە یەکدی دەچن، بە شێنەیی ناو لەپی بە شیر تەڕبووت بەلا رانتدا هێنا، نێرەکەری لەعنەتی لە زەڕین کەوت، لەو خەیاڵە خۆش‌و پەنهانەی کردن، مانگاکە هێور نەببۆوە، مریشکەکانیش لە ترسانا لە گارەگار نەدەکەوتن، تۆ خەمت بەوە خوارد ئازاری گوانی مانگاکەت دابێ، هەمین دڵی لای ئەو هێلکە شکاوە بوو، کەمترین زیان قەهری دەداتێ، درەنگ وەختێ شەرم لە چاوانی تۆو هەمین رەوییەوە، ترسیش لە چاوی مانگاو مریشکەکان، تاکە خەڵقەندەیەکی بێ ئاگا لەو ترس‌و شەرمە، دێزە بوو، هەمین لە چاوانت راما، دوو چاوی چکۆلانەو زیرەك‌و زیندوو، پڕ لە نیگای نەسرەوت‌و تیژ کە دەکرا هەر ئافرەتێك لەو نیگایانە بترسێ و لە بەردەمتا بشڵەژێ، نیگای پیاوێکی شەهوەتباز نەك دەروێشێکی خەڵوەتکێش، دوو

چاوی بە قووڵاچوو، دوو چاوی دەورەدراو بە برژانگی هێشتا ڕەش‌و درێژکۆلە کە کەوتبوونە ژێر دوو ئەبرۆی چڕو لوول‌و تێکەڵ، لووتێکی قنج‌و کەمێك پەڕفش، پتر لە کەپووی ئافرەتێکی بەگزادە دەچوون نەك هی پیاوێکی ماندوو، سەیرە.. تۆ هەمیشە لە وەخت‌و شوێنی نابەجێدا هەوەست هەیە، وات زانی هەنووکەیە، سەری کەپووی سوور هەڵگەڕابوو، نەرمایی گوێ‌و هەردوو کوڵمی، سپێنەی چاویشی خوێن سووری کردبوون" خوێنی شەرم، ترس یان شەهوەتێکی ناوەخت، هات‌و لێت نزیك کەوتەوە، قۆپچەی کراسەکەتی داخستەوە، لەو دەست‌و پەنجە ماندووانەی رامایت، تا قۆپچەی بەرملتی داخستەوەو سنگە تووکنەکەتی لە سەرما‌و با شاردەوە، شەوانە تا درەنگانێ بەو پەنجە ماندووانەی گەمەی بە تووکی ماش‌و برنجی سەر سینەت دەکرد‌و تۆش خۆت بۆ شل دەکرد، هەمیشە خەمت بەوە دەخوارد چ بە پێوە بیت‌و چ لە راکشانی نێو جێ‌و بالینگاندا بیت لە تەك هەمینی کەلەکەوێتدا بستێك کورتت دێنا، هەمین زۆر دەخوڕێ، دەنگ هەڵدەبڕێ، پێ درێژی‌و زمان درێژی دەکا.. جا چی بکەی؟ خۆشت دەوێ‌و لێی دەبووری، تۆ بڵێی هی ئەوە نەبێ کە لە تۆ بە خۆوەترو کەڵەگەتترە، با لە خۆی هەڵدا، شەو قەڵای مێردانە، شەوانە ئەو مایینە ژنە، ئەو لەندەهۆرە لە باوەشی پیاوێکی وردو چکۆلەو بالاکوڵی وەك تۆدا جێی دەبێتەوە، کەڵەگەت‌و بالا ئەسپینداری، شەوانە دەبێ بە چۆلەکەو باوەشی تۆش ئاسمانێکی بەرفراوان‌و بێ کۆتایی، دەبووە ئەنگوستیلەیەك دەچووە پەنجەت، دەستەسرێکی نووشتاوەی گیرفانت، وەك دڵۆپە

شـیرێکی خەسـتو مـەییو لەسـەر سـەری پەنجەیـەکت دەوەسـتا، دەبوو بە کۆترو دەچووە بن باخـەڵی گـەرمو تـووکنو ئارەقاویت، ئـەوێکی گۆشـتن لـە بەردەسـتی تۆیـەکی رەقەڵـەو ریوەڵـە دەبـوو بـە بووکەشووشەیەکی چکۆلانە، کە باسکت لە ناو قەدییـەوە دەئالاند وای دەزانـی دە پیـاوی نـاقۆلاو نێـرە زەلام لێك دراونو تۆیـان لـێ خوڵقاوە، شەوانە دەبوویت بـە شـۆڕە سـوارێکی لێزانو.. ئـەویش مـاینێکی سـپی بـێ زیـنو لغـاو، ماینێك کـە بـڕای بـڕ سـوارەکەی نــەگلێنێ.. سەرسـم نــەداو نەیپـەڕێنێ، پــتر لــە چــاوانی ورد دەبوویتەوە.. هیچ بەیانیـیەك ئاواهی بە تاسووقەوە، بـە ترسـەوە، بە شەرمەوە لێکدی رانەماون، زانیت هەوەسێکی پـەنهان وا دەنێـو چاوانی، تۆ دەزانیت کەی ئـەو چاوانە نەوسن دەبن، کـەی بێـزارو غەمگین، کەی بە کەیفو پڕ ئومێد، ئەم بەیانییە بوو کە ترسێکی نادیـارو هەوەسـێکی شـەرمن لێکدی نزیکـی خسـتنەوە، پـتر لێـی ورد بوویتەوە، لە ژێر تەنکە تەمو تاریکی بەیانیدا لە (مریـەم)ێکـی کلۆڵ دەچوو، (حەوا)یەکی تازە لە بەهەشت دەرکراو، هەیکـەلێکی دەگمەن لـە مەینـەتیو زەبوونیو زیبـایی، هەنووکـەش هـەر جێی تەماعە، هـەرکێ سـەیری بکـا دەزانـێ ئـەو وەختـەی جحێڵ بـووە چ ئـاگرێکی بـێ ئامـانی لـە دڵـی کـوڕو کـاڵان کردۆتـەوە، چ ئـاژاوەو بـەزمو هەرایـەکی ناوەتـەوە، جوانییـەکی کـۆنو دێـرینو سـادە، سـادەتر لــە هــەر شــتێك، وا لــە رووخســاریدا مــەییوەو هێشــتا نـەمردووە، ئـەو جوانییـەی سـالانێك لـە دڵـی ئاغـاو کوێخاکـانی گوندە دوورو نزیکەکان قیامەتێکی خوڵقاندبوو، قوڕی بـۆ خـەڵکی دەگرتەوە، قاوو قیژو شەڕو هەرای لـە نێو کـەلاوەو باڵـەخانەکاندا

بەرپا دەکرد، کاسەو کەوڵی ژنانی پڕ لە ژەهر دەکرد، ژنانی لە مێردان دڵ کرمێ دەکرد، ئاغاژنەکانیش دووچاری دەردەدڵو دڵەڕاوکێ ببوون، بە قەد عزرائیل لە هەمینێ دەترسان، هەروەختێ هەمین وەدەر دەکەوت، چ لە شینو چ لە شاییان، چ بێری بووبێو چ ئاوهێنی سەرچەمان، پیاوان نەوسنانە چاویان تێ دەبڕیو وەلێ حورمەت گرانە.. دەست بزافتنو پلارهاویشتن سەد عەیبو عارە، بەڵام کوڕو کاڵ خۆیان بۆ راگیر نەدەکرا، کوڕگەلی گوندی وڕوکاس لە نێو ئاواییو لە دەشتو دەران، لە نێو هەرێزو پەرێزو پەنا جۆخینان غەریبو وێرانە ماڵ دەسووڕانەوە، سەپانو پاڵەو جوتیارو مسکێن لە مزگەوتو دیوەخانەی ئاغاو سەکۆی بەرماڵان سەریان لە بن گوێی یەکدی دەناو بە کۆڵێ تەریقیەوە.. بە دزییەوە لیکیان دەکردو لە هەمین دەدوان... ئەوڕۆ لە پەرێزێ دیتم، دوێنێ لەگەڵ کچو کاڵی گوندی لە رۆخ چەمی چەقەلان جلی دەشووشت، گوایە ئاغا مرخی لێ خۆش کردییە، کوڕەکانی ئاغاش پارێزی لێ دەستێنن، کارمامزانە ئاوڕ دەداتەوەو دەڕوا... خۆزگەم بەوەی سەعاتێك دەچێتە باخەڵی، راموسانێكو پاشان مردن حەڵاڵە، کەس زات ناکات بۆ خوازبێنی لە دەرگای ماڵی بابی بدات.. وەسمانە خێل دەڵێ: سێ کچان لە قەبێری هەمینێ دەدەم، ژنانی ئاوایی هەر هەموو لێی دڕدۆنگن، پاش هەر شاییو رەشبەڵەکێك هەندێ لە مێردەکان سستو دڵگران دەخزێنە پاڵ ژنەکانیان، هەمین چ هەمین.. دەك ماڵی چاوەکانیم بە قوڕ گرت.. هەر کتو مت دوو دەنکە ترێی رەش میرین، ئەو زەمانە کێ کوڕی کێ بوو؟ شا بسكو کەزییەکانی کە

بەسەر هەردوو هەرمێی باخی سوڵتان بەگی دەهاتنە خوارێ موسڵمانیان کافر دەکرد، شێخی (سەنعان)یان لە دین وەردەگێڕا، بالآ بەرزەکەی.. ئەو خوێنە گەشەی سەر کوڵمو کەپووو نەرمایی گوێی کە لەگەڵ قرێژو خۆڵو تۆزو گەردی زەمانە شەڕیانە، ئەو رەنگە سپیەی لامل و بەرگەردنی، پیاو سەد دڵی هەبووایە، شتاقێکی پێ نەدەما، هەمین.. (هەمینی هۆمەری سەرکار)، سەرکاری باپیر ئاغا، باپیر ئاغای گۆپاڵ رەش، ئەو ئاغایەی کە هێشتا هەمین پارچەڵە بوو سمێڵی لێ دەکرۆشت و بە پەنجە شەوو رۆژی هەژمار دەکرد تا بستێکی دیکە بالآ بکاو ببێ بە هەوێی سێ ژنان، خانمو گەورەو سەرداری هەموان، قسەی لەسەر قسان سوار بێ، ئەوسا دەبوو بە هەمین خان، نەك ژنی رەنجدەرێکی مایەپووچ، ژنی ئاغای سیازدە گوندان، کەچی هەمینی کەلەکەوێت پشتی لە ئاغاو باب و برایان کرد، سەرت لەوە سوڕما چ زوو فریوت دا، چ زوو دەعەمەلت هێنا؟ لە شاییەکەی (کەریم مەیتەر)ەوە رازو نیازتان گۆڕییەوە، بەیانییەکی زوو تەگبیرتان کرد، خۆت هاوێشتە کادینەکەیان، لەوساوە بە عەزرەتی بچیتەوە گوندەکەی خۆتان، جارێکی دیکە مەلە لە چەمی چەقەڵان بکەیت، وای لە بۆنی خۆشی ناو کادینان، خۆشی سەر ئاخوڕو ناو تەویلەکان، ئاونگی رژاوی سەر پووش و پەڵاش لە بەیانییەکی زووی بەهاردا، ژوانی سەر چەم و نێو پەرێزو جۆخینان، خۆ گەوزاندن و ئەو گەوزاندن دەنێو قەرسیل و گوڵەگەنمەکان، بیرتە دەبوو بە چ هەڵلایەك لەسەر دابەستنی رەشبەڵەك، پێت شك بێ سێ جاران لە شایی دەستت گوشی،

سەری پەنجەکانی، پاشان غیرەتت دا بەرخۆت بە پەنجەی گەورە ناو لەپیت چاڵ کرد، یەکەمجار چاوچاوانێ، پاش پلارو غەمزە، چاو داگرتن‌و برۆ هەڵتەکاندن، ناردنی چریکەی حەیرانێك لە نیوەشەوێکی هاویندا، بریسکەی ئاوێنە لە چاودان، وای لە لەزەت‌و هیلاکی ئارەق رشتنی پاش رەشبەڵەك، ناو لەپی ئارەقاوی‌و لێکدی خزان، پەنجە لێکدی گیرکردن، بە ئەنقەست گوشینی سەری پەنجان، بە دوو چاوی برسی لە هەردوو شەمامەی باخەڵ رامان، بە نازەوە خۆ لەنگاندن وەختێ هەموو شتێك لە حەیبەتا سەما دەکا، هەڵدەپەڕێ‌و پێ دەکەنێ، تریقەو حیلکە حیلك، دونیایەکی سادەو ساکار، ئاڵاو واڵا، ئاسمانێکی فراوان‌و شینتر لە کوژەڵە، خاکێکی بێ کۆتاو میهرەبان، بە سەری پەنجە دەدوان، لێکدی خزان‌و لێکدی لووس بوونی پەنجە رەق‌و نەرمەکان، ئەو پەنجانە رازو نیازو گلەیی‌و حەسرەت‌و ئاخ‌و ئۆف‌و ماچیان دەگۆڕییەوە، لە ژێر شەرواڵ‌و کراسی سورمەوە ڕانتان لە ڕانی یەکدی دەخشا، ئەوەندەی نەدەما دڵی شایی‌کەرانی نێو هەڵقەی رەشبەڵەك بپەڕێتە ناو دەمیان، هەناسەبڕکێ هەوەسی هەمووانی دەبزواند، هەڵتەك‌و داتەکی ئەو مەمکانەی سوخمەیان دەدڕی، ختووکەی شیرین‌و تەزووی بەتام، حەزیان دەکرد تا قیامەت دۆڵ‌و زوڕنا بکوترێ‌و ئەوانیش هەڵپەڕن تا گۆشتیان لە حەژمەتانا وەك لۆکە هەڵدەوەرێ، تا ئێسقان‌و جومگەکانیان ئارەقە دەکەن‌و لێکدی دەترازێن، ئەو ساڵە بەهارەکەی بە بەرەکەت بوو، هەوران لێکدیان دەخوڕی، مەمکان کراسیان دەدڕی، پیرەکان لە بن دیواری کەلاوە شان

شکاوەکانەوە چەناگەیان دەخستە سەر کەشکە ئەژنۆیان، بە حەژمەتێکی جەرگبڕەوە پەنجەکانیان لە کامەی گۆچانەکانیان گیر دەکرد، حەژمەتی رۆژانی تافی لاوێتی زوو بەسەر چوو، جحێڵەکان دارو حەیزەرانیان با دەداو تیلاکیان لێ خوار دەکرد، تەوقەو یەکدی ماچ کردن، لە دوورەوە سڵاو کردن و چاو داگرتن و سمێڵ کرۆشتن، لە سەربانانیش نیگای پڕ لە شەرم و حەیا بەسەر کوڕو کاڵانی گوندی دادەبارین، هەلهەلەی پڕ لە شەهوەتی شەرمنانە لە دە لاوە وەك کۆتر هەڵدەفڕین، پیاوان بە دەم زەردەخەنەیەکی هیلاکەوە گوێیان قوڵاغ دەکرد، دەبێ ئەو هەلهەلەیە هی عەیشێ بێ، فاتم یان رابی.. (با) لە حەوشەکانەوە دەیهانی و سەربانەو سەربان دەیبرد.. حیلکە حیلکی دوای هەلهەلەی کچۆڵان لەگەڵ فڕەفڕی باڵی چۆلەکە بزێوو لەعنەتی‌یەکان تێکەڵ دەبوون، قریوەو تریقەی زۆر ناسکی.. زۆر شەرمنی ئەوان دوور دەڕۆی، تا نێو مەزراو بێستان و پێدەشت و چەمی چەقەلان، هەر گوڵەگەنمێك چۆن بە شنە باو نەرمە باران دەشنێتەوە، لەگەڵ ئەو قریوانە دەشنانەوە، دەنگ و هەراو هاوارو قریوەو شاباش تێکەڵ دەبوون و لەسەر ترۆپکی درەختەکان دەنیشتنەوە، بەسەر چارۆگەو رەفتەو کراسی ئاگر بارانی کچان و ژناندا هەڵدەوەرین، تەنها فیقەی زوڕنا و دەنگی دەهۆڵ دەیتوانی هەموو دەنگ و چرپە نزمەکان بکوژێ و پەرتیان بکا، تا دەهات هەڵقەی شایی دەکشا و بەرینتر دەبوو، خۆر نەیدەخواست ئاوابێ، مانگ پەلەی بوو هەڵبێ، تریفەی شیرین وەك مێ جێی بە نێرینەی هەتاو لەق دەکرد، هەواش فێنکی دەکرد، ئارەقەی بن

هەنگڵو سەر کوڵمو نێو مەمکانیش دەبوونەوە چەند دڵۆپە شەونمێکی سارد، داڕژانی تەنکە تاریکی سیحری پتری پێ دەبەخشین، جورئەتی پەنهان جۆشی دەسەند، ئیتر هەموو کەسێك، هەموو شتێك پتر دەخرۆشا، مانگ بە بەغالەتەوەو تاوێك بە میهرەوە لێی دەڕوانین.. وەك ئەوەی ئەو گوندە مەملەکەتێك بێ لە دەرەوەی ئەو خاکەی مانگ تریفەی خۆی تێ دەهاوێژێ، مەملەکەتێك بۆ تەنها شەوو رۆژێك تاسەی ئەوەیانە کە هەموو خەمو دەردو شەڕو شۆڕەکانی سەر گۆی زەوی ئافەرۆز بکەن، دەبا خۆشی بۆ تاوێك فێڵ لە خەم بکاو لە گوندی وەدەری بنێ، چراو لامپاو فانووسو قوتیلەکان یەکە یەکە هەڵدەکران، هەموو هاوارو قریشکەکان، چەپڵە لێدان، بە توندی پێ لە زەوی کوتان... تەقاندنەوەی گەروو بە بەستەو حەیرانو لاوکان.. هەر هەمووی ترسە لە هێرشی تۆزێکی دیکەی لەشکری خەمان، فیقەی زوڕنا کوشتنی زریکەی مەرگە، مەرگی ئازیزێك، زرمەی دەهۆڵ خنکاندنی هاواری هەموو ئەو پیاوانەیە کە ئاغا بە زیندویێتی چاوان لە چاڵەکانی دەنان، قریوەی کچانو پێکەنینی گەرمو تریقەی لەپڕ تەقیوی کوڕان تەنها.. مەگەر بە تەنها ئەو دەمە تێکەڵ بێ.. تاوێکی دیکە مەگەر لە سەربانەکانەوە، لەسەر رێی چەمو جۆگەلەکانەوە، لە درزی کەلاوەکانەوە، لە نێو پەرێزو هەرێزو کادینو سەرئاخوڕو نێو تەویلەکاندا ئەو قریوەو بزانە لە نیوەی رێدا بگەنە یەکدیو زوو بمرن، هەنووکە هەلە بێ شەرمانە پیرەکان دڵۆپە فرمێسکێك بە یادی جاران بڕژێننە سەر ریشو سمێڵان، مێردمنداڵان قولانجێکی دیکە باڵا بکەن، باخەڵی کچان

پڕتربێ، ژنە هیلاکەکان بەحاڵ هەوەسیان بجووڵێ، جوتیارو ڕەنجبەرو شوانو گاوانو پاڵەکان.. ئەوانەی هەنووکە دەستەپیاون تۆزێك جحێڵ ببنەوە، دەبا ئەمشەو هەموو شتێکی مردوو زیندوو بێتەوە، هەموو شتێکی خەوتوو وەئاگا بێتەوە، بۆنی حێڵو مێخەكو قەرەنفول.. بۆنی قورسی ئارەقەی پیاوان، شیرین لای ژنان.. بۆنی ئارەقەی ساردی ژنان، دڵڕفێن لە لای پیاوان بەسەر گوندیدا بڕژێ، با بۆن بڕوات، تۆزو خۆڵ لەسەر کەزیو بسکان بنیشێ، تریفە بڕژێ، خۆشنوودی بتکێ، لەشکری خەم راوەدوو بنرێ، سەرگۆی مەمکان پتر بتەزنو بلەرزن، ناوقەدی کچە باریکەکان وەك شەنگە بی بلەرێنەوە، کەفەڵی ژنە قەڵەوو گۆشتنەکان لەگەڵ هەر لەرزینو داتەکینێك داتەکن، چاوە رەشو پڕ لە کلو بەڵەکەکان پڕ غەمزەو بە خومارتر بن، سەرلووتو کوڵمە ئارەقاوییەکان ئاڵتر، زبانی نێو دەمە تەڕەکان تاویّ تاڵو تاوێك شیرینتر، خرینگەی بازنەکانی مەچەکان بە ئاوازتر، حەمایلو پلپلەو گوارەوخەزەصم پڕ بریسکەتر، پێ بە خلْخاڵ شل بن لە بەر رەفتو رۆینێ، هەموو چرپەیەك نازێکە، هەموو عیشوەیەك گازە، بەیانی هەر هەمووی وەك خەونێکی شیرینی لێ دێ، دوو رۆژی تر نابات دەبێ بووك بکەوێتە دوای قوونی ئەو مانگایانەی ریخ بەر دەدەنەوەو ئەو کەرانەی تەرسەقوول دەکەن، ئیتر عومری جوانی چەند شەوێکەو تەواو، هێی دەروێش.. ئەو بەزمو هەرایە هەر هەموو دەبوو تۆ خۆشی بکەیت.. کە لێ دەبوویتەوە لای هەندێ شایەرێکی دەنگ زوڵاڵو لای هەندێکی دیکەیان لوتی بوویت، سەپانێکی پەڕپووت، هەر

وەختێ شایی گەرم بووایە ئاغاو هۆمەری سەرکارو پیاوانی گوندی، ئاغاو کوێخای گوندەکانی دیکەش، هەر هەموو کوڕو کاڵی گوندی، چ گاوان و چ شوان، چ پاڵەو چ فەقێی مزگەوتان، بۆ جۆشدانی بەزم و خۆشکردنی شایی بانگیان دەکردی، ئەتوو نە لە غارغارانێی سواران بەشدار بەو نە نیشانە بشکێنە.. لە توومان ناوێ شەش تەغار گەنم بدووریتەوەو پشت راست نەکەیتەوە، برا.. مەیە مزگەوت و.. بۆ مردووانیشمان گۆڕ هەڵمەکەنە، لە هیچ هەرەوەزییەك بەشدار مەبە، واز لە بانگوش بێنە، هەر ئەوەندەمان لە توو دەوێ دەست لە بن گوێت بنێ و تێی بچریکێنە، چی مەل و ئاژەڵی ئەو ئاقارە هەن، چی زیندەوەری سەر ئەرزو بن ئەرز هەن گوێیان بۆ ئەو چریکەیەت شل دەکرد، خۆیان بادەداو خۆیان رادەژەند، نەك هەر مەلاو ئاغاو پیاوماقوولانی گوندی، بگرە منالانیش دەستیان لە زرمەزلێ هەڵدەگرت و لە بەردەرکی دیوەخانێ گرد دەبوونەوە، بە خشکەیی لەسەر سەکۆکان، قاڵدرمەکان، بەر بەرۆچکەو نێو هەیوان و حەوشەکان هەڵدەتروشکان، پەح لەو دەنگە زوڵاڵ و کەرخ و دڵڕفێنە، کە بە لاوکێ یان حەیرانێك تێت دەچریکاند، گوندت دەخستە سەر سەماو ئاخ و داخ، مەڕو مالات و رەشەولاغەکانیش بەو چریکەو سەدایە تاوێك و دەسرەوتن، هێور دەبوونەوە، شیرێکی پتر دەڕژایە نێو گوانەکان، پیاوە هەرە دڵڕەقەکان ناسك دەبوونەوە، بگرە باپیر ئاغای گۆپاڵ رەشیش ویقاری خۆی بیر دەچۆوەو لە حەژمەت و لە تاوان سەرو کەللەی کەوتووی لە ژێر شەدەو هەوریدا بادەدا، لەرەلەرو جۆلانەی گوڵینگۆکەکانی شەدەو هەورییەکەی لە هی

پیاوێکی عاشق دەچوو نەک ئاغایەکی بە زەبرو زەنگ، دەمارە گرژەکانی نێوچەوان و لا شەویلاگی خاو دەبوونەوە، خۆش خۆش هەناسەی دەدا، حەزی دەکرد دیوەخانە چۆڵ بێ و بگری، ئەو کەرەتە لە گوندی دەنگی دایەوە کە مەلا زۆری بۆ هاتووەو کەشیدەی لێ فڕێ داوەو سەری لێ رووت کردووە، ژنان لە دوورەوە گوێیان هەڵدەخست، ئەو چریکەیە لە گوێیانەوە دەڕژایە ناو رۆح، لە پەرەی دڵی دەدان، سۆزێکی بزرو مردوو لە لایان وەئاگا دەهات، بە دزییەوە سەدەها خەونی رەنگاوڕەنگ و پڕ لە نهێنیان دەدی، چ خۆشترە لە نزیکەوە چریکەو سەدای بایز گوارەیان بلەنگێنێ، لە شایییەکەی (کەریم مەیتەر) ژنان و کچانی گوندی لە ئاغاژن پاڕانەوە.. دە تووخوا با ئاغا لێ بگەڕێ بایز بێتە ناو هەڵقەی ژنان و یەک دوو حەیران و بەستەمان لۆ بڕێ.. مەلا چت گۆت؟ ئاغا.. با گوناهەکانمان لەوە پتر نەبن.. رەشبەڵەک حەرامترە یان چوونی حەیران بێژێک لۆ ناو ژنان؟ ئاغا هەردووکیان.. جا تووخوا مەلا ئەگەر بنیادەم سەد جاران بە ئاگری جەهەندەمێ بسووتێ کوو رەشبەڵەک و دۆڵ و زوڕنا لە خۆی حەرام بکاتن؟، تۆش خۆت گران دەکرد.. هەقت چی بوو؟ فزەت لێوە نەدەهات، دەتزانی قسەی ئاغاژن بەسەر ترسەکانی مەلادا زاڵە، کێ دەوێرێ قسەی ئاغاژن بشکێنێ؟، دواجار هەر هەوەسە دەیباتەوە، ئاغا چ رەشبەڵەک و چ دۆڵ و زوڕنا، هەر هەمووی هی سەردەمی کوفرو زەلالەتە، بەلانەکینێ سووکە گوناهن و بە ئاوی دەست نوێژێک دەشۆرێ و پاک دەبنەوە، کوڕو کاڵی گوندی گوێیان لەو مشت و مڕە دەگرت، گوێ قولاغ بوون، کێ یەکەم

کەسەو مژدە بە ژنان دەدا؟ دیوەخان زرمەی دەهات، پیاوماقوولان لەسەر مافوورەکان چوارمشقی روونیشتبوون، چەقە چەقی کەوتنە خوارەوەی قلی تەزبیحەکان هەوای دیوەخانەکەی پڕ کردبوو لە هەرایەك تێکەڵ بە ژاوەژاوی گەرمی ئاغاو مەلا، پیرەکان وان لە بنە بانێ، ئاغا لەسەر پەڕو کوڕەکانی خۆیشی هەمیشە وان بە دەوری‌یەوە، لاوو تۆلازی گوندیش لە ناو دەرگاوە تا نێو پێلاوەکان لەسەر ئەژنۆ قیت دانیشتبوون، نەدەبوو پشت دەنە دیوارەکان، ئەوەیان ئەوپەڕی بێ حورمەتی‌یە، بە ترس‌و شەرمەوە لە ئاغاو مەلایان دەڕوانی، بەحاڵ دەوێران سەر لە بن گوێی یەکدی بنێن‌و بە چرپەوە رازو نیاز بگۆڕنەوە، لەودیو پەنجەرەکانەوەو لەسەر سەکۆکان غەڵبەغەڵبێکی خنکاو.. مێردمنداڵەکانیش تەیارو ئامادە بۆ خزمەت لەسەر پێ وەستا بوون، ئاغا سەری لە بن گوێی هۆمەری سەرکار ناو چرپاندی، جەمعی دیوەخان ملیان درێژ کردو هەناسەیان لە خۆ بڕی.. سەرکار سێ جاران سەری لەقاند، هەر دەڵێی دوێنێ بوو دەروێش.. رۆیشت.. بانگی کردەوە.. بە هەڵەداوان هاتەوە بەردەمی.. ئەو پیاوە درێژە دوو قەد نووشتایەوە.. نووشتانەوەیەکی وا کە جەمەدانی‌یەکەی بکەوێتە ناو کۆشی ئاغا، چرپەیەك‌و سەر لەقاندنێك.. هۆمەری سەرکار بە دوو باز لە دیوەخانێ چووە دەرێ.. لە ناو دەرگاکە، بەر لەوەی ئاودیو بێ، بانگی کردیت، یەکڕاست هەستایە سەر پێ، رێیان بۆ چۆڵ کردیت، لە دەرەوە شەقژنی گوللەی نیشانەشکێنەکان کاسی کردیت، فیقەی زوڕنا، زرمەی دەهۆڵ، شایلۆغانی زۆر گەرمی

دەوری دەواری هەڵدراوی پێش دیوەخان، سەگ ساحێبی خۆی نەدەناسی‌یەوە، چۆپی، شێخانی، سێ پێیی.. بەستەو دەنگی کەرخ و کەوتووی جحێلان، چەپلەڕێزان، داڕژان و تێکەڵی دەنگەکان، ئاغا لە ژوورەوە وای دەزانی خۆی خودایەو ئەو خەڵکەش دەنکە رەشەکانی تەزبیحەکەی دەستی کە قل قل گەمەی پێ دەکردن، ئەو دەنکە تەزبیحانە وەك چاوی مار دەبریسکانەوە، بایز هەر لە دوورەوە هەوەسی گوتنێی دەبزوا، سەد حەیران و لاوك بە قوربانی بەژن و بالای کچانی گوندی، بە قوربانی ژنانی باخەڵ شۆڕ، بە قوربانی وردە رۆینی نازك و كەو ئاسایان، ئاوڕدانەوەی کارمامزانە ئەو وەختەی بە شەرم و نازەوە چاوان خێل دەکەن، چاو بازان، ئەبرۆ سەقەران، وەی لە بزاوتنی شەماڵ بۆ بسك و شابسکان، چاوهەڵنەهاتن لەبەر وردە پەرچەمان، وەی لەو گوێ ورد و زەرد و تەنکانە کە راناگرن قوڵفی گواران، سەد حەیران بە قوربانی دەرزیلەی سەر سوخمەو هیزارو... مەرجان و ملوانکەو مورووی بەر ملی گەردن زەردان، وەی لە باق و بریقی گوارەو خەزێم و گەردەنلغ و ئاشق بەند و دوگمەو دۆلابان، بازن و ئەنگوستیلەو خڵخاڵ و کەمەربەندان، چ شیرینە لەرینەوەی حەمایل و قەنەفڵبەندان، وەی لە سروەی بۆن هێنی بن هەنگڵ و ناو باخەلان، سوور هەڵگەڕانی کولم و لێوان، تنۆکی ئارەقەی داخزاوی نێوچەوان و چەناگەو بناگوێ و شۆڕبوونەوەی تا ناو جۆگەلەو بیرازی تەنگی مەمکۆلانی کچە تازە باڵق بووەکان، بزەی سمێلان، پشتێنی شل و جەمەدانی لارو تەزبیح بادان، چارۆگەو دەسماڵ لە زەوی خشان و هەوری کەوتنە ملان، سەرو مل شل بوون لە ژێر

قورسایی گەزو گوڵینگان، پڵپڵەو حوریەتو یاقووتان، کراسی جورجێتو کەوای سورمەییو سوخمەی بەرتەنگی سیمدار، سەرچۆپی کێشو پێ لە ئەرز کوتان، دزە نیگاو پەنجە گوشین، ئاخی گەرمو هەناسەی سارد، لە ناکاو رژانی تووتنی نێو کیسەی بەرپشتێنان، حیلەی ئەسپو وەڕینی سەگەل، فڕینی لە ناکاوی پۆلە کۆتری سەربانی مزگەوت لە ترسی چریکەی حەیرانو هاواری ئەڵڵاهو ئەکبەر، بۆنی ساوار.. پلاو.. یاپراغ.. تێکەڵ بە دۆینەو دۆغەوا...

کوڕو کاڵ بە پیرتەوە هاتن، لاکەون، ڕێ چۆڵ کەن، دوور کەونەوە کوڕگەل، ژنان وان لە ماڵی ئاغا..

(بایز.. کافر.. ئاگات لە دڵی ئەو ژنو کچانە بی، گۆتنەکەت بەندی هەناویان نەپچڕێنێ، خۆت لە بیر نەچی.. ها.. حەیرانو لاوکێك، یەك دوو بەستەو تەواو..)

هەر هەموو کوڕگەلی گوندی بەغیلیان پێ بردی، هەر خۆت تەنیاو نێرەوزێکت لەگەڵدا نەبوو، کەسی دیکە نا، هەر خۆتو حەیرانێکی بریندار، خۆتو دڵێکی شەیدا.. شەیدای هەمینێ..

(خودایە.. لۆ دەنگت خۆش نەکردین؟)

هەر خۆتو بەستەیەکی شەرمن بەسەر لێوتەوە، هەر لە دوورەوە تیلاکت لێ خوار کردو تەزبیحەکەت هەڵدەگلۆفت، هەردوو ناو لەپت ئارەقەیان دەردا، بەر لە خۆت بۆنێکی پیاوانە گەیشتە ناو کۆڕی گەرمی ژنانو کچان کە بە نێو یەکدیداو لە ناو حەوشەو ژێر هەیوانی ماڵی (ئاغا)دا تێك دەقژقژان، زوو زوو هۆمەری سەرکار دەیچڕپاند:

---

(بایز.. ئەها.. بە دەم گۆتنێوە نەکەی چاوان بگێڕی.. ئاغای خۆت دەناسی)

زەردەیەك نیشتە سەر لێوانت، ویستت پێی بڵێی:

(جا ئەمن بێجگە لە هەمینی کچت.. چ کچ و ژنەکی دیکە دەبینم؟)

(پێ مەکەنە.. ئەگەر ژنانی ئاغاش پاڕانەوە.. مەیکە.. وا مەکە لە دیوەخانێ ئاغاو پیاوەکانی چاوەڕێ بن!)

کە ئاپوورەی ئاڵاو واڵای بەردەرگای ماڵی ئاغات بینی، چی دیکە ئاگات لە ڕێنمایییەکانی هۆمەری سەرکار نەما، هەر لە ناو دەرکی حەوشێوە ژنان و کچانی گوندی وەك ڕەوە مامزو کارمامزان چاوەڕێیان دەکردی، بەر لە گۆتنێ چاوانت دەگێڕاو لە هەمینێ دەگەڕای، لە شەرمانا چاوت ڕەشکەو پێشکەی دەکرد، ئەوەتا غەزاڵی مام وسووی، ئەوەش رابی، زولەیخای چاوتیل ڕێت بۆ خۆش دەکات، خازێ خۆی ڕەپێش دەکاو زەردە دەیگرێ، مریەم پاڵی بە کۆڵەکەی ناو هەیوانێدا داوەو بە مەکرەوە بنێشت دەجوویێ، ئەسمەری کا بایزی هیزارە لارەکەی ڕاست دەکاتەوە، ڕەوشەنی مەلا نادر نووشتاوەتەوەو فوو لە ئاگرێك دەکاو سمت و کەفەڵی پانی هەر هەموو حەوشەکەی داگیر کردووە، خەجیجێ ڕەحمانی، جەواهیری وەسمانە خێلی، حەلیمەی بادینی، زولەیخای حەمە سەلانە، هەر هەموو سەرگەرمی ڕێکخستنی مەنجەڵێکی ڕەش داگەڕاون لەسەر سێ کوچکەیەکی لەق و لۆق، فاتم بە بیانووی گەرما چارۆکەی لێ فڕێ دابوو، بەرملی سپی لە تەك سوخمەی ڕەشدا ئاگریان دەکردەوە، بە پەنجەی شایەتمانە

ئارەقەی بەرملی دەسڕییەوە، یانێ ها، (سەیری ئێروکانە بکە)، ئامینەی کوڵەندە سیخورمەی لە عەیشۆکی کوڵەبنە دەدا، یانێ ها، (سەیری بایز کە..!).

(خودایە هاوار.. فریام کەوە)

چ بێ باکانە، بەڵام بە کۆڵێ عیشوەو نازەوە دەهاتنە بەردەمت، چین چین گۆشت، گۆشتی شل و پل، نەرم و نیان، دەکەوتنە سەر یەکدی، گۆشتی ژنان و کچانی سپیکەلانەو رەش ئەسمەرو سەوزەڵێ و گەنم رەنگ، چاوانت دەگێڕا، ماندوو بووی، دەتویست وەك هەنووکە هاوار بکەی، (هەمین.. ئەتوو لە کێندەری؟)، دەتووت وەك هەنووکە بە ئەنقەست خۆیت لێ بزر دەکا، تاوەکو حەجمانت لە بەر بڕێ، کت و پڕ، وەك لە ئاسمان کەوتبێتە خوارێ، بینیت، کەیل و کاس، گێژو حۆل بە ناو پۆلی کچان و ژناندا دەخولایەوە، کەوگیرو قاپی لێ دەکەوتن، رەنگی گلەیی لە چاوانی مردوو، بە مەکرەوە لە پشت ریزێك لە ژنانەوە تێی دەڕوانی، وەك ئەوەی بە تۆ بڵێ: ها لە کوێ بووی؟، چ نەوسنانە سەیری دەکردیت، ئەم بەیانییە لە ناو دەرگاکەوە بە هەمان نەوسەوە سەیری کردیت، وەك ئەوەی سالانێك بێ و توخنی نەکەوتبیت، پیرەپیاو کەی ئەوەندی بێ دەمار بوویت؟ ئەمشەو کە هاتەوە لە خۆشی ئەو راوە بە بەرەکەتە بیگەوزێنە، دەتگەوزێنێ، رایمووسە.. راتدەمووسێ.. خوا بکەم نەڵێ: ئۆە.. پیاوەکە.. دەم و ژەمت نییە.. ئەمن ئەوەندە شەکەت و ماندیم.. وا دەمرم.. جا چش.. وەرە ئامێزم و زیندیت کەمەوە، سەبەتەی هێلکە بێ سەری کردیمەو دێمکەی شیر هەردوو پیلی بەردامەوە،

ئەوڕۆ نانی جەژنێم لۆ ماڵی سمایل بەگ تەکمیل کرد، پڕ ژوورەکی جلی بابەکر ئاغام شۆری کە حەرام وەڵلا پیس نەببوون، ئەوانە چ توخمێکن؟ چ بێ دڵو دەروونن.. جاری وا هەیە لە بەرقاپیان سڕ دەبم ئەوەندەی بوەستم، ئاوی هەردوو چۆکم دادێ، سبەی دە هێلکەی دیکەم دەوێ، دێمکەیەك شیر، هەمین خۆ شیرەکەی دوێنێ ئاوی تێکەر نەبوو؟ زۆر زوو ترشا.. ئەها بایز.. دونیای ئاغا و بەگلەران چ سەیرە.. ئەو ڕۆژە ژنێکی عەلمۆدە لە بەردەم ئاغاژن لەسەر کورسی‌یەك دانیشتبوو.. چ بکا باشە؟ چوزانم.. بە مەرهەمێکی سپی، سپی‌و چەور، هەر دە پەنجەی ئاغاژنی دەشێلا، پاشان یەکە یەکە کچەکانی هاتنە بەردەمی ژنەو دەستو پەنجەی ئەوانیشی چەور کردو شێلای، گوێم لێ بوو کچی چەلەبیش بە دایکی دەگۆت: چی دیکە پیاڵەم پێ مەشۆ، ئاخر پێستی پشتی دەستەکانم بێخ هەڵدەدەن، دەزانم هەمین.. دەزانم.. ئەو خانمە تەوەزەلانە دەرپێی خۆیشیان ناشۆن، گوایە نینۆکیان درێژەو دەشکێن، هەمین وازم لێ بێنەو هارم مەکە، واز لە قەحپەو گەوادان بینە، ئەو دەستە سپی‌و نەرمو نۆڵانە بۆ قاپ شۆرینو جل شۆرین نەکراون، ئەو دەستانە هی ئەوەن گونی کەرەکەمی پێ بگرن، ئەیەڕۆ پیاوەکە.. لە کنە خۆ پیاوی تەریقەتی.. هەر ئەو دەستانەی منو هەر ئەو دەستانەی ئەوان! لە بەیانی‌یەوە تا ئێوارێ وان لە ناو قوڕو لیتە، یان کەفە سابوون، یا هەویر شێلان، یان هەڵگرتنەوەی تەپکەی ریخو تەرسەقول، با بۆ خۆی برێسێ، بەو دەستو پەنجانە دەمارەکانی شانو ملت دەگرێ، بە میهرەوە دەست بەسەر سینەی تووکنتدا دێنێ،

لەوەتەی لە گوندی هەڵەتە بوون بەو دەنگە زوڵاڵەت کەم شەو هەیە بێ لاوك‌و حەیرانی بکەی، شەوانی درێژی زستان لە بەرگڕی پەنگری گەشی ئاگردان، شەوانی هاوین بە دەم تێڕامان لە جریوە جریوی ئەستێران، دەنگت دەگاتە کەلاوە شان شکاوو خانووە پڕ لە ئاژاوەو دەردو خەمەکان، هەموو شەوێك لەوەتەی رەدووت کەوتووە، ترسێك داتدەگرێ، لە قەهری ئەو غوربەتەو لە حەژمەتی تەنیایی‌و لە ترسی تارمایی مەرگ ئەو لاوکەی بۆ دەچڕی کە خوێن لە دڵ دەدەڵێنێ، حەیرانێکی بریندار، وەك دوو منداڵ کە لە خێوو تارمایی‌و جنۆکەی ناو ژێرزەمینێك بترسن دەخزێنە ناو باوەشی یەکدی، سەیرە.. هەر خۆی دێتە ئامێزت، هەر خۆی دەتشواو بسکە درێژەکانت دادێنێ، هەر خۆی دێتە حەمامەکەو بە بیانووی پشت شۆرین شەرت پێ دەفرۆشێ، جاری وا هەبووە گومانت لێ کردووە، زوو زوو پێت دەڵێ: جیقن هەر لەگەر توو وام.. دەنا کەسم بە پیاو نەزانی‌یە.. هەر وەختێ پاك بێتەوە دێتە بن هەنگڵت، ئەوساش کە تۆی دەدی حەیاو شەرمی نەدەماو پڕ بە چاوان لە تۆ رادەما، سەد ژن‌و پیاو بوەستایە لە تۆ نەدەپرینگایەوە، بیرتە ئەو وەختەی هۆمەری سەرکار لە ناو حەوشی ماڵی ئاغادا بەجێی هێشتی، پاش قەدەرێکی درێژ کە تۆی بینی رەنگی پەڕی‌و قاپ‌و کەوگیر لە دەستی کەوتنە خوارێ، شێتانە دڕی بەو حەشاماتە داو خۆی بە یەکە یەکەی ژن‌و کچەکاندا دەداو تا گەیشتە کنت، وەی لە هەواداری‌و وەی لە جەزبەی دڵ کە شەرم‌و حەیا ناهێڵێ، لە بەرهەیوان‌و لەسەر لبادەکی پاك بالیفێکی خستە ژێرت، پڕ بە حەزی دڵی لە چاوانتی

روانی، هەر وەختێك سەیرت بکا، سەیرکردن و نیگای شیرینی ئەو بن هەیوانەت دێتەوە یاد، خۆر هێدی هێدی بارگەو بنەی خۆی دەپێچایەوە، مانگ بە شەرمەوە، بە دزی خۆرەوە هەڵدەکشا تاقی ئاسمانیٚ، هەواش تا دەهات فێنکی دەکردو بۆنی ژن و کچانی حەوشەو بن هەیوانیٚ کاس و وڕو گێژیان دەکردی، هەنووکەش لە بەرچاوتە ئارەقەی لاملی و سوورە سووری هەردوو کوڵمان، سەرت هەڵبڕی و لە هەمووان رادەمایت، لەو زیاتر چ کچ و ژنێکت، بە چاوی دڵان، نەدەبینی، لە قولابی سەر کۆترۆکەو خةزصمي کەپووی رادەمای، چ عاجباتی بوو.. هەر دەڵێی هەنووکەیە.. بە سەر سەری هەمینەوە، دوور دوور لە تاقی ئاسمانیٚ ئەستێرەیەکی گەشت دەبینی، لەگەڵ هەردوو چاوانی هەمینیٚ بوون بە سیٚ ئەستێرە.. بە چوار.. بە دە.. سەد.. هەزار.. ئەو شەوە چ ئەستێرە بارانێك بوو، مانگە شەوێکی دڵڕفێن، بۆنی گژوگیا و گوڵە حاجیلەو هەلاڵەو بەیبوون وەختیٚ تێکەڵ بە بۆنی زۆر شیرینی ئارەقەی لەشی کیژان دەبوون، وەی لەو مەست بوون و حەیرانە، منالان وەك پشیلە بەسەر قاڵدرمەکاندا هەڵگەڕان و گەیشتنە سەربان، دەستەکان لە کەوگیر بادان شل بوون، دەوری مەنجەڵی رەش داگەڕاوی سەر سیٚ کوچکەکان چۆڵ بوون و دەوری تۆش قەڵەبالغتر، ریزێك لەو کیژانەی کە لەگەڵ دەنگی دەهۆڵ و زورنای دەرەوە هەڵدەپەڕین دەستیان بەرداو بلاوەیان لیٚ کرد، ئەڵقاو ئەڵق چوار دەوریان گرتیت، تافتەو هیزارو هەوری و چارۆگە شێواو، دەهاتنە پێشتر یەمەنی سوورو.. کراسی دارکەژۆك لەبەر، لێت دەهاتنە پێش گەردن کێلان، پاژنە

خڕان، پەرچەم سووری بە خەنەو.. زەندو باسك بزر لە ژێر بازنان، ورد دەبوویتەوە لە مەرجان و کرمۆکەی بەرملان، لە سینەی بەستراو بە سنجاق ئەو وەختەی شل دەبێ و دەکەوێ، دەرزی بەرسێرێ کە دەترازێ، باسکێکی پڕ لە بازن و دەست و پەنجەی پڕ لە ئەنگوستیلەی نقێمدار، کۆتکە دۆیەکی خستە بەردەمت، سەرت هەڵنەبڕی، بە تەنها لەو دەستانە رادەمای، لە کۆتکی دۆ.. ماستاو.. چا لەسەر چا.. خەنی لە خۆت.. بێ شەرم بە چوار دەورتا وەك پەروانەی دەوری شەمع دەفڕین و دەسووڕانەوە، پۆل و ئاپوورەی ژنان و کچان شەرمێ لە پیاوێکی تەنیا ناکەن، حەزت دەکرد هەر هەموو کوڕو کاڵی گوندی بانگ بکەیتە ژێر ئەو هەیوانەو وەك تۆ لە بەژنی باریك و چاو رەشان رابمێنن.. لە نازی نازدار حەیرانان، هەڵمژن بۆنی ئارەقەی سینگ و مەمکان، بۆنی هەوەس بزوێنی بن باڵی ژنە پان و پۆڕەکان، بۆنی قەرەنفول و هێل کە تێکەڵ دەبنەوە بە گەردانەی وا لە گەردنێ، بێن و نەك بە دوو چاوان، بەڵکو بە هەزار چاوان ورد ببنەوە لەو هەموو مەمکە بەندکراوەی ژێرکراس و سوخمەو مەمکدانان، لە خاڵی پڕ لە جوانی و فەرامۆش کەوتووی لا لێوان، لەنجەو لاری گەڵی دەستە خوشکان کە بە شەرمەوە خۆ دەلەنگێنن بۆ شایی و هەڵپەڕکێیان، پەڕەی خەزێم کە بریندار دەکا پەڕەی ناسکی کەپووان.. و تکە خوێنێکی ئاڵ دەڕژێتە سەر گۆشەی لێو، شنانەوەی لیفکی هیزارو شەدەی ئاغاژنان، رێ رۆیشتنی بە ویقاریان، کەزی تەڕو تۆزاوی، ناسکەیی روومەتان، وردە خوساران، گوڵینگەی هیزاران، چاو هەڵنەهاتن لەبەر وردە

پەرچـەم‌و شابسـکان، ئەوسـا تـۆش تۆغیانـت بـوو، چـووکەلەت هەمەوەنـدی‌و سمێڵـت کامـەڕی بـوو، ئەوەنـدەی کـە سەرمەسـتی جوانی بوویت، دە ئەوەندە لـە خـەمی کوڕگـەلی دەرەوەی ڕەشماڵ‌و دەوارەکـان بوویـت، دەتزانـی هەنووکـە لەوێنـدەرێ نـاو لـەپی گڕگرتوویان بە شەونمی گیاو گوڵان تەڕ دەکەن‌و بە چاوی پڕ لە شـەهوەتەوە لـە تریفـەی مـانگ‌و جریـوە جریـوی ئەسـتێران رادەمێنن، لە خەفەت‌و قەهران.. خەفەتی دووری نازداران جگـەرە بـە جگـەرە دادەگیرسـێنن، حـەزت دەکـرد هـەر هـەمووان داوەت بکەیتە ماڵی ئاغاو هەریەکەو دەستەگوڵی خۆی بێنـێ‌و دڵخوازی خۆی هەڵبـژێرێ، حـەزت دەکرد.. حـەزت دەکرد.. حـەزیان دەکـرد دیواری دیوەخانەو باڵەخانەی دوو نهۆمی ئاغا بڕمـێ تا دەرکەون بەژن زرافان، گوێ بە گواران، بسك لوول‌و باخـەڵ شـۆڕان، کـەپوو قنج‌و لێو تـەقیوو چـەناگە کوتراوان، تـا رامێنن لـەو مەمکانـەی لـە ژێرك کراسی مەخمەری‌و سوخمەی تـەنگ هـەڵیان هێنـاوە ژەنـگ‌و ژار، لەو کوڵمانەی هـەر دەڵـێی شـەمامەی حـەوت رەنگین، بـەڵام چ دەکەی کە شەختەی پایزێ لێی دابن، تا دەرکەون پڵپڵەو حەمایل و تۆقـان، تەلسـمان، زێـڕان.. زەنجـەقان.. ئاوزەنگیـان.. کرمـەك دەگەڵ بەندی پیرە گواران.

لەوێ، لە دیوەخانێ (کەریم مەیتەر) حەجمانی لەبەر بڕابوو:

(گەورەم.. دەترسێم بایز بە تەنێ شەرمێ بکاتن!)

ئاغا لێی خوڕیوەتەوە:

(بەراز.. تازە زاوای.. کەی دادەسەکنێی!)

ئاوڕی لە هۆمەر داوەتەوەو پرسیویەتی:

(هۆمەر، بایز حاڵی کووە؟)

هۆمەر بە قەهرو بەغالەتی پیرە پیاوێکەوە گووتویەتی:

(وەڵڵاهی گەورەم.. سەد سوێند دەخۆی دڕکی ناو گوڵانە، ئەو کافرە نەخنکێ باشە!)

کە ئاغا بە قریوەیەك دیوەخانی گڕ داوە، هەر هەمووان تریقا بوونـەوە، کـە ئـەو وەسـتاوەو رووی گـرژ کـردووە، هـەر هـەمووان ئان‌و سات ئەبڵەق بوون، ئاغا رووی کردۆتە کەریم:

(گوێ بگرە بۆرەپیاو.. تـەیارو ئامـادە بـە، شـەوی نێرانـە، هـەر تۆزێکی دیکەیەو بووکت دەخەینە پاڵ، مەیتـەری خەسـیوم نـاوێ، ئەوەندەی بڵێن یەك‌و دوو، با چایەکی شیرینم لۆ تێکەن، نامەوێ شەکرەکەی بتاوێتەوە، دەعەمەڵی بینەو وەرە دەرێ)

کەریم مەیتەر شپرزەو شەڵاڵی ئارەقە وتبووی:

(هەندی بڵێی یەك‌و دوو.. چایەکت فڕناکەی.. دێمە دەرێ!)

هـەر هـەموو پێکـەنی بـوون، زاری بـێ ددانـی پیرەمێردەکـان وەدەر کەوتوون، ئاغا هەڵیداوەتێ:

(ئاخر نەکەی حەیامان ببەی، عەشیرەتی "شێخ بزێنیان"م پـێ خۆش بکەی، سمایلی قاوەچیم لەسەر چ ترۆ کرد؟)

تۆ بێ ئاگا بووی لـە ئاغـاو پیاوماقووڵانی دیوەخـان‌و شـەڕە دەنووکیـان لـە بـەردەمتا روونیشـتن.. بـە دەسـرۆکەی دەسـتیان ئارەقـەی بـەرمل‌و تـەوێڵیان دەسـڕی، بـۆنی مێینـە سەرمەسـتی کـردی، کوڕگـەلیش لـە بـن رەشمـاڵان تـا نـاو هـەناو دووکـەڵیان هەڵدەمـژی، سمێڵیـان دەکرۆشـت، پێیـان لـە زەوی دەکوتـا، نینۆکیان دەقرتاند، بە غەزەبەوە کرەی ددانیان دەهات، تەزبێحیان

هەڵدەگلۆفی، تفیان پێ قوت نەدەدرایەوە، ناو زار تفت و تاڵ، بە حەیزەران و دار و گۆپاڵ لە بەردەکانی بەر پێی خۆیان هەڵدەدا، بە نووکە شەق، لە ناو هەمووانادا تەنها تۆ بەختەوەر بوویت، ژنان و کچانی گوند بانگیان کردی، ژنانی ئاغا خۆیان، درەنگ شەرمت رەوییەوە، لا جانگ و بن سمێڵ و برپڕەی پشتت ئارەقەیەکی ساردیان دەردا، یا خودا بە خێر بێی.. هەر سێ ژنی ئاغا، فاتمە خان و سافی و خاحەبێ بەرەو پیرت هاتن، بە هەرسێکیان دەتووت دیوارێکی تۆکمەو بڵندن، بۆنی سمڵ و مێخەك هەزار کانیاوی زەوقیان لە دڵدا دەتەقاندەوە، وەی لە تێکەڵی ترس و شەرم و خۆشی و جوانی، مێرووله و تەزووی شیرینیان پێ دای، ورشەی کراس و کەوا، خشەخشی کەوش و سۆلی عەجەمی، باق و بریقی کراسی کودەری، باخەڵی دوو قەدو سێ قەد، بە دزییەوە سەرێکت هەڵبڕی، سەد حەیرانت کرد بە قوربانی یەك گوڵینگەی ئەو نازدارانە، خرینگەی بازن، هیزار لارو هەوری سوور، بریسکەی دەرزیلەو کەمەربەندان، شەپۆڵدانەوەی پرشنگی گەردانەو دوگمەو پاوانەو لاسەرە.. هەموو شتێك لەو حەوشەدا.. لەو هەیوانەدا.. لەو شەوەدا دەبریقایەوە..

(کچم هەمین.. دوو بالیفان بخە بەر پشتی بایزی..)

ئەوەندەی بڵێی یەك و دوو بەخۆو بە دوو بالیفی پڕ لە پەڕی مریشك هاتەوە، ژنان رێیان بۆ خۆش نەدەکرد، ئەویش بە مەکرو نازو ماناوە نوقرچەی لە لاڕان و سمتی یەك دووانێکیان گیر کرد.. وەیش.. دەستت بشکێ.. بایز، بەو سووکە سوعبەتەی هەمین، خەریك بوو ببوورێتەوە.. شاژنانە رێی دەکرد، دەلەنگێیەوە، بە

ئەنقەست خۆی بادەدا.. بەسەری پەنجە ڕێی دەکرد، شەنگەبی بوو لە گوێ چەمێکدا دەلەرییەوە، بە دەم نازو عیشوەو خەندەوە هەردوو سەرینەکەی خستە بەرپشتت، هەنووکەش بە خۆشی ئەو بۆن و بەرامەی پەرچەم و زولفانی ئەو عەیامە دوورو دێرینە دەژی، ئەو وەختەی بەسەرتدا نووشتایەوەو کەزی و قەفی بسکەکانی دایان لە تەوێڵی گەرمت، ئەو دەنگە بوو کە هەمیشەو تا هەنووکەش کە چاوەڕێی هاتنەوەی دەکەیت.. لە گوێتدا دەزرنگێتەوە:

(بەخێر هاتی بایز..!)

ئەو دەنگە بوو کە قەهرو ترس و شەرم و خەمی لێ دەڕژا، وەلێ جوان و.. پڕ گوێ.. ناسك.. پڕ لە زرنگانەوەی موحیبەت، دڵگیر وەك قوڵەقوڵی ئاوی کانیەکی تازە تەقیو، دەنگێك لە شکانی ئاوێنەو.. مینا پڕ خورپەتر، لە خرمەی باران خۆشتر، هەناسەو ئاهی نیوە شەوی کچانی وەك هەنجیر گەییو، ئەو هەنجیرە گەییوەی گەر دوای ڕۆژێك نەخورێ، بۆگەن بکات.. بترشێ.. بکەوێتە ناو خۆڵ و سەر خاکێکی رووتەنی، نیگایەکی کورت و کارمامزی، کارمامزێك کە ترسی راوچی‌یەك لە دڵیا بنیشێ و بەری نەدات، قەف و لوولی بسك و کەزی‌یەکانی شوورەو سێبەریان بۆ کردی، بۆ تەنها یەك سات، بە دزی ئەو هەموو کچ و ژنانەوە، لە چاوانی رامایت، بە پەلە خۆت تیا شۆری، خۆت تیا نوقم کردو هاتیتە دەرێ، دوو چاوی رەشی پڕ لە جریوەو چریسکە، دەك ماڵی چاوانتم بە قوڕ گرت، تا ئەبەد کل و کلچوکی ناوێ، وەی لەو مایینە کێوی‌یەی مەیتەری عگیدی دەوێ، مانگی

دووره دەستەو ئەمن بە تریفەکەی شادو شوکرم، قەت بووە.. نا..
گوناهە سەپانێکی کلاش دڕاو لەو چاوانە رامێنم، ئۆو.. هۆ.. ئەو
لە کویێو من لە کویێ؟ بێ سۆنگە نییە ئاغاکان مرخیان لیێ خۆش
کردووە، لیکی بۆ دەڕێژن، کوڕگەل لە دوورەوە بۆی دەسووتێن،
هۆ هەمینی شەدەلار.. ئاخر ئەتوو لۆ خۆت حەیرانیت.. لاوکێکی
گەلەك شیرینیت.. هێی هەمینی بەژن زراف.. ئەتوو بە دەستی
خۆت بالیفان دەخەیتە بەرپشتی بایزی..؟ جا ئەمشەو چۆن
بنویێ؟ دەبا تا سپێدە گۆرانیو بەستەو حەیرانو لاوكو بەندان
بچڕیێ، تا بەندی دلان دەپچڕیێ، هەر ئەویێ شەویێ بوو کە دارو
بەردت خستە سە هەلەکە سەما، گژوگیاو حاجیلەو هەلالەو
بەیبوونو گولالە سوورە، درەختەکان، نەك دلی دەستە پیاوو
کوڕگەلی گوندی، بەلکو دلی پیرمێردەکانیش وەك پشکۆی ژێر
خۆلەمێش گەش دەبوونەوە، دەنگت بوو بە (با)و.. خۆلەمێشی
سەر پشکۆکانی بە با دەکرد، وەختەبوو ژنان بەر باوێنو لە
حەژمەتانا منالیان لەبار بچێ، بەرەبەیان کچان بە دەم خەوەوە بۆ
شوو.. بۆ پیاوی سمێل بابڕ، بە دزییەوە، هۆن هۆن دەگریان، تا
دەنگیان دەرنەیەت چارۆگەو رەفتەی بەرملیان دەئاخنییە نێو
زاریان، کوڕگەل حەیاو هەیبەتیان نەماو رۆژی دوای
زەماوەندەکەی (کەریم مەیتەر) چوونە سەر ئەو گردەی
دەیڕوانییە چەمی چەقەلان.. دە دوانزەکیان چووبوونە گژ ماکەرە
بەرەللاکانی ئەو دەشتو دەرە، ئەویێ شەویێ مانگ دابەزیو
لەسەر رەشمالەکانو مالی ئاغاو دواییش لەوپەڕی گوندی
خەرمانەی دا، ئەویێ شەویێ کچانی تازە بالق بوو پتر مەمکیان

دەڕسکا، لە تاو چریکەت هەواو هەوەسێك کەللەیانی دەتاساند، بووی بە شالوورو دەنگت هەڵبڕی.. دەردی دڵی هەمووانت خڕ کردەوەو حەیرانت چڕی...

***ئا.. ئا.. ئا.. ئا.. ئای..***

***حەیران.. ئەورۆ ئێوارێ نادری..***

***گەلەك بە من نادری***

***چاوەکەم دەڵێم نادری.. بە من گەلەك نادری***

***لە چاوان بازی.. لە ئەبرۆیان سەقەری***

***ئەی ئامانو سەد ئامان..***

***لە وردە رۆینی دەڵێی کۆتری***

هەنووکەش زۆر شەوان فێڵی لێ دەکەی.. بە بەندێك دەست پێ دەکەی، لە ناکاو دەیبڕیو دەچیتەوە سەر ئەو بەندەی کە بە (هەمین)دا هەڵبڵێی، هەرجارەو بە رۆحو سەدایەکی دیکەوە دەیچڕی..

***ئەوجا دەرێم حەیران.. حەیرانە..***

***حەیران هەمینە***

***گەردنی زەردە.. مەمکی هەنگوینە..***

***روومەتی گوڵەو سینگی سپینە***

***ئەمن سوێندەکی دەخۆم بە (سوڵتان عەولای عارەبی)***

***بە حوسێنی غازیە..***

***پاش ئەو غەدار بابەی چ دۆستان ناگرم..***

***چ یارم نینە..***

ئەو تەریق دەبێتەوەو پێت دەبڕێ.. هەنووکەش ترسو یادو

حـــەزو لـــەزەتی پـــڕ نهێنـــی نیـــوە شـــەوانت لـــە حەیرانێکـــدا دەتوێنیتـەوە، وەك تـازە کانیـیـەکی روون‌و شـێلوو لـە بـن کەرتـە شاخێکەوە بتەقێ‌و.. پاشان تافەتاف وەك رووباری بە تەوژم‌و تـاو هەردو وەرد ببڕێ، هـەموو شـتێك بشـواتەوە.. ژەنگـی قـورگ.. هـەر دڵێك.. هەر رۆحێکی وشکەوەبوو تەڕ بکاتـەوە، سـەپان‌و جوتیـارو شوان‌و گاوان‌و مسکێن‌و کیشەکەرەکان بۆ تاوێك هیلاکـی عـومری بـە هەدەرچـوویان وەبیر دێتـەوەو لـە شـەوێکی وا کورتـدا بیریـان دەچێتەوە، وەك ئەو خێڵەی دەنێو هەزار پرسەو کۆسـت‌و نسـکۆدا بە تەنها شایی‌یەك ببینن، شایی ئەو شەوەو بەس، بە هـەڵی بـزانن، بە زۆری بزانن بە دەم سەداو چریکەی حەیرانەوە بـۆ خۆشـی‌یەکی کـورت‌و دزراو بگـرین، ئـەرێ ئـەو ژنانـە هـەر ئەوانـەن کـە بـە رۆژ مەشـکە دەژەنـن، لـە هـەرێزو پـەرێزان شـەقی‌و مانـدوو دەبـن، بـەرامپیل دەکەنـە ملیـان‌و ریخـی مانگـاو تەرسـەقول‌و قشـپلان بـۆ زستان خڕ دەکەنەوە، چیلکەو دار، لە هاوینی گەرمەسێردا هـەتاو دەیانبا و لا رووم‌ەتیان دەسووتێنێ، هەر دەڵێی ئەوانە نین کـە لـە پرسـەو ماتەمینـدا قـژ دەرِننـەوەو سـینە دەکـوتن‌و رەش لەبـەر دەکەن، هەر ئەوێ شەوێ بوو کە ئەو هەموو دلانە، لە هی هەمووان زووتـر هـی هـەمینێ بـەو نەغمـە کـەرخ‌و غەمگینـەت توانـەوە، تلانـەوە.. تـاوێ نـزم‌و تـاوێ بـەرز.. دەتـووت نـەوای حوزنێکـە ئەبـەدی.. چـریکەی سـەرو بـن گـرێ دراو، بـە خـەیاڵ دەیبردنـەوە جـێ‌ی ژوان، بـە زۆر وەدەرنـانی قـەهرو ئـێش‌و ئـازار، وەی لـە جەربـەزەی هـۆزو عـێلان، غـەدرو غـدووری ئاغـا و بەگلـەران، نێوچەوانی گرژی باوکە هـەرە تووڕەو تڕۆکـان، دڵـی بـەردینی بـرا

بەدکارەکان، نا.. هێدی هێدی حەیران دەیبردنەوە نێو ئەشکەوت و کەندو لەندان، دەڕۆیشت و دەگەیشتەوە گوێ و دڵی ئەو کچۆڵانەی وان لە گوندەکانی دیکەو بە تەنیا باڵی لەسەر جێ و بالینگانی سارد کەلەکە دەگۆڕن، هەلاوی هاتوو لە ناو هەناوەوە، وەختەبوو پووش و پەلاشی ئەو دەشتە تێکڕا بسووتێن، وای لە ئاهی گەرم و هەناسەی سارد، سەربادان و چاوداگرتن، بزەو ڕۆندکی تێکەڵ، ئەوێ شەوێ سەگە بەڕەڵلاکانیش وەرکەوتن، ئەسپ لە حیلەو نێرەکەر لە زەڕین کەوتن، گوڵە گەنجەکان ورد ورد بالایان دەکرد، ئەستێران بە ئاسمانەوە دەیانجریواند، تۆ حەکایەتی مەرگ و کوشتن و دەست لە یەك بەردان و حەسرەت و دەردو نامرادیت بەو ناوەدا پەرت دەکرد، ڕۆژانی سندم و بە کۆیلەبوون، پشت ڕاست نەکردنەوە تا ئێوارێ، بۆنی سووتانی نانی سەر سێڵ لە وەختی خەیاڵ و تاس بردنەوە، ئەوێ شەوێ گەلێکیان دەستیان خستە پەنا گوێ و تێیان دەچریکاند، وەك پۆلە مەلێکی خنکاو لە ناو دووکەڵدا، تریفەی زیوینی مانگ لە ڕووخساری هیلاکی دەدان و نەیاندەبڕییەوە، بەلام بەو سەداو چریکەو ئای ئایە چوونەوە ناو قاوغی خۆیان، ئەوێ شەوێ چ زوو داخ و خەفەت و ئەرك و ئێش و ئازارو حەزو ئاوات و خەون و حەژمەتی هەمووانت لە بەندێکدا تواندەوە، وەی لەو نووزەو ناڵینە، ئەوێ شەوێ سەرت هەڵبڕی و چاوت بەو هەموو بالاکوڵ و کەڵەگەتانە کەوت کە ببوون بە شوورەی دەورت، پۆلێك بە پێوەو پۆلێك لەسەر چیچکان روونیشتبوون، بێ ئاگا لە سڕبوونی پاژنەو بنی پێیان، سێ ریزو.. چوار ریز.. شەوی خۆت بوو، سەرقافڵەچی.. لە پێشی

پێشەوە هەمین هەڵتروشکابوو، ئەوێ شەوێ ئەتوو حەیرانت نەدەچڕی، هەر خۆت حەیرانێك بووی لە گۆشت و خوێن و.. ئاەو.. حەسرەت.. هەر خۆت حەیرانێکی خوێن لێ تکاوبووی، شێتانەو مەستانە بۆی هەستای، پاشان.. خاوو نەرم دادەبەزیت، هەمین لەو سێوە خڕەی بەرملت ورد دەبۆوە کە لەرەلەری نەغمەو سەدای چریکەت گەمەی پێ دەکرد، شەپۆلی دەنگت دەیشۆرییەوە..

***ئەرێ دەرێم سێبەری سەفینی بەسەر ماڵە دیانانـدا دەڕۆیی..***

چی دەنگ و سرتەی زی ڕۆح لەو دەشت و ئاقارە هەبوون کپ و خامۆش بوون.. وەی لە فڕکەی باڵی سەدان قولینگ و قاز، شەپۆلێکی سەرمەستە: سەداکەت، بێ ئوقرەیەو رووەو تریفەی مانگ سینە هەڵداوێ، کانی تەقیو، بە قووڵەقووڵ، تاڤگەی قەد پاڵان و کچانی گوندی بە رووتی مەلەی لەبەردا بکەن، سێبەرت خستە سەر روومەتی سووره گوڵان.. کوڵمە قەندان.. نەبا بسووتێنی لە بەر گەزەنگی خۆرە تاوان.. لە پێچ و لوولی حەیرانەکاندا شەرمی کچانت دەشاردەوە، هەوەسی پەنهانی ژنان، وەبزەت هێنان.. چ هیلاکە خەندەی سەرلێوە قەڵشتییەکان، لە تاو بۆنی هەمینی هیزار لار نرکەنرك دەتنالاند، لەو ناڵین و ئاخەدا راوچی و مامزی کوژراوت دەهاتنە بەرچاو.. رازو نیازی سەر ناعوورو ناو کادینان، ژوانی پەنا دیوارو سەربان و ناو هەوێزان، تەویلەو گەوەڕان، پۆل پۆل مەلی بەهەشتی بە ئاراستەی (با)و سەدای چریکەت لەو ئاقارە نزیك بوونەوە، نیشتنەوە.. نەك کچە جحێڵەکان، پیرەژنە ددان کەوتووەکانیش شەرمیان لە روو

نەدەما و خۆیان با دەداو دەلەنگینەوە، لەزەتی پەنهان و رازی شاراوەی سالانێکی زوویان لێ تەڕ دەبۆوە، قەهری رۆژانێکی ناشیرینیان وەیاد دەهاتەوە، ئەو وەختەی بە زۆردارەکی.. بە زەبری خەنجەرو بالیف خستنە سەر دەم و گۆپاڵ لێ بادان بە شوو دران، کۆنە برینەکان دەتلانەوە، ئەو پیرەژنانە بەبێ برین خوێنیان لێ دەتکا..

***حەیران.. حەیرانە.. حەیرانی لێ دێ.. گەردنی زەردە و مەرجانی لێ دێ..***

خوێنێکی بێ رەنگ و بۆن.. بڕژێ و وەك لافاو لە دڵدا، لە رۆحدا.. لە چاودا سەر بکا.. ئەوە سەری چەند ساڵانە نەخۆش و بریندارین و... بە خۆمان نەزانیوە...

***نەخۆشەکی گەلە گرانم..***

***کەتیمە نوێنێ..***

***دەنگۆ جەوابەکی بنێرن بە شەوبای نیوە شەوێ..***

***بە (با)یە شەماری..***

***بە پلکە پێناوێ..***

***دەبا بەژنێ باریك دەمەکم بێتە سەرینێ...***

پیرەمێردەکانی ژێر رەشماڵان و دیوەخانێ ملیان بۆ درێژ کردبوو، بۆ ئەو چریکەو ناڵینە هەموو ئازای جەستەیان گوێ بوو، لەگەڵ هەر ئاهێك خورپەیەك دەکەوتە دڵ، خوێن دەجما و.. دوو تنۆك فرمێسك بەری چاوانی دەگرت، هەمین قەستی دەکرد بێتە ناو کۆشت، پڕ بە هەردوو چاوان لێت رادەما، بەو دەنگە سووتاوەت پتر گڕت لە دڵی بەردا، تاڵ تاڵ پەرچەمی وەزریکە

کەوتن، دەیخواست بۆنت بکاو خەنی بێ، تك تك ئارەقە لە تەویڵو لاجانگو چەناگەت دەتکان، دەتکانو دەڕژانە سەر سینەی تووکنت، ئانو سات دەستەسڕێکی زەردی بۆ راگرتی، لێت وەرگرتو ئارەقەت پێ سڕییەوە، دەستەسڕ بۆنی سینگو مەمکی و مێخەك بەندی هەمینێیان گرتبوو، سەرمەستو کاستر بووی، تەواو.. بە تەواوی زانیت سەرتۆپی کیژانی گوندی شەیداو عەودالتە، تەواو.. بە تەواوی ژنانو کچان دەستیان لە هەموو کارو ئیشێك سارد بۆوە، چش لە سووتانی شیو بە مەنجەڵەوە، چش لە برسیەتی منالانو تۆلازانو پیاوان، منالان کە بینیان پیاوەکان سڕو بێ دەنگ سەر بادەدەن، لە شەرمانا لەسەر چیچکان هەڵتروشکان، لەسەر بارەدارو سەربانو دیوارو قالدرمەکان، هەندێ لە کچانو ژنان کەلالا لە ژوورەکان کەوتبوونو بیریان لە رووخانی کۆلیتو کەلاوەو ماڵەکان دەکردەوە.....

***دەرێن کوڕەتیم حەیران گەلە نەخۆشە***

***دەبا دەمەکی بچینە سەرینێ***

***دەبا لەباتی یاسینو تەلقینێ***

***لە بۆی بگێڕن گەرمە شینێ***

وەختێ بایز دەگەیشتە دوا بەندی حەیرانەکەی.. (تائهوو.. تائهوو..) لە دە لاوە بەرز دەبۆوە، هەمینیش وەك گوڵە هێرۆ شنەبای حەیران بە راستو چەپدا سەمای پێ دەکردو دەیلەنگاند، کەس لە ناو دڵی هۆمەری سەرکاردا نەبوو، حەزی دەکرد ئاغا پتر هەوەسی ببزوێو.. ئەمڕۆ نا بەیانی داوای دەستی هەمینێی لێ بکات، وای لەوێ رۆژێ کە دەبێ بە خەزووری ئاغاو

پیاوی ناو پیاوان، نزم نزم بە دەم چریکەوە دەهاتیتەوە، ئەوێ شەوێ بوو شلکە پێکەنینی هەمین وەك دەنگی قازو قوڵنگان لە گەرووی دەهاتە دەرێو لە گەردنی خۆشخوانی بڵاو دەبۆوە.. تاوێكو بۆی هەستایەتەوە.....

***ئەوجا دەرێم لەبەر رەشی زولفانت بمرم..***
***کە ئەگەر وەکی رەشەماران فرێیان دەدەیتەوە سەرشانی***
***لەبەر قۆرتی چەناگەت بمرم کە لێی راوەستایە..***
***خوناو دەگەڵ ئاونگی..***
***ماچکردن هەینێ خۆشە لە ناو چیغو رەشماڵی..***

پڕ بە چاوان.. بێ شەرمو حەیا لە بەرملی سپیو ئارەقاوی.. دەمو لێوی تەنگی.. قەدو قامەتی شیرینی رامای.. چ ناسكو شیرین سەرو هیزاری بەستووە..

***شەرتبێ نەهێڵم بای شەماڵ بچێتەوە نێو سینەو مەمکان***
***تا خۆم لێی نەبمەوە بە میوانی...***
***وای لە وردە پەرچەمان...***
***لە ئارەقەی بەینی ئەبرۆیان.. تەڕ بووینە***
***ئەرێ لۆچی گەلە خۆشە ئەو کاولە دونیایە***
***چونکە شلو ملو ناسك بەدەنی تێدایە***
***دەبا کوڵمت لە بۆ من بمێنێ بە شەمامەی حەوت ڕەنگی***

تێت دەچریکاند...

***ئەورۆ بەوێ سباینێ چەندی گاز دەکەم***
***گوندێ مە لە من ئەوبەر.. ئەوبەرە***
***چاوی حەیرانەکەی من گەلە رەشە***

---

*دوو ئەبرۆی لەسەرە*
*حەزلێکردنی منو بە ژنێ باریک*
*ئەوسار بوهارێ گەلە خۆشە*
*بەڵان لە جاحێڵی گوندێ مە هەر داخو کەسەرە*

ئـالاّو والاّ تـا دەهـات پـتر لێـت دەهاتـە پـێش، بـە دەم خاوبوونـەوەی دوا بەنـدی حەیرانەکـە سـەری کێلـت نـەوی کـرد، هەردوو پێی لەسەر کەچەلبادێك لە بەردەمتا کەوتبوون، چاوت بە قاچو قوولی کەوت، دەرپێ سیمدارەکەی کەمێ هەڵکشا بوو، دەرکەوتبوو سپیەتی خوار بەلەکو ئێسقانی ناسکی گۆزینگی، تەزوویەکی شیرین بە نێو دەمارەکانتا مێروولەی کرد، بە پەلە چاوانت هەڵبڕی، هەمینت بینی لەگەڵ ئەو دەنگو ناڵینە، لە ئاهی تۆ بە یەکجاری رۆحی بوو بە مەلێکی سپی ئەوینو لە شەققەی باڵی دا، لە نێو قەفەزی تەنگی سینەی ورشە ورش باڵی لێك دەدا، خۆی بێ پەڕو باڵ دەبینی‌یەوە، سۆزی عیشقێکی بێ ئامان دەیخستە سەر کەڵکەڵەی گریان، ئەسپی حەزێك هەڵیگرت، ئەمجارەیان بایز بە تەنیا بۆ هەمینێ حەیرانەکەی دەچڕی...

وات هەست دەکرد جگە لە خۆتو هەمین کەس لەو گوندەدا نەماوە.. نە دیوەخان.. نە ماڵی ئاغا.. نە ژێر رەشماڵان.. نە ناو ماڵەکانو نە سەربانەکان.. کەس.. کەسی تیا نەماوە..

*ئەوجا دەرێم براینە برادەرینە..*
*دیسان ئەورۆکە بەوێ سبایێ*
*گاز دەکەم.. گەلە گەلە بریندارم*
*دەرێم: برینم کەوتۆتە بەدەنێ*

---

ئەنگۆ بڕۆنە دووی وان حەکیمان
ئەوان لوقمانان.. ساڵحۆکی عەلی عەجەمێ
دەبا بێتەوە سەرینم..
بە چاوانم بڕۆنتە برینێ
بە دەستانم دەست لێ نەدا
ئەمان.. ئێوارە گەلە درەنگە
لە بۆ خاترێ دڵێ هەمینێ.. بابان وێرانێ
بە زار بکا تەخمینێ
ئەوجا کیژ دەرێ: دایە.. برینێ کوڕەتیمە حەیرانێ گەلە
گەلە.. ناسکە
ئەمن نایدەمە دەست..
ئەوان حەکیمان.. ئەوان لوقمانان
هەر دەستم.. بە خۆم دەگرمەوە قۆدیەکا مەرهەمێ
ئەوا دەرێم: بە هێلێ.. بە زەوزێ
بە ئاوی قەنەفرێ..
بە ژەنگی گوارێ..
بە چلکی خەزیمێ
بە تۆزی هیزارێ
بە ئارەقەی زەرد مەمکان
دەیگرمەوە لە قۆدیلکە، قۆدیلکەی مەرجانێ
وەکی داوێمە سەر برینێ کوڕەتیمە حەیرانێ
ئەوا دەیپێچمەوە بە لیفکەی هیزارێ
دەرێ شەو بایێ پایزان گەلە ساردە

ـــــــــــ

## نەکو برینێ کورەتیمە حەیرانێ
## بگرێ زوقمێ.. لەگەڵ هەرامەو تەشەنێ..

چ بێ مروەتانە (کەریم)ی مەیتەر، خۆی، ئاخۆی بە حەوشێدا کردو چریکەتی پچڕاند، سەدای گەرمی لە قورگتا تاساند، نووشتایەوەو بە چرپەوە تێی گەیاندی.. ئاغا سەغڵەتە.. دەفەرموێ با بەس بێ.. پشتی کێل کردەوە.. ژنینە ئاغا دەفەرموێ: (ئیدی درەنگەو بەشی خۆمان لێی دەوێ.. پیاوانی دیوەخانێ هەر هەموو لەسەر ئاوو ئاگرن.. خەسرەو بەگیش میوانە).. ژنان کەوتنە بڵمە بڵمو منجە منج.. ناڕەزا بوون.. جا چی بکەین..؟ تەواو.. چما پیاوان دەوێرن لە بەردەمیدا بکۆکن تا ژنان بوێرن بڵێن: نەء.. کچانی ژێر هەیوانێ، ناو حەوشێو ژوورەکان بە پرتاو لە دەوری ژنانی ئاغا گرد بوونەوە.. ژنینە حەیاتان بێ.. با دوو بەندان لەوێ برێو گازی دەکەینەوە، هەر تۆزێك لەمەوبەر سەدای چریکەی لەسەر نێرگزی چاوانیان وەك ئاونگ دەکەوت، قوڵپی خوێنێکی گەرمتری لە دڵان دەرژاند، چ زوو توانی خەمو خۆشی لە دڵی ژنە جوتیارو سەپانو پاڵەو شوانەکان، کچانی کیشەکەرو مەشکەژەنو بێریڤان تێکەڵ بکات، سەماو سووتان، کچان دوعایان لە کەریمی مەیتەر دەکرد، خودا بکەم ئەوشۆ ببەسترێو حەوت گرێی لێ بدرێو بە زاوا نەبێ، بۆ خاتری پیرو پیاوچاکان فەرزەندی خۆی لە باوەش نەگرێ، مانگی هەڵنیشتووی سەر گوێسوانەی ماڵی ئاغا تۆراو هەڵەتەی ئاسمانێکی دیکە بوو، منالان کەوتنەوە زرمە زلێ، پیرەکانی گوندی بوونەوە بەوانەی بێ ددانو چاوکزو دەست لەرزیون، ژنان

بوونـەوە بـە کـەیبانووی هـیلاك‌و کیشـەکەری نەسـرەوت، کچـان‌و کوڕانیش وەك جاران نامرادو خەمزەدەو دیدە پڕ حەسرەت، بایز بـۆوە بـە سـەپانێکی رووت‌و برسـی، ئـەویٚ شـەویٚ هـەمین تـا بەرەبـەیانێکی درەنـگ خـەو لـە چـاوانی تـۆرا، هـەروەك بڵـێی گرانەتای بیٚ ئارەقەی دەکردو دەنێو پێخەفی تەنیایی‌دا گینگڵی دەدا، ئەسـتێرەکانی دەژمـاردو لـە ژێـر لێوەوە دەگریـا، درەنگانـیٚ خـەوی لـیٚ کـەوت، ئیـدی لـەو رۆژەوە شـەرمی لـە روو تکـا، وەك ئاگری ناوپووش حەزو حەزکاری هەردووکتان بە گوندی‌دا ماڵەو ماڵ دەڕۆیشت، کچان زوو زانیان، لە هەر ئان‌و سەروەختێکدا، لە هـەر شـوێنێکدا حـەیران‌و لاوکـی بـایز بگەیشـتبایە گوێچـکەیان دەیـانزانی ئـەو نـاڵین‌و چریکەیە، ئـەو هـاوارە خوێنای‌یـە هـەر بـۆ هەمینیٚ‌یە، کچان، هەر هەموو، بەغیلیان پیٚ دەبرد، ئاخر خەریکە نـاوی هـەمینیٚ دەخزێتـە نـاو هـەموو حەیرانـەکان، چ خۆشـە بـە جوانی‌دا هـەڵگوتن، چش لـە حـەیاو حورمـەت، لـە غـەزەبی ئاغاو باوك‌و برایان، دەستەخوشکانی لە وەختـی ئاوهێنـان پـەلاریان تیٚ دەگـرت، بـە شـەرمی عاشـقێکەوە سـەری کـز دەکـرد، کچـان ئـەو نهێنی‌یەیان لە کن دایکانیان درکاند، خوشك لای خوشك، برا لای بـرا، چـرپە چـرپ هاتـە نـاو پێخـەفی ژن‌و مێردەکـان، کوڕگـەل ئۆقرەیان لە بەر بڕا، دواجار گەیشتەوە گویٚی ئاغا.. (بیٚ پرسی مـن؟، لـە سبەینیٚ زووتـر نی‌یـەو ئـەو کچـەتیمە تـەمبیٚ دەکـەم.. بایزیش ترۆ دەکەم...)

سەرت نەوی‌و.. بە دڵێکی کزەوە گەڕایتەوە دیوەخانیٚ، ئاغا بەقەهرەوە وتی:

---

(کافر، پیاوم نەناردبا تا بەیانی ناو ژنانت بەجێ نەدەهێشتو وازت لە گۆتنێ نەدەهینا)

(گەورەم دوابەندم بوو..)

(کەس لە باری نەچوو؟)

پیاوان بە شەرمەوە خەنینەوەو سەریان داگرت، ئاغا لەو پلارانە بێ شەرم بوو، ئەوێ شەوێ تا درەنگانێ، لە دیوەخانەکەشدا، بە قەهرەوە حەیرانت دەچری، زاواش چووە پەردەوە، تۆ هەر نەوێستای، دەتزانی چریکەت دەگاتە دڵی هەمینێ، چریکەی مەلێکی هێلانە ونبوو کە تاریکیو شەوبا ڕێی لێ وێڵ بکەن، ئیدی لەو شەوە بە دوا تۆ بۆ هەمین بوو ناڵینت، هەنووکەش کە بۆی دێیتە گۆتنێ، یەکەم حەیرانو یەکەم ترازاندنی سوخمەی مەمکانت وەبیر دێتەوە، یەکەم تەگبیری هەلاتنو یەکەمین شەوی گەرم بوونەوە لە باوەشی یەکدیدا، لە دوای سەدەها شەوی قەهرو دڵەڕاوکێو نەبوونیو ترسو گومان هەمین لە دارستانێکی نیوە سەوزو نیوە قەرەبرووت دەچێ، چەمێکی جێماو لە پاش هاژەهاژ، ئاگردانێکی ساردو ئافەرۆز دوای کۆچو کۆچباری دەوار نشینان، کراسێکی ئاودامان ڕەش، سەرو پرچی شێواو، دوو دەستی زبرو گەڕ بە سەرماو گەرما، بۆن گرتووی ریقنەو ریخو شیری خاو، پێو پلی چڵکنو هەمیشە قوڕاوی، خشەخشی دوو سۆلی لا هەڵتلیشاو، تەشکو تیریژو دامەن لە زەوی خشاو، چاوانی پڕ لە ترسو هەمیشە خەو تیاشکاو، چاوانێك غەریقی شەرم، شەرمی شەوی یەکەمی هەلاتنو ڕەدووکەوتن، دوو چاوی ئەوسا گەشو کراوە،

______

هەنووکەش زەبوون، وەلێ هێشتا هەر هەوەس بزوێنە، پیاوانی سمێڵ بابڕو شەهوەتبازو قەحپەباز زۆرن، مەستو ملهوڕ، ناوگەڵ برسی، هەر لە کۆنە ئاغاو بەگلەرو کوێخای لێ کەوتوو، قەسابو بەقاڵو عەتارو فیتەرو پینەدۆزو حەماڵو کوورەچیو گەنجانی تەوالێت لووسی شار، هێڵی باریکی دەوری دەمو لێوی، هەردوو چاوە پڕ لە خەمو حەژمەتەکانی، حەژمەتی شینو مۆر، لۆچی باریکیان تێ کەوتبوو، پرچی ماشو برنجی لە ژێر خەنەدا شاردبۆوە، بەو تەمەنەوە سوورایی کوڵمو لێوانی لەگەڵ کرێژدا شەر دەکا.. زوو زوو بیری دێنیتەوە:

(هەمین.. بابان وێران.. خەریکە هەردووکمان پیر دەبین)

ئەویش پێت دەڵێ:

(جا تازە زانیتت؟ عومرەکی وا پڕ ترس بەردیش پیر دەکاتن!)

تا دەهات گرمەی گەواڵە دەیخستیتەوە سەر حاڵی جان، تاریکی چڕ چڕ دەڕژایە ناو کۆڵانو حەوشەو هەردوو چاوانت، کەڵەشێرەکە لە ترسانا دەیقوقاند، چەخماخەی بروسک مریشکەکانی خستە سەر گارەگارو جووجەڵەکانیش لە ترسانا دەیانجروکاند، رەشۆڵەکانیش بە دەم قاژەقاژەوە هەراسانیان کردی، لەگەڵ تۆدا مانگاو کەرو مریشکەکانو جووجەڵەکانو ریشۆڵەکان، بگرە مارو مێرووی نێو کونو کەلەبەری کەلاوەکەشت دەترسان، نەتدەزانی خۆت بە چییەوە بغافڵێنی، هەرچیت دەکرد خەیاڵت هەر لە کن هەمینێ بوو.. خودایە بە سەلامەتی بمدەیتەوە، جارێکی دیکە لە گەنجینەکە نزیک بوویتەوە، بێ مەبەستو نیاز دەستت بۆ هەندێ شڕەو پڕە برد: بێژنگ،

جلەوێكی ژەنگدار، پۆستاڵێكی لا هەڵتلیشاو، شەرواڵێكی هەلا هەلا، كراسێكی پرزۆڵ پرزۆڵ، تەنەكەیەكی رۆنی (راعی) كە چەوری بنەكەی دەتووت قاوەی مەییوەو مێش و مەگەزێكی زۆری تیا خنكابوو، دوو فەردە كا، سێ تەنەكە جۆ، پانكەیەكی شكاو، ئاوێنەیەكی گەڕ، مەسینەیەكی قووپاو، تۆڕێكی دڕاو، سەرو لاشەی چەند ڕیشۆڵەیەكی مردوو، دەنووك شكاوو پەڕ هەڵوەریو، فانووسێكی بێ شووشەو تەل پچڕاو، كورتانێك و چوار پێنج ناڵی بێ كەڵك كەوتوو، كۆنە دەرپێیەكی خمداری هەمین، دوو كۆنە چۆپی پاسكیل، دەیەها لەو ئاسن و پاسنانەی كە هەمین بە دەم ڕێوە هەڵیانیدەگرتەوەو لە گەنجینەكە فڕێیانی دەدا، یەك دوو قاپی قوپاو، كەوگیرێكی كلك قرتاو، قۆڵی قرتاوی پاڵتۆیەكی عەسكەری، بووكەشووشەیەكی بێ سەر، دەفێكی دڕاو، قەرەوێلەو.. گۆزەیەكی هەردوو دەسك نەماو.. چ وێرانەیەكە.. بە دەست تێوەردان و تێكدانی ئەو شتە زۆر كۆن و داڕزاوانە دەیەها مارو مێروو، دەیەها زیندەوەری بێ ناو لە ترسانا دزەیان دەكردو خۆیان لە كون و قوژبنەكان دەشاردەوە، دەروێش تەواوێ سامی لێ نیشت و كشایەوە، بێ هوودە هاتەوە ناو حەوشەكەو لە دار هەنارەكە راما.. عەجایب.. لەوەتەی هەیە هەر گوڵهەنار دەگرێ و دەوەرێ، تا هەنووكە بە عەزرەت بووە هەنارێك بگرێ، نەبووە.. خۆی زرە یان خاكەكەی خەراپە، لە بەر پێی هەنارەكە هێشتا قەپێلكی هێلكە شكاوەكەی سەرلەبەیانی هەر لەوێدا كەوتووە، سەرما تاوی سەندو مووی لەشت گرژ بوون، مەنجەڵی مسەكە كە سەرلەبەیانی هەمین شیری تێدا دۆشی هەر وا لە بەرهەیوانەكەو

تـۆزێکی کـەمو تـەنك نیشـتبووە سـەر ئـەو کـەم شـیرەی لـە بنـی مەنجەڵەکـەدا مـەیی بـوو، ئـۆقرەت لـێ بـڕا، ئـەو مـاڵ میراتـە هـەر نەهاتەوە، بچیتە دووی یان تۆزێکی دیکە چاوەڕێ بیت؟ ناشکرێ بەم شەوە لە دەرگای ماڵە دراوسـێیەکانت بدەی، با هـەر نـەزانن، ئـەوەش دەکـەن بـە قـەوان.. ئـۆە.. چـاویان تێـر نابـێ، دوو سـەر خێـزانن، پـیرەژنو پیرەمێردێك، کەچی لـە بەیانییـەوە تـا شـەوێ داناسەکنێن، دارو بەرد بسرەوێ ئەو دووە ناسرەون، ژنە بۆ تۆزێ شیرو چـوار هێلکـە فرۆشـتن لـە قـون دەرگایـان دەکـەوێ، ئـەویش دەروێشەو پیاوی تەریقەت، ئەو ڕەشـۆڵە بەسـتەزمانانە راو دەکاو دەرخـــواردی ئـــارەق خۆرەکـــانی هـــەولێرێ ی دەدا، دەك داڕزێ ی پیاو، پیاو ژنی بە گان بدا چاکترە، جا خوشکم حیسابکە ژنەکەی بە خێوی دەکا، پیاوێکی بێ دەمارە، نا.. ناکرێ لـە دەرگای کـەس بـداو هانـا بەرێتـە بەرکـەس.. هێـدی هێـدی دەیپروشـکاند، کـزە بایەکـە لقـەکانی دار هەنارەکـەی دەلەرانـدەوە، تـۆ بڵـێ ی بیکـا بـە باوو بۆران؟ ترسایت ڕەشۆڵەکان تەڕ بن، هەستایتو بە خشەخش تۆڕەکـەت راکێشـاو لـە نـاو گەنجینەکـە جێـت بـۆ خـۆش کـردن، سبەینێ زوو دەیانبەی بۆ سلێوە، هـەمین بـە غیرەتـەو بێتـەوە هـەر هــەموویان ســەر دەبــڕێ، وا باشــترە دەروێــش، هــەقی پــاککردنی ڕەشۆڵەکانیش لەسلێوە وەربگرە، یا شێخ بیسـتوویەتی کـە هـەمین ڕەشۆڵەکان سەر دەبڕێو زۆربەی نوێژەکانی قەلاّ دەکاتەوە، هەمین دەڵێ:

(ئەمن ماندیو شەقیم دەروێش، وەکی شـێخی شـێخان لـە بـەر سێبەری کەروێشکە خەوان ناکەم)

جارێکی دیکە لە ئاسمان رامایتەوە، بێ ئافات بێ.. چوویتە ژووری، لە وێنەکەی خۆت رامای، لە ژێر ئەو تەنکە رۆناهییەی ژوورێدا لێڵ دیار بوون هەر وەك وێنەی کەسە مردووەکان، لە دەف و شمشێرو زەرکی هەڵواسراوی قەد دیوارەکە رامای، دەمێکە توخنیان نەکەوتووی، کۆنە لێفەیەکت لەسەر ئەستێرکەکە راکێشا بەو نیازەی لەسەر کەچە لبادەکە رابکشێیت و بە خۆتیدا بدەی، چاوەڕێی هەمین نەبوویتایە پشووە خەوێك هەر ئاوا لەسەر لبادەکە پاش ئەو هیلاکییە گەلەك خۆش دەبوو، تا بەرملت لێفەکەت راکێشا، هەستایتەوەو لێفەکەت لە هەردوو قاچە تەزیوەکانتەوە ئاڵاند، نەفەس بڕت کرد، گەر هەنووکە هەمین بەڕێوە بێ چاوەکانی بەرگەی ئەو کزە بایە ناگرن، تۆ بڵێی نەیکا بە رێژنە؟ تەرزەی درشت سەرو پۆتەلاکی هەمین دەکوتنەوە، عاجباتیت لێ دێ، وەختێ دەبارێ ریشۆڵەکانی ئەو دەشت و دەرە چییان لێ دێ؟ نا.. هەنووکە گەیشتوونەتەوە سەر درەختەکانی شار، هەنووکە خۆیان لە بن چڵ و چێوان دەشارنەوە، هەر وەختێك تۆ لەو دەشت و دەرە دوا کەوتبیت هەمین حەجمانی لەبەر بڕاوە، هەروەك هەنووکە.. کە شەوت بەسەردا هاتووە هەمین تا هاتنەوەت لە بەردەرگا وەستاوە، وەك بەیداغ ئەو کۆڵانەی بەجێ نەهێشتووە، بێ باك لە سەرما و گەرما، هەموو پیادەڕۆیەك، لە ژن و پیاو، لە تۆی پرسیوە، ها دەروێش نەهاتیتەوە؟ نەوەڵڵا خوشکۆرە.. نە وەڵڵا کاکی برا.. نەوەڵڵا بابی بابم.. ئەو وەختانە دەست بە یەکدا دەداو دوعا دەکا، شێخی چۆلی بیپارێزی، حەزرەتی غەوس فریای کەوی، سەد جاران پێی دەوتیت، ماڵ

میرات گەلەك دەترسێم.. بەو پیری‌یەو بە تەنێ لەو دەشتو دەرە، ئەتوو دوو چڵ ئێسقانی، لاوازو باریكو بنێس.. دەترسێم رەشەبایەك بێ و هەڵتبگرێ...

راست دەکا.. هەر رۆژێکە یان شەوێکە رەشەبایەکی توند دەتباو لە دەشتێکی غەریبو دوور لە ئاوەدانی فرێت دەدا، بە خۆ ناکەویت خۆت کۆ بکەیتەوە، فریای تۆڕو پیشەقانو نێرەکەرەکەت ناکەویت، کتو پڕ دەیکاتە بارانو تۆڕی راخراوت لەسەر ئەو خاكو خۆڵە لەگەڵ قوڕو لیتەی ئەو دەشتە باران پتر دەیکوتێ و لەگەڵ عاردەکە دەبێ بەیەك، پەلیکە دارەکانی کە تۆڕەکەتی پێ هەڵدەبەستی ئاو دەیانبا، قۆرتو سەنگەری رۆژانی برسیەتی و سەرماو خەونو ختوورەو خەیاڵەکانت پڕ دەبێ لە باراناو، ئەوەندە دەبارێ مووی لەشت.. بگرە ئێسقانیشت تەڕ دەبێ، ئاو بە سمێڵو ردێنو تووکی سەر سینەت دادەچۆڕێ، عومرێکەو هەمین، خۆت ترسو دڵەڕاوکێی ئەوەتانە کە هەر رۆژێکەو بیکا بە لافاو، نەخۆتو نە نێرەکەرەکەت دەرەقەتی نایەن، خۆتانی لە بەر ناگرن، راتان دەماڵێ، لە ژێر لافاوی تووشو شێتی و زستانێکی زاڵمدا نقوم دەبنو ئیدی تا ئەبەد کەس ناتاندۆزێتەوە، لافاو هەڵتاندەگرێ و لە مەملەکەتێکی دیکەدا لاشەی خۆتو کەرەکەت غەریبانە لە گوێ رووبارێکدا یان چەمێکدا لە قوڕو لمدا دەچەقن، دەکەونە شارێکی دیکە، عەجەمستان یان عەرەبستان، خەڵکێکی زۆر لە دەورتان کۆ دەبنەوە، دەمو قورگت، چاوە کزەکانت، چاوانی هیلاكو پڕ خەمو دەردت، ئەو چاوانەی بە تەنها لە تێڕامانی بەژنی هەمینو تۆڕێکی

پڕی ریشۆڵەدا دەگەشانەوە، ئەو چاوانە پڕ دەبن لە قوڕو لیتاوی گوندو شاران، ئەوسا گۆڕێکی تەنیاو دوو بەردی خوارو خێچ دەبن بە کێلی سەر گۆڕە غەریبەکەت، زۆر ناباو لەگەڵ زەوی‌یەکە تەخت دەبێ، خەڵکی نەناس‌و بێ ئاگا بە سەرتا تێدەپەڕن، کەس نازانێ لە ژێر قووڵایی نیو بەژندا راکشاویت، خەونێکی خنکاویش وا دەنێو چاوانت، عیشقێکی کۆن‌و خەوتوو وا دەنێو دڵتدا، خەونێکی بەر لە خنکان، تۆڕەکەشت سەر ئاو دەکەوێ‌و لە پاڵ چەند رەشۆڵەیەکی خنکاودا دەکەونە سەر خاکێکی دیکە، زەمانێ دوای لافاو، دوای رەوینەوەی هەوری رەش‌و باران بار، رۆژی یەکەم‌و دووەم‌و سێیەم بەسەر دەچن، هەفتەیەك.. دوو.. غەیب دەبیت‌و ناچیتەوە، بە خۆو بە پێڵاوی قوڕاویتەوە وەژوور ناکەویت، هەمین هاوارت لێ ناکات، کوڕە عەمر درێژ نەبیت هەر هەنووکە ئێرەم خاوێن کردەوە، تۆش بڵێی: (دە برۆ لاکەوە.. قوڕ پاکە)، چەند جاران هەمین ئەو خەیاڵ‌و خەون‌و ختوورە ترسناکەی بۆ گێڕایتەوە.. دەروێش رۆژێك دێ لافاو بتبا.. لەو دەشتە چۆڵ‌و هۆڵەدا بە تەنێ دەمریت، بۆیە لە ترسانا هەموو دەمەو ئێوارەیەك بەر لەوەی کەرەکەت لە خۆشی گەیشتنەوە بە ماڵێ.. بە خۆشی ئالیك‌و ئاخور بزەڕێ، هەمین دەهاتە دەرێ، دەرگاو باوەشی گەرمی بۆ دەکردیتەوە، وەی لەو پێشوازی‌یە پڕ لە حەیبەت‌و شەرم‌و شکۆیە، هەمیشە گوێی هەڵدەخست، ئەگەر قاژەقاژی ریشۆڵەکانی ببیستبایە، با لەوپەڕی گەڕەکیش بووایە، خەندەیەکی شیرین‌و ماندوو، خەمزەدە نیشتە سەر لێوانی، ئەگەر دەروێش سواری کەرەکەی بووایە دەلیل بوو کە هیلاك‌و دڵساردو

ـــــــــــ

ماندوو، هیچی راو نەکردووە، ئەگەر سەد رۆژان بە تۆڕی بەتاڵەوە بهاتبایەتەوە خۆت مۆن و گرژ نەدەکرد، لەبەر دڵی هەمینێ بەسەر خۆت نەدەهێنا، نەرمە نەرمە لە ژێر لێوەوە حەیرانت دەچڕی، هەر لە دوورەوە قاقا پێدەکەنیت، مەرگەساتی ئەو دەشتەت هەر لە بەردەرگا دەکرد بە سوعبەت و گەمەی ململانێ و شەڕی خۆت و ریشۆڵەکانت بۆ هەمین دەگێڕایەوە:

(کچەتیم ئەوڕۆ یەکدیمان زۆر ماندی کرد، یەکدیمان هیناو برد، ئەوان بۆ چەند دەنکە دانەوێڵەیەك مل لە تیغ دەسوون، ئەمنیش بۆ پارووە نانێك، چ بکەم کە ئەو شتە زۆر هیچ و رەش و گچکەلۆکانە بردیانەوە، چ قەیدیی‌یە، زستان بە بەرییەوە ماوە، سبەی، دوو سبەی.. کچێ مانگێکی دیکە، ئەوە ئەرزو ئەوە گەن)

تێت رادەماو دەحەپەسا..

(ئەوە گەمەی بە من دەکەی یان بە خۆت؟)

(دەنگ بەرز مەکەو.. وەرە حەوشێ)

(جارێك و دوان و سێیان نیه.. ئەو خەیاڵە پیسە لە مێشکت دەرکە هەمین)

(ناتوانم باین)

ئیتر هەر وەختێ شەوت بەسەر دابێ و ئەو گوێی لە قاژەقاژی رەشۆڵەکان نەبێ و لە دوورەوە زەڕینی کەرەکەت نەگاتە گوێی حەجمانی لەبەر دەبڕێ، زەندەقی لەوە چووە لەو دەشتە چۆڵەدا کەسێکی خۆی زەفەرت پێ ببا و بتکوژێ، سەرما و سۆڵە رەقت بکاتەوە، لافاو بتبا، کت و پڕ بقەومێ و نەتبینێتەوە، ئەوسا هەمین ناچار دەبێ مانگاکە بفرۆشێ، مریشکەکان و جووجەڵەکان، تفاقی

ماڵ، ئیدی چیدیکە هێلکەو شیرو ماست بە ماڵە دەوڵەمەندەکاندا ناگێڕێ، هەمین نا.. ئافرەتێکی دیکەی وەك هەمین کلۆڵ، کلۆڵتر لە دەرگای ماڵی چەلەبی و سمایل بەگ و باپیر ئاغا دەدا، هەمین کەشکۆڵ و توێشەبەرە هەڵدەگرێ، کەزی خۆی دەبڕێ و دەرگای پێ دادەخات، بە پێ خواسی، سەرو مل کۆت، شێتانە بە توێی کراس و کەوایەکی رەشەوە دەگەڕێ، دەشت و دەرو چیا و رووبارو دارستان و چەم و چۆمان دەبڕێ، تەنها خۆی، بوخچەیەك لە شڕو شیتاڵ دەخاتە بن باڵی و هەر دەڕوا، سەرەتا شەقاوەکانی هەژمار دەکا و دوایی لە هەزاران هەزار تێپەڕی دەکات، سەیری ئاسمانی بە تەم و دووکەڵ و هەورو هێڵ دەکات، دەشتێکی کاکی بە کاکی، وەك (حەوا) بە دوای (ئادەم)دا بگەڕێ، ئەم بە دوای بایزدا دەگەڕێ، برسی و تینوو، لە شارو لە گوندان دەپرسێ، لە باڵندەکانی ئاسمان، لە رەشۆڵە تەریوەکان، سەر هەڵدەبڕێ و هاوار دەکا، دەگری، بە چاوو دڵ، رەشەبا لە سینەو مەمکی وشکەوەبووی دەدا، قژی ماش و برنجی بۆ دادێنێ، بەفرو باران خەنەی قژی دەشواتەوە، تاڵەکان تەڕو خاوێن و زیوین وەدەر دەکەونەوە، جار ناجار.. لێرەو لەوێ.. لەسەر گردێك دەوەستێ و سەیری دوور دەکا، باڵندەکان وا دەزانن درەختەو لەسەر سەرو پرچی دەنیشنەوە، ئەویش ناجووڵێ، ورد ورد چینە لە قژیدا دەکەن، هەر ناجووڵێ، رەشۆڵەکان پۆل پۆل سێبەر لەسەر سەری دەکەن، دەنووك لە دەم و لێوی تەزیوی دەدەن، لە تەڕایی نێوان هەردوو لێوی بەسەر یەکدی قرمساویدا دەخۆنەوە، هەر ناجووڵێ، وا دەزانێ دەم و لێوی تۆیەو لە یەکێ لە ژوانەکانی ئەوسادا،

ئەوسای جحێڵی‌و خوێن گەرمی، ئەوسای ئەوین‌و نازکی، کەیف‌و سەفاو دڵنەرمی، باڵندەکان لە هەموو لایەکەوە ئاسمان جێ دێڵن، لەسەر هەردوو شانی هەمینێ هەڵدەنیشن، بە چوار دەوریدا باڵەفرە دەکەن‌و بە بازنەیەکی مەزن گەمارۆی دەدەن، لە هەزار ئاوازو نەغمەی خۆش‌و شیرین دەخوێنن، وای مەزەندە دەکا تۆیت‌و وەك ئەوسا حەیران‌و لاوك‌و بەندان دەچڕی، خەنی دەبێ، دەنووکان دەخەنە نێوان جۆگەلەی هەرتك مەمکانی، پەڕو شاباڵ بەسەر سینگی‌دا دەهێنن، ختووکەی دێ‌و دەخەنێتەوە، وا دەزانێ سمێڵی دڕو پڕ تەزووی تۆیە، سات لە دوای سات چی ریشۆڵەی ئاسمانان هەیە لە زستانی هەموو ولاتێکەوە بەرەو زستانی دڵی هەمینێ باڵ لێك دەدەن، کە ریشۆڵەکان دەبینێ بەسەر سەری‌یەوە دەنیشنەوە، لەگەڵ مەلەکانی دیکەدا تێکەڵ دەبن، قاژەقاژی ریشۆڵەکان تۆیان بیر دەخاتەوە، شەوانی ساردو گەرم، رۆژانی خۆشی‌و خەم، حەزو ئاوات‌و دڵەڕاوکێی مەرگ، لەپڕ دەداتە پڕمەی گریان، گریانێك وەك زریان، ناڵەو زریکەیەك ئەو دەشت‌و دەرە بتاسێنێ، لەگەڵ ئەو زریکەیە چی فڕندەو مەلی سەر سەرو مل‌و شان‌و نێوان هەردوو مەمکی هەن، باڵندەکانی هەر چوار دەوری لە شەققەی باڵ دەدەن‌و.. رووەو ئاسمان هەڵدەفڕنەوە، رەشۆڵەکانیش.. ئەو رەشۆڵانەی کە لە دوورو نزیکەوە هاتوون، هاتوون بەو نیازەی سەرەخۆشی لە هەمینێ بکەن، بە فریای نیشتنەوە ناکەون، کەچی هەمین دەزریکێنێ‌و تێکڕا هەڵدەفڕن، تەنیا جێی دێڵن وەك درەختێکی بێ گەڵا و پرزە لە بەر بڕوای بەردەم رەشەبا، لە شانی گردەکەوە دادەبەزێ، پێستی بنی

پێیەکانی دادەڕزێن، سەر هەردوو دەستو باسکو رووومەتی قەڵەشتی زامار دەبن، شینو مۆر هەڵدەگەڕێن، ئاوو زڵزڵەی لێ دەچۆڕێتەوە، تۆزی غەریبی شارانی لە روو دەنیشێ، سەرو پرچیشی هێلانەی وێران بووی مەلەکان، چاوەکانی دەبنە دوو گۆمی پڕ لە ماسی مردوو، دوو کانی کوێرەوەبوو، ئەوەندە دەگەڕێ تا نینۆکەکانی هەڵدەوەرێن، برژانگەکانی.. برۆکانی.. لە بری فرمێسکان خوێن لە چاوانی دەبارێ، ددانەکانی ژەنگ هەڵدێنن، هەر دەڕواو دەپرسێ، لە درەختەکانی لاڕێو بەردو دارو رێبواری نەناسو قەرەجەکان دەپرسێ، لەو ژنانەی کە پشتیان لە ژێر کۆڵی چیلکەدار چەماوەتەوە، لەو پیاوانەی لە بری گاجووت یان هێستر، خۆیان نیری لە مل گاسنەکان رادەکێشنو زەوی دەکێڵن، لەو شوانانەی لە ترسی باران خۆ لە ژێر کەپەنگ دەشارنەوە، لەو سەپانانەی عومرێکە دروێنە دەکەنو پشتیان راست نەکردۆتەوە، لەو پرسە دارانەی ماتو مەلوول تەرمی ئازیزێك دەنێژن، لەو رێگرانەی شەرم لە تارمایی پیرەژنێك دەکەن، لەو کچانەی بە دەم قاقاوە لە کانیو کۆڵ دێنەوە، لەو شایی خۆشکەرانەی لە زەماوەندێکدا هەڵدەپەڕن، ئەرێ خەڵکینە.. نەتان دیتییە؟ راوچییەکەی من.. راوچی کارمامزی دەشتی دڵەکەم؟ پیاوێکی وردو باریکەلە، حەیران بێژێکی بێ هاوتا، ئەمن لەوەی دەترسێم رەشەبا هەڵیگرتبێ، بروسك لێی دابێ، پێی لەسەر بەردەبازی ناو چەمێك هەڵخلیسکابێو ئاو نقومی کردبێ، هەر دەڕوات، بێ دەربەست لە بەڵای ناگەهان، دڕکێکی زۆر لە پێیەکانی دەچەقن، گوێی پێ نادات، دڕکێکی لەوە گەورەترو

تیژتر وا دەنێو دڵیدا..

(کێ کوڕە لاوەکەی منی دیتیە؟)

کراس و کەواکەی لە بەر باران و هەتاو و ڕەشەبا و بەفرو زیاندا هەلا هەلا دەبن و بەسەر پێستیەوە زیواڵ زیواڵ هەڵدەوەرێن، تا دێ قژی ماش و برنجی درێژتر دەبێتەوە، درێژ تا بەر پێیانی، بۆی دەبێ بە کراسێکی ئاودامان، گیاو و گوڵ و گەڵا و گوڵ و ڕەگی درەختەکان دەخوات، زستان دەم بۆ باران دەکاتەوە، هاوینانیش فرمێسکی خۆی دەخواتەوە، برژانگەکانی هەردوو برۆیانی هەڵدەوەرێن، قەتماغەیەکی ئەستووری برین دەکەوێتە سەر لێوانی، بە دەنگێکی کزو غەمهێن ئەو لاوک و حەیرانانە دەڵێتەوە کە جاران شەوانی زستان و پایز لە بەر ڕۆناهی چرایەکی کزدا دەرویش سەری دەخستە سەر ڕانی و بۆی دەچڕی، سەر بۆ ئاسمان هەڵدەبڕێ و چاوی بە ریشۆڵەکان دەکەوێ، پڕ بە قورگی، پڕ بە ئاسمانی سەر سەری هاوار دەکا:

(ئەنگۆ بایزتان کوشت.. لاشەکەی وا لە کێندەرێ؟ هۆ مەل و فڕندەکان کە لە ئاسمانەوە هەموو شتێک و هەموو شوێنێک دەبینن.. خەبەرم دەنێ.. دەنا لێتان خۆش نابم.. ئیدی تەواو.. ئەو مردوو.. و.. چیدیکە ڕاوتان ناکات.. ئیدی بێ ترس بفڕن.. دە وەرنە خوارێ و بە هەمووان بەرزم کەنەوە.. بەرەو ئەو ئاسمانە دەبا چاوان بگێڕم..

***ئەوجا دەرێم خۆزیا بە خۆزی داران***

***ئەمن باز بوومایە***

***سوار بوومایە ئەوەل مانگێ پایزان لەسەری (پیرمەم)ێ***

---

***ڕەنگین***

***لە چۆمی (کۆڕێ).. لە باخی (شەقڵاو)ێ***

***لە بنەبنەی (خانزادێ)***

***لە زاریا گەلی عەلی بەگی***

بەڵکو ئەوە خودایە بایزی ببینمەوەو لە باوەشیی بگرم ئاخر ئەنگۆ نازانن چەندم خۆش دەوێ.. دە دەی بەرزم کەنەوە.. بە هەمووتان.. خێرتان دەگاتێ..

دەبا چاوان بگێڕم.. تا بزانم لە ژێر کام دەوارو کام دارو دەوەن‌و پنچکە دار.. لە گوێی کام چەم‌و رووبار.. لە ژێر کام زەریادا خنکایە؟ کام بەردو خاك سەرین‌و راخەرییەتی؟ قوڕی کام دەشت کفن‌و بەرگیەتی؟.. با لۆ دوا جار چاوم پێی بکەوێ.. دەترسێم تەنیا مردبی‌و قوڕو لیتاو بیشواتەوە.. (با)ی پیرە پایزێ لێیدا.. خوا بکەم لە پاشت جێ نەمێنێ بەژنێکی شکاوو..

***دوو چاوی پڕ لە حەسرەتییە***

***ئەتووم بمری سەر دەبەمەوە ناو کوپەلەی دەخمییە..***

***پاشی توو زندەگانیم لۆ چییە؟***

***هەتا بمێنم سینە کوتان‌و مردەنییە***

***خودایە.. کۆمەکت بێ بکەن چل سواری غەیبییە***

***هەتا ئەتوو دێیەوە لە من وایە ئێرەش چۆلەوانییە***

***هەولێرم ئاوەدانی تێدا نییە***

***لە دوای توو دادەنیشم بە سەری کاس‌و ملی لارو..***

***چاوانی نابیناو گوێی تەپ‌و زمانی لاڵ‌و..***

***دڵیشم پڕ لە شکەستییە***

---

*فانووسی شەوانیشم بێ ڕۆناهیە*
*بە تەنێ دونیام لێ تەنگەو پڕ تاریکیە*
*خودایە.. بایز گەلەك هیلاك و غەریب و شەقیە*
*بەردی ساردو گەرمی نەخەیتە سەر ڕێیان*
*لە دڵەکەی بڕوانە چەندە پڕ ئێش و ژانە..*
*چەندە ماندیە*

سوێندبێ هەتا دێیەوە چەناگەم لەسەر ئەژنۆیان بڵند ناکەم، ئەنگۆش هۆ ڕەشۆڵەکان، بایز گەلەکی خۆش دەویستن، بێنانی نەبووایە راوی نەدەکردن، ئەنگۆ بە دڵی ئەو نازانن.. گەلەك جاران لە کنە من، لەسەر ران و سینەو بەرۆکی من ئەو وەختەی دەحەسایەوە، بەر لەوەی بنوێ.. لە بۆ نگۆ دەگریا، برسیەتی و سڵێوەی بە لەعنەت دەکرد، ئارەق خۆرەکانی هەولێرێ، ئاغاو بەگزادەکان، هەمین ئەو مەلە گچکەلۆکانە گوناهیان چییە بکوژرێن؟ نەیدەخواست پەڕو باڵتان بکرێ، ملتان بقرتێنن، حەزی دەکرد سەربەست بە ئاسمانی پان و بەریندا هەڵفڕن، برسیەتی راوی دەنا، ئەویش بەو پیرییە راوی نگۆی دەنا، هۆ ڕەشۆڵە گچکەلۆکەکان، ئەی ترسنۆك و باڵ لەرزیوەکان، هۆ فڕندە وردە زستانییەکان ڕێزی بگرن، دواجار ئەو پیاوە قەلەندەرەتان بەزاند، تۆڵەتان لێ کردەوە، ئەنگۆ کوشتتان، وەختە شێت و شەیدا بمو لە کراسەکەم بێمە دەرێ، وەی لە خۆم خانە خەراپێ، چەندە لە دەرکی مالان دەڕوانم، شتاقانم لێ واز نییە، وای لە دڵی من گرمەگرم و ناڵەناڵە، دەروونم خۆش نییەو زارم تاڵە، چەندم گوت دەرویش دڵم ختوورە دەکاو مەچووە راوێ، ئەگەر خودا دەکاو

لەو راوەی دەگەڕێیەوە، سنگمت لۆ دەکەم بە باغی خواجە حەسەنی وەختێ تازە ریشەی هەناری لێدایە، تورنج و نارنج لەوێدا بەریان هینایە، ئێوارەو سبەینانێ لێی بکە تەراتێن و شەو راوە، ئەوسا لۆ خۆت دەبینی کام و کاوە، وەی کە دڵم یەکجار زۆر لە ئێشەو گەرمەژانە، دەنگۆ بە دەنگمەوە وەرن، دەماغ گجکەو هیچ مەبن، دەنا لە حەزی ژن و پیاوێکی هیلاک و دەشتەکی قەت تێ ناگەن، ئەنگۆ نازانن هەتیوە لاوەکەی من چ دەنگ و سەدایەکی هەبوو؟ خویندنی هەموو مەلەکانی ئاسمانێ بەقەد حەیرانێکی دەروێش خۆش و بەتام نابن، حەدیان چییە وەکی وی خۆشخوان دەبن؟ ئەنگۆ لە هیچە دەچریکێنن، بایز تا دڵی گەرم نەبی.. ناچریکێنێ، وەرن و دەست بدەنە باڵم، رووەو شینایی ئاسمان هەڵمدەن تا بزانم لە کوێ چاوانی لێك نایە؟ جاران شەوی جارەکەم دەدیت، هەنووکە لە منی غەریبە ماڵ و ژنێکی بە تەنێ دەروێش بووە بە قاتی، سەر هەڵدەگرێ و بە دووتدا دێ، دەڕواو لە هیچ گوندو شارێك هەمینی بێ پەڕو باڵ رانەوەستێ، دێمکە ئاوێك و توێشەبەرەیەکی پڕ لە وردە نان، لە ژێر هیچ رەشماڵ و بن کەپرێك لا نادات، قژ دەرنێ و لوولی دەداو دەیکا بە بازنی هەردوو زەندەکانی دەستی، بێ نوچدان هەتا بۆی بکرێ لەسەر هەردوو پێ هەر مل دەنێ، کە هەردوو پێیەکانی سست و سڕ دەبن، کە پێستی پەنجەکانی و بنی پێیەکانی لە ژێر پنچك و دڕك و سەر گیا و نێو درەختەکان وەك کاژی مار جێ دەمێنێ، دەکەوێتە سەر هەردوو ئەژنۆیان، دوو ئەژنۆی ناسك و پێست تەنك، لەسەر ئەژنۆکانیشی زۆر لە شارو گوندەکان دەگەڕێ، پێستی سەر

هـەردوو ئەژنۆکانیشـی دادەمـاڵرێن، دەکەوێتـە سـەر سـینگ و بـە چـنگەکرێ دەسـت لـە درِك و خـۆڵ و قـورِو دارو بـەرد و گیـا و لمـی سـەر زەوی گـیر دەکـات، خـۆی دەداتـە دەسـت رەشـەبا، زسـتان دەگوزەرێ، بەهارو پایزو هاوینیش بەسەر دەچن، زستان دێتەوە، پـایز بـە دوایـدا، ئـەو هـەر دەگـەرِێ، رەشـەبایەك هەڵیـدەگرێ و دەیباتـە سـەر ئـەو قۆرتـەی خـۆت تیـا دەشـاردەوە تـا رەشـۆڵەکان نەتبینن، قۆرتێك و.. دوو.. سێ.. ئەو دەشتە کاکی بە کاکی‌یە هەر هـەمووی دەبـوو بـە قـۆرت، لـە قـۆرتی یەکـەمیان قـورِو لمەکـەی دەردەدات، بـە چـنگ.. بـە هـەردوو دەسـت، بـە دەم و ددان، قـورِو لیتاوەکـە فـرِێ دەداتـە دەرێ، ئـەوە خوایـە تـۆ لـەوێ خـەوتبی، بـە ماچێکی لێوە هەڵوەریوەکانی هەمین وەئاگا بی، رابچەنی، ئەویش وەکی کۆرپەیەکی شیرین لە باوەشێت بگرێ، گەرد و خۆڵ لەسەر چاوەکانت لابەرێ، گری دڵی خۆش بکات تا تۆ گەرم بیتەوە، قژی خۆی بسووتێنێ تا دەست و پەنجە سرِەکانت بکەونەوە جووڵـەو خـوێن بـزاوتن، تـۆش سـەرت بخەیتـەوە سـەر سـینەی بۆنخۆشـی هەمین و تك تك فرمێسکەکانی بخۆیتەوە، تا سەرلەنوێ بژییتـەوە، باسـی ژوان و حـەزو سووتانی نێو هـەوێزو کـادین و سـەرکانی بـۆ بکـەیت، شـەوانی شـەهوەت و حـەمامی گـەرم و چـەلاوی رەشـۆڵە کولاوەکان، رامووسان و دەست لە ملانێی پاش رۆژێکی درێژو پرِ لە ململانـێ و مەینـەتی، رۆژانـی سـەخت و پرِ ترسـی رەدووکـەوتن، خۆ بزر کردن، شەوانی دەنێو یەکدیدا توانەوە دوای رۆژانی ئارەق رشـتن و خـۆ رەتانـدن، ئـای لـەو رۆژە بـە تـام و ناخۆشـانە، دڵگـیرو سەختانە، پرِ خەم و خرۆشان.. ئەوسا سەیری چاوەکانی دەکات،

ــــــــــ

تۆ چاو هەڵناهێنیو بۆ یەکجاری نوستوویت، هەمین لێت ورد دەبێتەوە، بە دوو چاوی گرانو ماندووەوە دەبینێ وا لاوکێك وەك پەپوولەی باڵ نەخشین لەسەر لێوە قرمساوەکانتدا مردووە، چاوەکانت.. چاوە کزو گچکەلۆکەکانت لە جێی حەزو تاسەی هەمینێ بە قوڕو خۆڵێکی سووربۆو تەڕ بووە، پیس بووە، کتو پڕ هاوار دەکاو دەزریکێنێ، دەداتە پڕمەی گریان، فرمێسکی بەخوڕ بەری چاوانی دەگرێ، ئاسمانو دەشتی چۆڵو رووت لێڵو تەڕ دەبینێ، گریان دەبێتەوە بە هەنسك، هەنسك بە نووزە، نووزەیەکی غەریبو دڵتەزێن، کە چاوە بەڵەکەکانی دەکاتەوە، لەبری تۆ جووتێك پێڵاوی لاستیکی لا هەڵتلیشاوی لە باوەش کردووە، وەك کۆرپەیەك رابژەنێ خۆی بادەدا، کە چاوی بە پێڵاوەکان دەکەوێ رادەکاو دەچێتە ناو قۆرتێکی دیکەو پرزۆڵی جەمەدانێیەك دەبینێ، قۆرتێکی دیکە، پشتێن، لەوی دیکەیان کڵاوەکەت، لە یەکێکی دیکە دەستو پەنجەیەکی قرتاو، دوو چاوی هەڵکۆڵراو کە رەشۆڵەکان دەنووك ئاژنیان کردبێ، پڕ بەو ساکە دەشتە دەقریشکێنێو.. کەچی تۆ لێرە لە خەو رادەبیو شایەتومانێکی بەهەق دێنی، سەیری دەوروبەری خۆت دەکەی دونیا زۆر کپو خامۆشترە، (تۆ بڵێی بۆرژابم؟ چەند دەبێ نوستیمە؟ ئەو خەوە ناخۆشە چی بوو؟ خودایە بەخێری بگێڕی، ئەوە مۆتەکە بوو یان زیندەخەو؟)، لە چوارچێوەی دەرگا وازەکەوە لە دەرەوەت روانی، لە دوورەوە گوێت لە زرمو کوتو چەقەچەقی ئاشەکەی چەلەبی بوو.. بێ شك گوێت لەو چەقەچەقە بووە، هەر ئەوەش خەوی لێ خستووی.. شەوێك زرمو کوتو ناڵەی ئەو ئاشە نەبێ کەم کەس

لە گەڕەکێ خەوی لێ دەکەوێ، ئەو چەقەچەقە هاوریتمە بۆتە لایلایەو خەویان لێ دەخات، گوێت لە پرمەی مانگاکە بوو، لاوکێك لە گوێتدا دەزرنگایەوە، مێخ زنجیرە درێژەکە بواری دابوو کەرەکە تا پاڵ دەرگاکە بێ، هەروەك بڵێی لە تەنیاییو شەوو گرمەی گەواڵە بترسێ، چڕی تاریکی پتر رژابووە ناو حەوشەو ژوورەکە، چراکە بە زەحمەت دڕی بەو تاریکییە دەدا، کەمەکێ تاسابووی.. دەتویست بزانی سەعات چەندە، هەستایتەوە سەر قوونو پشتت بە دیوارەکە داو سەعاتی بەرباخەڵت دەرهانی، چرکەی لێوە نەدەهات، جگەرەیەکی زەلی نیوە سووتت لە ناو دەلاقەکە بینی، بەردە ئەستێیەکەت دەرهانیو ئاگرت دا، تا ناوهەناوت مژی قووڵت لێ دا.. دەتووت دەتەوێ لە ناوەوە دەعبایەك قانگ بدەی تا ئەو دووکەڵە بیخنکێنی، بە حەسرەتەوە وەك بڵێی هەمین ماچ بکەیت لێوت لە سیغارەکە نزیك خستەوە، دەنێو پەنجە بۆرو چڵکنەکانتەوە یاریت پێ دەکرد، وەك ئەوەی یاری بە قامکی هەمین بکەی، دەنگێ لە غەیبەوە.. کە دەنگی هەمین بوو هاتە بەر گوێت: ئاگات لە خۆت بێو ئەوەندە لەو تووتنە پیسە مەکێشە، ئاخر سیپەلاکت دەڕزێتەوە، خۆت هەناسە بڕکێتەو سەرمای ئەو دەشتەش لەوێ بوەستێ، لە چی بترسێم؟ لە مەرگ.. چما مردن لەم ژیانە خۆشتر نییە؟ هەمین بەو قسانەت شێت دەبوو، بەیانیان بەو سوعبەتە قورسانەت جارێ تووڕەت دەکردو، پاشان بەر لە رۆیشتن بە قسەیەك ئاشتت دەکردەوە، دەتویست ژێر هەیوانەکە پڕکا لە قریوەو هاوار، دەرو دراوسێ کە بە بەردەرگاکەتان تێپەڕ دەبوون دەیانزانی بەم بەیانییە زووە تۆی

شەڕ بە هەمین دەفرۆشیت تاوەکو جنێوی مزرت پێ بدات، کە گوێت لە ترپەی پێی ڕێبواران دەبوو پتر دەتکرد بە گاڵەو هاتو هاوار، تاوەکو بزانن دوو کەس وان لەم کەلاوەیەدا، ژنو مێردێکی پیرو ماندوو، وان لە پشت ئەم دەرگایە، بە شەڕ دێن، شەڕی پڕ لە خۆشەویستی، ئەو پیاوانەی بە جلی ئیشەوەو بە شانی داکەوتووەوە، جلی ژێر گڵو گەچو چیمەنتۆ بە کۆڵانە تەنگەبەرەکەدا غاریان دەدا نەبا ڕۆژ هەڵبێو نەگەنە مەیدانی قوڕکاری ژێر قەلا، نەیاندەتوانی هەستو خوست لەو شەڕو هەڵلایە رابگرن، تەنها ئەو ژنانە نەبێ کە رووەو نانەواخانەکان خشەخشی سۆلیان دەهات، تاوێ لە بەردەرگاکە هەلوەستەکیان دەکردو دەڕۆیشتن، تەنگەتاوی ئەوە بوون نان بۆ منالە چلمنو چلکنو لاوازەکانیان بەرنەوە، ئەوە خوایە مەکتەب تەواوکەنو ببنە شت، تۆ قەت داخت ناچێ کە گەڕەکی سەرێ بەو گەڕەکەی نگۆ دەڵێن: گەڕەکی قەرەجو قەحپەو گەوادان.. لە تاو ئەم قسەیە بوو یان نەهاتنەوەی هەمین هەستت کرد کەسێك بە دە پەنجەی ئاسنینەوە چنگ لە هەناوت گیر دەکاو، وای لەو دڵ خاوبوونەوە کتو پڕە، ئێستا لێرە بووایە هەندی بلێی یەكو دوو کتلیەکەی دەخستە سەر ئاگر، لەسەر چیچکان دادەنیشتو پەمپی لە پرێمزەکە دەدا، دەستو برد دوو سێ نانی دەرشاند، پێی دەوتی: سەرخەوێ بشکێنەو هەنووکە بانگت دەکەم، ئەو جلانەشت بگۆڕە، قوڕو چلپاوی زۆری پێوەیە، بۆنی لیسو دووکەڵ، دوێنێ شەو بیرم چوو کیسە توتنەکەت بۆ بدوورمەوە، پارچەیەك لە کراسەکەم ماوەتەوە، دوێنێ قارسم کردو تۆزێکم

لەبەر بڕی، دامەنی لەبەر پێیانم دەخشا، با هەر کە سیغارێکت پێچایەوە ئەمنت لە بیر بی، تا هەنووکە کیسە تووتنێکی تۆ نەبووە کە لە تیلمە کراسێکی هەمین نەبووبێ، هەفتەیەکە پێت دەڵێ: چاو کونەسوژن ئەو تەنکە ردێنە عەرەبییەت خشت کەوە، ئەتوو لە خەمی ردێنی منداى، ئەمنیش لە خەمی ئەو رەشۆڵانەم کە لە ئاسمان قەتارە دەبەستن و نانیشنەوە.. یان لە دوور تۆڕەکەی منەوە دەنیشنەوە، دانەوێڵە رۆکراوەکان هەڵدەگرنەوە بێ ئەوەی دەنووکیان بەر زەوی بکەوێ، لەوە دەچێ ئەوساڵ بە فڕوفێڵی تازەوە سەریان لە هێلکە جووقابێ، کە هاتەوە پێی دەڵێم: هەمین سەیری ئەم تۆڕە پڕە بکە.. تەواو.. چیدیکە مەچووە بەر دەرکی ئاغا و بەگزادەکان، ئەمن حەیفم لێ دێ، دواجار گرتی.. راو بەختەو نێوچەوان، تۆڵەی هەر دەنکە گەنمێکم لێ کردنەوە، خۆ شەقم برد، مانگێکە خۆ لەو قۆرتەی دەشارمەوەو ناهێڵم مووی سەریشم دیاربێ، نەء، راوی من هونەرە، شەیتانیش وەکی من تۆڕەکەی ناشاریتەوە، هەمین ئەگەر رۆژێکیان بتبەمە سەر تۆڕەکەش بە خۆت نازانی، سەیریان مەکە ئەوەندە گجکەلۆکەن، گەلەك بیژیو حەرامزادەن.. قەتیش تێر نابن...

دە وەرەوە هەمین.. با مزگێنی ئەمشەوت بدەمێ.. دە دوانزە ریشۆڵە سەربڕەو مەنجەڵە ئاوێك گەرم کە، سبەینێ یا شێخ پێ بزانێ هەر زوو بە زوو داوای زەکات دەکا، لە چلان یەکە دەرویش، لە چل درهەم: درهەمێك، لە چل دینار: دینارێك.. لە چل لیرە: لیرەیەك.. یا شێخ ئەوە کووە کەس ملی چەلەبی ناگری لۆ زەکاتی؟.. ئەو بەشکو حەزی لە جەهەندەم بێ، ئای یا شێخ..

---

هـــەمووتان یـــەك حیســـابن، وەك كـــەر گوێمـــان رادەكێشـــن و دەمانڕەتێنن، ئـەویش هاوینـان بە یـەك دوو شكارتە قەناعـەتم پـێ دەكا ئـەم دەشـت و دەرەی بۆ بكـەم بە گنـدۆرەو تـەرۆزی، یا شێخ دەكرێ پرسـیارێك بكـەم، ئـا.. دەباشـە ئـەتوو دەزانـی بەشـە هـەقی ئـەو لـە مـن زیـاترە، ئـەمن زەوی‌یەكـەی خـۆش دەكـەم، دەیكـێڵم، بـژاری دەكـەم، تـۆوی دەكـەم، ئـەمنم كـە لـە بـەر چـرقەی هـەتاوی هاوینـدا دەسـووتێم، لـە بـەیانی تـا ئێـوارە لـە گـەڵا و گـوڵ و لاچكە سـەوزەكانی بڕكـە گنـدۆرە و تەرۆزی‌یـەكان ورد دەبمـەوە، ئـەو رۆژانـەی گـوڵ دەردەكـەن ئـەمن شاگەشـكە دەبم، كـە رەشـەبایەك هەڵدەكا حەز دەكەم ببمە شوورەی هەموو گوڵەكان، نەبا یـەكێكیان هەڵبوەرێ، كە بە (چەلەبی)م دەگۆت: ئەو گوڵانـە لـە گوڵـەكانی نـاو باخچـەكەی تـوو جوانترن، بـە عـەقڵم پـێ دەكـەنی، كەچـی وەختـێ هـەموو شـتێك پـێ دەگـا، ئـەو بەشـی شـێر دەبـا و ئـەمنیش بەشـی رێـوی، خـۆ ئەگـەر ئـەو زەكـات بدا نیـوەی برسی‌یەكانی هـەولێرێ تێـر دەبـن، دەسـت لـە ئیشـوكاری خـودای مـەدە دەروێـش، ئـەو زەكـاتی خـۆی دایتـە تەكیـە، بیریشـت نەچـی كـە زەوی‌یەكـەو تۆوەكـەو تراكتۆرەكـە هـی خۆیـەتی، لـە كـوێ‌ی بـوو؟ لـە بـاب و باپیرانـەوە لـۆی مایتـەوە، ئـەوە لـۆ ئـەمن نیمـە؟ دەروێـش دەسـتت كـردەوە بــە كــوفركردن؟!، ئـــەی ئارەقـــەو ســـووتانی مـــن؟ لـــە بەیانی‌یەوە تا ئێوارێ دڕك و داڵ و گیاكەڵە لەو خاكە بژار دەكەم، نەبا لە رەگ و بڕكە گندۆرەكانم بخۆن، نەبا سیس و بێ تام و بۆ بن، چـەلەبی ئاگـای لـەوە نی‌یـە لـە رۆژێكـدا چـەند مـارو دووپشـك دەكوژم، هێ‌ی دەروێش هـەر رۆژێكـەو مارێك بە دەستتەوە دەداو

هـەر لـە جـێوە بـێ ئـەوەی کەسـێك ئاگـای لـێ بـێ دەپـەنمێ‌ی، دەمریـت، گندۆرەیـەك دەبـێ بـە سـەرینت، لـەو دەشـتە چـۆڵە رادەکشـێ‌ی، گـەڵاو پنچـك دەبـن بـە رایـەخت، شـەو دادێو ناگەڕێیتـەوە، هـەمین بـە هەڵـەداوان پیـاوانی گـەڕەك کۆ دەکاتـەوە، هەریـەکەو دەست دەداتە چرایەك‌و هەمین لە پێشەوە، دڵی ختوورە دەکا و دەگری، پیاوان کپ‌و بێ دەنگ‌و سام لـێ نیشـتوو روو لـەو دەشـتە دەکـەن، ئـەو هـەردو شـیوە.. هـەنگاوی پـڕ تـرس‌و خێـرا دەنێن تا دەگەنـە نێـو بێسـتانی تـازە سـەوز، بـۆنی خـاك‌و تـرۆزی‌و کاڵەك‌و شەمامە لە کەللەیان دەدا، لە تاو تـرس‌و لـە پـای گـەڕان بـە دوای تـۆدا مانـدووو برسـی دەبـن.. تینـوو.. حـەز دەکـەن بنووشتێنەوەو گندۆرەو تەرۆزی لە بڕکان بکەنەوەو بیخۆن، وەلـێ شـەرم دەیـانگرێ، دێنـە ژێـر کەپرەکـەت، تـەنها شـەربەیەك ئـاوی سازگارو جامێکی قوپـاو لەوێیـە، کـڵاوو جەمـەدانی، قۆری‌یـەکی رەش داگەڕاو، کۆنە لبادێکی دڕاوو تۆز لـێ نیشتوو، بە چراوە بە چوار دەوری کەپرەکەدا دەگەڕێن، بـڵاو دەبنـەوە، ئـەو شـەوە مـانگ بـە دەرەوە نابـێ، رەنگـە رەشـەبا بـێ‌و هەنـدێ لـە فانووسـەکان بکوژێنـەوە، پیـاوان دایـان دەگیرسـێنن‌و دەکوژێنـەوە، لەوەدایـە چراکان بەر ببنەوەو بشکێن‌و گڕ بەو ناوەدا پـەرت بـێ‌و پـووش‌و پەڵاشی دەشت ئاگری تێ بەر بێ، لە ترسی رەشەبا چراکان خەفە دەکرێن، رۆناهی‌یەکی زەرد پێشیان دەکەوێ‌و تـاریکی راو دەنـێ، دەگەڕێن.. ژێر گەڵا و پنچکی پـەل هاویشـتوو دەپشکنن، تـۆ نیـت، لـە سـەد لاوە سـێبەری پنچـکەکان بەسـەر یەکدیـدا دەشـکێن‌و دەتوێنـەوە، لـە حەژمـەتانا پـێ لـە گنـدۆرەو تەرۆزی‌یـەکان دەنـێن،

---

ئـاوێکی سـاردو زەردبـاو لـە ژێـر پێیـان فیچـقە دەکـا، لـە ئاسمانیشـەوە چـریکەی غـەمگینی قـەتارەی مەلـە کۆچـەرییەکان دەگاتە گوێی هەمووان، وەك ئەوەی شین بکەن، دەگەڕێن و تۆ هەر دیار نیت، هـەمین بـە پـێ خاوسی بـە نێو دڕك و داڵی بێستانەکە رادەکا، بـە هـەموو لایەکدا غار دەدا، هـۆ بـایز.. هـۆ بـایز.. کورە ئـەتوو لـە کێنـدەری؟ دە دەنگ هـەڵبڕە.. خوداوەنـدی مـیری مـەزن، ئـەتوو بـایزۆکی لـە مـن مەسـتینە، کـە ئـەتووم لـێ بـزر بـی مـردن خۆشترە لەوێ ژیانێ، باز لە هیچ کوێ ناحەسێتەوە تا نەچێتەوە سەر هێلانێ، ئەمن ئەوڕۆ بەتـەمات بووم، سنگی خۆمت لە بۆ بە سێ بەنگی بکەم، شۆخیان بدەم ئەو قەرە زولفانەی وا لە خـەنێ، نا سینەی من لۆ تـوو دەیکەمـەوە بە دەفتـەر خانـێ، چاوانیشم بە ساقی وەختـی شـەراب گێڕانـێ، نـا.. دە بـا سینەی من بە پـەنیری توو بی، وەختێ پارو لێدانێ، بەڵکو بحەسێتەوە لە ئیشـی گرانـی ئـەم دەشـت و چـۆڵەوانی و بـەڕیانێ، لێـرە لـە بـۆ ئـەوێ تاودانـە، چـەندەها دڕك لـە هـەردوو پێیـەکانی دەچەقن، چـەندین گنـدۆرەو تـەرۆزی لـە ژێـر پێیـەکانی دەپلیشـێنەوەو دەتـەقن، هەسـتی پـێ ناکـات و هـەر رادەکـات، خـوێن لەسـەر برکـەکان و پنچـکەکان جـێ دەمێنـێ، دەداتـە پڕمـەی گریـان، گریـانێکی بـە کـوڵ، بـەو دەشـتە چـۆڵەدا هـەر رۆینـەو مـل نـان، باڵنـدەکان لـە ترسـی ئـەو گریانـە هێلانـەکانیان چـۆڵ دەکـەن، بـەرەو تاریکـایی ئاسمـان هەڵـدەفڕن، مـارو مێروولـەو زینـدەوەری ئـەو دەشـتە دەتاسـێن، بـە ژێـر پنچـکەکاندا دەخشـن و لـە کونێکـەوە دەردێـن و خـۆ لـە درزێکـی دیکەدا دەشارنەوە، پیاوانی گەڕەکیش، گەڕەکی ماندوو دەست بە

چراوە لە تۆ دەگەڕێن و ناتدۆزنەوە، دەگەڕێن و تۆ هەر نیت.. لەپڕ هەمین بە دەم بای غارەوە پێ لە دڵت دەنێ، دڵێك كە لەو ناوەدا كەوتووەو هەر لە شەمامەیەكی خوێناوی دەچێ، ئەو دڵەی بۆ هەمین خوێنی تێدا دەگەڕاو بۆ چاوانی ئەو حەیران و لاوك و بەستەی دەچڕی، دەتاسێ و چراكە فڕێ دەداو لەسەر سینەت رادەكشێ، راتدەكێنێ، دەیەوێ چراكە هەڵبگرێتەوەو لە چاوانتی نزیك بخاتەوە، چرا كوژاوەتەوە، هاوار دەكا، دەروێش.. هۆ دەروێش بایز.. شیوەن دەكاو زیاتر بۆت دەگری و فرمێسكەكانی دەڕژێنە نێو دەمی كراوەت، تۆش ئاگات لەو نی‌یە.. تۆ.. تۆ بڵێی ئەوە راستی بێ یان خەونە؟ بڕوا بە چاوەكانی خۆت بكەی یا نا؟ لە نهێنی و لەغزی پڕ لە سیحری خەونێك دەچێ، بەرانپیل و چارۆگەكەی گرمۆڵە دەكا و دەیخاتە ژێر سەرت، سەری شكاوت، ئەم هەر دەگری و تۆ نازانیت، دەم دەخاتە نێو دەمی ساردو وشكەوەبووت، ئەو دەمو لێوەی جاران بە ماچێكی ئەو دەبوون بە پەنگرو دەسووتان، ئەو زەمانەی تۆش سمێڵی خورماییت بخستایەتە سەر كوڵمەی پڕ لە گوڵی لە حەوت مەرگ بووایە راست دەبۆوە، سەر لە بن گوێت دەنێ و هاوار دەكا، چما تۆ گوێت لەو دەنگە خۆشەویست و پڕ خەمە نی‌یە؟ سەرت كێل دەكاتەوەو لە باوەشێت دەكا، ئەتوو لۆ وات لێ هات دەروێش.. ئاخر ئەمن دوعام لۆ كردی كە ئاگادارت بێ ئەلیاسی لە زەریاو خدری زیندەی وا لە چۆڵ و سارایە، ئاخر ئەمن بە ئەمانەت ئەتووم دا بەوەكاشەو حەزرەتی وەیسەل قەرەنی‌یە، وەك كۆرپەلەی ساوا راتدەژەنێ، لە ژێر رۆناهی‌یەكی كەمێ شین باو چاوت بە هەردوو

چاوانی دەکەوێ، وای لە خۆم وایێ.. سەر بە هەشێ.. ماڵ وێرانێ.. قەت کەسم نەما.. ئەوە خۆ هەر دوو چاوەکانی دەرهاتوون.. خوراون.. نەماون.. ئەو چاوانەی بە بەژن و باڵای هەمینێدا دەیانڕوانی، پتر دەتاسێ و خۆڵ و کەستەکی بێستانەکە بەسەری خۆیدا دەکا، پیاوان شێتانەو بە هەڵەداوان دەگەنە کنی.. دەستی دەگرن.. دەکەونە سەرچۆك.. سەیری چاوانی دەکەن.. بە خەم و ترسەوە دەڵێن:

(داڵ و قەلەڕەش چاوەکانیان هەڵکۆڵیوە..!)

تۆ مردوویت و ئەوان وا دەڵێن، ڕەش داگەڕاوە، ڕەنگە مارێك لە نیوەڕۆوە پێوەی دابێ، نا نەمردووی.. گەرمای هاوین ئەوەندە لە تەوقە سەری داوی گێژو بێ هۆش کەوتوویت، ناکرێ بمریت، هەمین تەنیا لەو دونیایەی جێ دەمێنێ، خۆی و کەلاوەو مانگایەکی لەڕو چەند مریشکێك و جووجەڵەیەك لە دوای تۆ هەر هەموو بە تەنیا جێ دەمێنن، شەوانە کەس نابێ حەیران و لاوك بۆ هەمین بچڕێ، لە بەر هەیوانەکە دادەنیشێ، سەر بۆ ئەو پارچە ئاسمانە رووت و لێڵە هەڵدەبڕێ، ئەو ئاسمانەی لە حەوشە چکۆلانەکەوە وەدیار دەکەوێ، چاوی هەمینێ دەڵێی کۆترەو لێی ونبووە هێلانە، یان بەرخە کۆرپەلەی دوای مێگەلانە، لە دار هەنارە زڕەکە دەڕوانێ و هۆن هۆن دەگری، نەکەی دەرویش وا زوو بمری، دەنا بۆ یەکجاری و لە بێ چارەیی تا ماوە هەمین دەبێ بە کارەکەری چەلەبی و بەگلەران، بکەوە دوای بە هەژاری و عەودالی، با لە دوات جێ نەمێنێ باڵای بڵندو بەژنی هیلاکی، یان دەبێتە جل شۆری ماڵی یەکێ لەو ئاغایانەی وەختی خۆی حەزیان لێ

دەكرد، لیكیان دەكرد، بە یادی جوانی و جحێڵی ئەوسا یەكێكیان پەلاماری بدات تۆ لە گۆڕەكەتدا رادەچەنی، تۆ نامێنی تا بە تیغێك.. تیغێكی كول وەك رەشۆڵە سەری لە ملی جیا بكەیتەوە، ژنێكی بێ كەس و هیلاك و بەستەزمان چی پێ دەكرێ؟ لە حەوت مەرگدا بی دەتەوێ زیندوو بیتەوە، وەك منداڵێكی ترسنۆك كە خەونێكی ناخۆش ببینێ رادەچەنیت.. پڕ بەو ساكە دەشتە.. پڕ بە گۆڕو گۆڕستانەكە هاوار دەكەی:

(ئیدی پیر بووین.. دە وازمان لێ بینن..!)

چەندەها جار خەون و خولیا و خەیاڵ و ترسی هەردووكتان تێكەڵ دەبێت، چەندەها شەو بە جووتە لە خەو رادەبن، ها چی بوو؟ خەونێكی ناخۆشم دی بایز.. هی من لە هی تووش ناخۆشترە هەمین، وەك دوو گیانداری دیلی نێو قەفەزێك دەخزێنە پاڵ یەكدی، ئەم بەیانی‌یە وەك زۆر لە بەیانیانی دیكە هەمین لە تاو هاواری تۆ راچڵەكی و لە ترسانا پیاڵەیەك بە دەستی‌یەوە شكاو سەری پەنجەی شایەتمانەی زامار بوو، هەر شەوەی یەكێكتان لە هاوارو ناڵەی ئەو دیكە دەتاسێ و دووچاری دڵەخورپێ دەبێ، هەمیشە وایە خەوو زیندە خەونەكانتان تێكەڵ دەبن، هەر دەڵێی ئەو خەونێ دەبینێ و تۆ بۆی تەواو دەكەی، ئەو هاوارەی لە قورگی تۆدا دەتاسێ، هەمین ئاسمانی پێ دەهەژێنێ..

چاوان دەكەیتەوە.. هەر هەموو ماڵەكە لە تاریكیدا غەرقە، نە هەمین دیارەو نە چراكەی، نە پیاوانی گەڕەك و نە هات و هاواری مناڵ و مەزن، نە رەشەبایە و نە پنچك و بڕكی گندۆرە و تەرۆزی نێو بێستانەكان دیارن، بێ ناز لە ژوورەكەتدا كەوتووی، نە ماران گاز

بوویت و نە هەتاو سووتێن، تەواوێ سەرماتە، درەنگی کردو هەمین هەر بزرە، قەت وا دوا نەکەوتووە، تۆ بڵێی ماڵی چەلەبی یان سمایل بەگ میوانیان هەبووبێ؟ هەر ئێوارەیەك میوانیان زۆر بێ، ژنە تەمبەڵەکانیان هەمینت لێ گل دەدەنەوە، چەند جارت پێت گوتووە هەمین لەمەودوا بەر لەوەی تاریك دابێ وەرەوە، مەترسە بایز.. ئەدی کەفیەت و مەسلەتیمان نەکرد؟ لە هەرەشەو گورەشەی خدری برام مەترسێ.. تازە هەردوو لامان پیر بووین، نا هەمین.. هەنووکەش ترسم هەر هەیە.. خدری برات لە کن ردێن سپییەکانی عەشیرەت پێی گۆتم: بایز ئەتوو سێی ساڵە نامووسی مەت بردییەو.. خوشکی مە دەتەقێنییەوە، مەترسێ.. خدر پیر بووەو هێزو شەنگی جارانی نییە دوژمنایەتیت بکات.. خۆ دەزانم هەر چوار براکەت لە بەردەم ردێن سپییەکان و پیاوماقووڵ و بابە شێخ و سێ مەلایان تەڵاقیان فڕێدا کە چیدیکە هەقیان بە سەرمانەوە نییە، ئەوەندەی شێخ کردی و کۆشای هیچ کام لە براکان و خزمەکانت ماچیان نەکردم، مەلاش تکای کردو ردێن سپییەکان پاڕانەوە، ئەگەر حەز دەکەن هەمینێ ببینن دەیهینمە کنتان.. یان ئەنگۆ وەرنە کنی.. ورتەیان نەکرد.. خدر دووبارەی دەکردەوە: یا شێخ وەسیەتی بابمان دەستی هەموومانی بەستەوە دەنا هەندە بێ غیرەت نین، خۆ شەرەف قوماش نییە لەگەر زەمانەدا رەنگی بچیتەوە.. لە سەرەمەرگداو بە دەم قرخەقرخی مەرگەوە پێی گۆتین: (وازیان لێ بینن کورەکانم.. تازە ئەوانیش پیر بوون)، تۆ بڵێی لەو کۆتایی عومرەدا زەفەری پێ ببەن و بیکوژن، جا خۆ نەمانی هەمینێ بۆ تۆ

باسی سەرە، تا دەهات شەوی ساردتر دەکردو بایەکەش دەبوو بە لوورە، چراکەش کوژا بۆوە، بێ هەمینێ، ماڵ، دەتوت بۆتە چۆڵو سارا، سەد ساڵە هەمینت لێ بۆتە قاتی، بە دەست کوتان شقارتەکەت لە دەلاقەکە دۆزییەوە، بە دەستو پەنجەیەکی لەرزۆکەوە دەنکێکت دەرهانیو ئاگرت دا، دەیەها تارمایی رژانە سەر دارو دیوارەکان، بەر لەوەی گڕی لە رزیوی دەنکە شقارتەکە بکوژێتەوە دەستت بۆ فانووسی قەد دیوارەکە بردو بە پەلە داتگرت، فریا نەکەوتی شووشەکە هەڵبڕیو کوژایەوە، دەنکێکی دیکەت ئاگر دا، فانووسەکە گڕێکی زەردی بە نێو ژوورەکەدا رژاند، هێدی هێدی بەرچاوی کزت روون بۆوە، لە ترسانا چی لامپاو فانووسو قەندیل لە ماڵەکە هەبوون هەر هەموویانت داگیرساند، رووناک نەدەبۆوە: دڵت.. تاریک بوون: چاوەکانت.. زۆپاکەت گڕ دا تا بتوانی سەرماو ترس لەو ماڵە دەربکەی، دەتوت: کڵۆ کڵۆ سەهۆڵ لە نێو هەناوتا دەتوێتەوە، هەردوو ناو لەپی چڵکنو شەقار شەقارت لەسەر زۆپاکە راگرت، تاوێ گەرم بوونەوە، خوێنێکی گەرمتر بە هەردوو باسکتدا گەڕا، لە کاریتەو شەقڵەو حەسیری رزیوی بنمیچەکە ورد بوویتەوە، هەر چوار دیواری نەخشین بە دڵۆپەو لیسو تەنی، دوو لا دیوار خراپ سکیان دابوو، بە موعجیزە وەستا بوون، دووان لە کاریتەکان درزی قەبەیان تێ کەوتبوو، درزێکیان ترسی خستبووە دڵی هەمین، بایزیش بێ باك، ئەگەر داتەپی ئەوە هەردووکمان: کەرەکە خۆش، بە یەکەوە دەمرین، جا لە ژێر کاریتەو شەقڵەی رزیودا بمرین؟ داخوا کاممان لە پێش ئەوی دیکەدا دەمرین؟ کە ئیشت

نەبوو یان باسی مردن دەکەی یان گەمە لەگەڵ گونت دەکەی، لە بەر خۆتەوە خەنیتەوە.. کەچە لبادەکەت راکێشایە بەردەمی زۆپاکەو کیسەی تووتنەکەت دەرهانی، ئەگەر نەهاتەوە تا ئەو سیغارە دەپێچمەوە دەرۆمو لە دووی دەگەڕێم، گرمەی گەواڵەیەك رایچڵەکاندی.. خودایە بێ ئافات بێ.. خودایە نەکەی.. هەنووکە هەمین لە رێیە، سەرێکت هەڵبڕیو بەسەر دیوارەکەی بەرامبەرتەوە لە زەرگو شمشێرو دەفەکە رامای، ویستت تا پێت دەکرێ درەنگ سیغارەکە بپێچیتەوە، لە شمشێرو زەرگەکە رامایتەوە، چەندەها جار ئەو شمشێرەت بە سكو ملی خۆتدا داهێناوە، بە تۆزێك خۆڵ جێ برینەکەی سارێژ بۆتەوە، چەندەها جار ئەو زەرگە تیژەت لە لا لغاوەی خۆت داوە.. لەولا روومەت بۆ ئەولا کون بە دەرت کردووە، بە دەم دەف لێدانەوە کەوتوویتە ویردو سەڵەوات، لە زیکرو تەهلیلەدا خەمی خۆتو هەمینو راوە ریشۆڵەو ترسی بابە شێخو زوڵمی چەلەبیو تارمایی ئاغاو براکانی هەمینت بزر دەکرد، حەجمانت لە بەر دەبڕا، هێی دەروێش تۆو تەکیەو زیکرو تەهلیلەو زەرکو شمشێر لە خۆ دانیان نەگوتووە، زەمانە لێی خۆش هێنای، لەسەر یەك پەنجە سەمات بە دەفەکە دەکرد، وا توندو دڵگەرمانە دەتکوتا کە هەموو گەرەك گوێی لێ بێ، هەر دەتووت شریقەی باڵی هەزاران مەلە، سەدای حەی حەی تۆ لە هیچیانی نەدەکرد، چ دەروێشێك دەیتوانی گوێ لە دەفەکە بگرێو عاقڵ دابنیشێ، هەر دەبوو سەرو مل با بدات، بێ ئاگا لە خۆیان هەڵدەستانە سەر پاشووان، زیکرێك تۆی تیا نەبووایە ساردو سڕ بوو، تا تۆ دەفەکەت

نەگرتایەتـە دەسـت دەروێشـەکانی دیکـە وەك کۆمـەڵێ پیرەژنـی بێهێزو شەنگ لە خۆیان دەدا، ئەو دەفە چ سیحرێکە کە تەنها بۆ دڵـی گـەرمی خـۆتی لـێ دەدەی، گەرەکتـە وڕوکـاس ببیـت، لـەم دونیای دوونە غەیب بیت، زرم و کوت و هاڕەی دەف، زرنگانـەوەی پڵپڵەکانی ترس و خەم لە دڵتا راودەنێ، ئازاترت دەکا، ئیدی سڕ دەبیت، با بێن براکانی و هەنووکە بتکوژن، نە گوللە دەتبڕێ و نە تیغ بریندارت دەکات، سووك هەڵدەفڕیت و گران دەکەوتیتەوە سەر زەوی، سـەمایەکی دەروێشـانە، دەگریایـت و شـێتانە هـەردوو پاژنەی پێت لە زەوی دەکوتا، وەك یەکێك لە ریشۆڵە سووکەکانت کە رەشەبا هەڵی دا باڵت دەگرت، لەو سەرەوە، لە ئاسمانەوە کە دادەبەزیتە سەر ئەرز وا بە تاو پاژنەت بە زەوی‌دا دەکوتی وەك بڵێی بتەوێ زەوی شەق بکەیت و لە ترسی غەدری زەمانە خۆتی تیا حەشار بدەی، خۆت لە چەلەبی و ئاغا و براکانی هـەمین و سـڵێوە.. شـەیتانەکانی شار بشاریتەوە، ئیدی تەواو.. تا کەی سەرما و برسیەتی و راوەدوونانی ریشۆڵە بەستەزمانەکان، ئاخۆ پـاروەو نانێـك و ترسـی مـەرگ ئـەو هـەموو ئەزیەتـە دێنـێ؟ رادەکشـایت و بـێ باکانـە، بـێ بەزەییانـە ملـی باریـك و دەمـاراوی خۆت دەخستە بەر تیغی شمشێر، چ تامێکی سەیرو عەجایبت لەو ئازارو تکە خوێنانە دەبینی؟، هەر تکە خوێنێك هی رۆژێکی پـڕ مەینـەتی و ترسـە کـە دەڕژێ، دەڕژێتـە سـەر خـاك و خـاکیش هەڵیدەمـژێ، تـا لەشـت گـەرم دابـێ تـرس و سـامت لـە لا نامێنـێ، هەموو شتێك لە بەر چاوانت ون دەبێ، دەبێ بە تارمایی و نامێنێ، کە کەللەت گـەرم دادێ دەفەکە دەبێ بە دڵۆپێك ئاوو لەسەر یەك

پەنجـەت دەوەسـتێ، کـە بـە نـاو لـەپ و سـەری پەنجـەکانت لـە ناوەڕاستو ڕۆخـی دەفەکە دەدەی هـەزاران دەنگو سەداو زەناو هـاوارو ناڵـەو زریکـە بـەرپا دەبـێ، دەروێشـەکانی دیکـە خـودا لـە هاڕەی دەفەکەی تۆدا دەبینن، لە سەماو پێ کوتانی شێتانەت، کە حاڵەکـە دەتگـرێ، هـەردوو بنـە پێـت بـەر زەوییەکـە ناکـەون، ئارەقـەش زەنگـۆڵ زەنگـۆڵ بـە دەموچـاوو سـەرو سمـێڵو سـینە تووکنەکەتـدا دێتـە خـوارێ، دەڕژێتـە بـەر پـێی دەروێشـان، تەنکە تۆزێـك بـەرز دەبێتـەوە، وا بـە تـاو بـە چـوار دەوری خۆتـدا خـول دەخوێـت، لـەو تـەپ و تـۆزەی بـەر پێـت، لـەو نەرمـە گڤـەی (بـا)ی دەوری باڵات گەردەلوولێك ئـەو ناوەی دادەگرت، دەنگـی دەفـەکان تێکـەڵ بـە هـەیاهووی دەروێشـەکان دەبـوو، بـە یەکـەوە کێوییانـە دەتاننرکانـد، وەك کۆمـەڵێ مـاری تـووڕە دەتانفیشـکاند، وەك ڕەشەبایەك بە نێـو جەنگەڵدا گـوزەر بکا وژەتـان دەهـات، بـە چـوار دەوری یەکدیـدا لـە سـەماو پێکوتـانو بـاڵگرتنو سـەربادان نەدەکەوتن، سینەی تووکنیان لە ئارەقدا شەلاڵ.. قژی ڕەشو پڕو درێژیان تا سەر شانو مل مەوجی دەدا، باسکی ڕەش وەك ئـەوەی بـە تـەنیمۆك سـواغ درابـن، هەنـدێکیان تـا ئـەژنۆیان بەلـەکیان لـێ ڕووت کردبـوو، بـەو سـەمای زیکـرە شـادەماری بەلـەکیان ڕەپ دەبوون، وەك شێت سینە واڵا، تـاوێ بـۆ پێشـەوەو تـاوێ بـۆ دواوە جۆلانەیان بە خۆیان دەکرد، لە ناوقەد بەسەرەوە بە هەر چوار لادا دەشـکانەوە، وا پێیـان لـە زەوی دەکوتـا وەك ئـەوەی بیانـەوێ ئـاو لەو خاکە ڕەقەنییە دەربێنن، ژنان لە سەربانەکان بە شەرمەوە لـەو پیـاوە نیوە ڕووتانـە رادەمـان، پیاوەکـانی بابـە شێخ، جاروبـار، لـە

ژنەکان و کچەکانیان دەخوری‌یەوە کە بچنەوە نێو حەوشەکان چونکێ نەزەریان حەرامە، دەروێشەکان دەیانقریشکاند، لە قەهری شتێکی دیکە هاواریان ئاسمانی پڕ دەکرد، نەك بە تەنها لە ترسی خودا، لە ترسی شتێکی زۆر نادیارو پەنهان، بۆنی نێرینە لە هەلاوی هەناسەو ئارەقەی بن باڵیان دەهات، تاو تاوێ خامۆش‌و پاشان قیژەو قریشکەی لەناکاو، وەك قریشکەی درەختێك کە لە ناو قەدەوە تەورداسێك لەتی بکات، سێبەرەکان تێکەڵ دەبوون‌و پاشان پەرت دەبوونەوە، دەچوویتە ناوەڕاست‌و شوورەیان بە دەوردا دەکردی، وا تیژو خێرا خولت دەخوارد کە تەماشاکەرانی سەر تاق‌و دیوارو سەربانەکان، بە ژن‌و پیاوەوە، بە پیرو منالەوە، دەترسان لەوەی لەگەڵ گەردەلوولەکەدا بەرەو بەرزایی ئاسمان هەلفڕیت‌و نەیەیتەوە، دەنێو هەورەکاندا، لە ژێر شینایی ئاسماندا خۆت بشاریتەوە، ببیت بە ئەستێرەو شەوانە بە دزییەوە بێیتەوە سەربانی کەلاوەکەی خۆتان، ببیتەوە بە ئادەمی.. بە پیاو.. بە دەروێش بایز.. بچیتەوە باخەڵی هەمینێ، تێر لەسەر سینەی ماندووی بخەویت، تاریکی ئاسمانان لە خۆت داتەکێنی، ئەوساکە کە تێرت دەخوارد لە بۆنی سینەو مەمکانی، کە پڕ بە سی‌یەکانت خۆڵ‌و تۆزی سەر ئەگریجەو بسکەکانیت هەڵدەمژی، ئەوسا لە ترسی برسیەتی‌و چەلەبی‌و ئاغاکان‌و براکانی هەمین دەبوویتەوە بە ئەستێرە، تا شەوێکی دیکەو ژوانێکی دیکە، گەر ببیت بە ئەستێرەش کەس ناتکوژێ، کەس دەستی ناتگاتێ، هەمین تاوەکو بەرەبەیان لە جریوە جریوت رادەمێنێ، تا بەرەبەیان پڕشنگی کزو کەمت دەڕژێتە سەر ئەو کەلاوەی هەمین بە تەنیا تیا

خەوتووە، ناو حەوشە رووناك دەكەیتەوە، تروسكەت دزە دەكاتو دەگاتـە بنـە بـانی كـۆلیتی مریشـكەكان، دزە دەكـا تـا نـاو دڵـی هەمینێ، وای لە تۆ ئەو وەختەی بە دڵ دەفەكە لێ دەدەیتو خۆت هەڵدەدەی، بە دەوری خۆتدا خول دەخۆیتو.. وا هەست دەكەیت تۆزێكی دیكەیەو دەفڕیتە ناو یەكێك لە شانشینی هەسارەكان.. نا.. ئەستێرەكان.. دەفڕیتە تاقی ئاسمان.. یان دەبی بە چۆلەكە، هـەڵۆ، بـاز، قەڵـەڕەش.. نـا.. رەنگە ببـی بـە ریشـۆڵەو دەنێـو رەوە ریشۆڵەیەكی گەورەدا ون ببی، ئەوسا كابرایەكی وەك خۆت كڵۆڵ، كڵۆڵتر لە خۆت، تۆزێك گەنمو جۆت بۆ هەڵدەڕێژێ، گەنمو جۆیەك تێكەڵ بە زیوانێكی زۆر، تۆ وەك هەنووكە برسـیو مانـدوویت، لـە ئاسمـانی پـڕ هـەورو زەوی رووتـی بـەر لێزمـەی بـاران هـیچ بـەدی ناكـەیت، بـە ناچـاری لەگـەڵ پۆلـە ریشـۆڵەیەكی زۆر پـانو پـۆڕدا هەڵدەنیشـی، راوچـی چـاوەڕێی راوێكـی زۆر بـەخێرو بێـرە، هەلێكەو رەخساوە، نایبوێرێ، سەری گوریسەكە لە نێو چنگیدا ئارەقە دەكات، تـەڕو لـووسو گـەرم دەبێ، زۆر تونـد.. بـە هـەموو هێزو توانای خۆیەوە گوریسـەكە رادەكێشـێ، هـەر هـەموو ریشـۆڵە لەعنەتیـەكان سـركو زوو هەڵـدەفڕن، تـەنیا تـۆ نـەبێ.. دەرویـش بایز.. دەروێشێكی ریشۆڵە.. ریشۆڵەیەكی دەروێش.. هـەر خۆت بە تەنیا بە تۆڕەكەوە دەبی، ریشـۆڵەیەكی هەناسەسـوارو مانـدوو، دەروێشێكی پیرو برسیو بە ساڵاچوو، راوچییەكەش لە تـۆ پـیرو هیلاكو برسی تر، زستانێكی ساردو بەفران بار، دەشتێكی چۆڵو خامۆشو تـەڕ، تـۆڕێكی گـەورەو پـانو پـۆڕ.. تـەنیا تـۆ.. بـە تـەنیا خـۆت دەكەویتـە نـاو تـۆڕێكی گـەلێ گـەورە، دەبێ وابێ..؟ ئـاخۆ

دەکرێ..؟ بۆ ناکرێ؟ سەفەرێکیان هەر خۆت کتو مت وات لێ بەسەرهات، بە هەزاران ریشۆڵە وەك کوێرو گێژ دابەزین، وەك ئەوەی دەستێکی غەیبی لە ئاسمانێکی دیکەوە هەڵی دابن، سێ راوچی دیکەش لە دوورەوە، بە بەغالەتەوە، تێیان دەڕوانی، کەچی رەوەیەکی مەزن.. فرەپان.. رەوە ریشۆڵەیەکی زۆڵو گاڵتەجاڕ هاتنو بەسەر تۆڕەکەی تۆدا نیشتنەوە، کە هاتن نیوەی ئاسمان رەش دەچۆوە، ورشەو فڕکەفڕکی باڵیان، هەزاران باڵ کە پیاو کاس بکات، مەستانە خۆیان بۆ زەوی نەوی دەکردو باڵیان شل دەکرد، هەر هەموو بە یەکەوە لە مەلێکی زەبەللاح دەچوون، بەفریش پروشەی دەکرد، کلووە بەفری سپیو رەشی ئەو رەوە ریشۆڵە قەبەیە ئاگریان لە دڵی تۆدا کردەوە، ئەوەندەی نەمابوو لە خۆشیانا دڵت هەڵقەنێو دەرپەڕێتە نێو دەمت، ئەو رەوە شێتە بەسەر سەری سێ راوچیدا هەڵفڕین، تێپەڕینو هاتنە سەر تۆڕەکەی تۆو نیشتنەوە، دەیانخواردو بە قوونەقوون هەڵدەبەزینەوە، بۆ ماوەیەك میوانداریت کردن، دەتخواست ئەوەندە بخۆن مەستو گران بن، دواجاریانەو با تێر بخۆن، بەیانی سەر دەبڕێنو دەکرێن بە مەزەی ئارەق خۆرەکانی هەولێرێ، کتو پڕ گوریسەکەت راکێشا تا هەردوو قەدی تۆڕەکە بەسەر یەکدا بدەیتەوە، بە پشتدا کەوتیتو بە پەلەو زوو سەرت بەرز کردەوە، هەر هەمووی هەڵفڕین، بوون بە تەمو رەوینەوە، لە ئاسمان لە تاوانو لە ترسان بەر یەکدی دەکەوتن، سەریان لێ شێوا، بەفریش پتر گێژی کردن، رەشەبایەکی کتو پڕ، بە یەکجاری تەرینو تا درەنگی ئێوارە نەهاتنەوە ئاسمانی ئەو ناوە،

هەر سێ راوچی‌یەکە لە دوورەوە قاقا پێدەکەنین، دووانیان بە راکردن بەرەو پیری تۆ ساتمەیان لە تەپۆلکەو قۆرت و قوچەکی خوساوە دەکردو دەخلیسکان، هێشتا لەسەر پشت کەوتبووی، لە شەرمی نائومێدی و هەڵفڕینی ریشۆڵەکان یەك تەختە لە ناو قوڕاوەکە راکشابووی، یەکێکیان بە لاقرتێوە پێی گوتیت: هەستەوە دەروێش.. دەی.. ئەوە بەسەر پیاوان دێ.. یەك رەشۆڵەی زۆر قەڵەوت راو کردی‌یە.. بەشی گەرەکی خۆتان دەکا، بە کاوەخۆ هەستایتەوە، وەك پێشەوایەکی تێکشکاو، تێك شکاوی شەڕێکی کوشندە، دەنگت هەڵبڕی و لەو دەشتە چۆڵەدا دەنگی دەدایەوە: پێ بکەنن حیزبابینە.. ئەگەر پێوە بوونایە هەنووکە دەمزانی کوو دەگریان، لاکەون ماکەرینە، ئەمڕۆکە کە تۆیان بینی هەر هەموو سڕ بوون، سەرسام و ئەبڵەق، بە درۆو لە قورگێکی تاساوەوە هاواریان دەکرد: (خۆش بە حاڵت دەروێش.. خۆش بە حاڵت).

هێی دەروێش.. ئیتر بەخت و رێکەوت، نا رێکەوت نی‌یە، زاڵبوونە بەسەر فڕو فێڵی ئەو مەلە گچکەلۆکانە، خودایە هەنووکە هەمین بێتەوەو بە چاوی خۆی ببینێ چ راوێکت کردووە، تۆڵەی بەرودوات کردەوە، سەبری (ئەیوب)ت هەبوو، خودایە هاوار ئەو ژنە چی لێ هات؟ درەنگی کرد.. دەبێ چ وەختی شەو بێ..؟ بە پڕتاو وەك شێت لە ژوورەکە دەرپەڕی و کەوتیتە ناو حەوشەکە، نێرەکەرو مانگاکە رەوینەوەو بە ترسەوە لە تۆ رامان، تۆش بە ترسەوە لە ئاسمانی هەوران بارو پڕ پرووشەی باران رامایت، خودایە بێ ئافات بێ، ئەگەر هەر نیازێکت هەیە هەڵیگرە تا

هەمینم دێتەوە، ئەوە چەندەمین جارە ببۆرژێی، لە خەو رابیت، زیندە خەوو کەروێشکە خەو، ئەو ژنە ماڵ میراتە نەکەوتبێتە ناو کەندو لەندێك؟ لە قوڕو چڵپاوێکدا نەچەقیبێ؟ لە زەلکاوێکدا؟ لە گـۆمی مـیری نـەخنکابێ؟ رێی هەڵـە نـەکردبێ؟ شـەلاتی و سەرسـەرییەکانی شـار شـتێکیان لـێ نـەکردبێ؟ لـە بەسـتی (سـەیداوە)ی نـەدابێ و لـە گێـژاوێدا خنکابـێ؟ لـە ناکـاو هـەواڵی مەرگیم لۆ نەیە..! خودا ئەو ژنە هیلاك‌و ماندووەم لی نەبێتەوە بە قـاتی، فریشـتەکانی ئاسمانـان دەسـتی بگـرن، چـاوەکانی کـز بووینـەو نـەبا رێیـان بزر بکا، بێ وی دونیـای روونم نـاوێ، بـایز ئـەتوو پیـاوی، ئـەمن ژنـەکی تـەنیاو شـەقی، هـەتا دەچم‌و دێمـەوە سـەد خـەیاڵی خـەراپ‌و ختـوورەم بـە دڵـدا دێ، خـۆ براکـانم بـە بەردەممدا تێ بپەڕن شتاقیان ناناسمەوە، دەترسم، گەلەك دەترسم زەبرێکم لـێ بـدەن، هـەمین قـەد بـە هـەمان رێدا مەگـەڕێوە، رێیـان بگۆڕە.. هەر پیاوەکی دەبینم کەمەکێ لێم ورد بیتـەوەو بە دوومدا بێ، سەد ئاوڕان دەدەمەوەو بە گورگە لۆقە رێ دەکەم، دەشزانم کە چ عەیبـەکی گەورەیـە ئاوڕدانـەوەی ژنـان، زارەتـرەك دەبم، جـار هـەبووە هەترەشـم لـە سێبەری خـۆم چووە، وا مەزانـە لـە خەمتـدا نەبوویمـە، سـەدان جـار بـە دزییـەوە تـا مـاڵی چـەلەبی‌و فـلان بەگزادەو ئاغاو ئەفەندییەکان بە دووتدا هاتیمە، بەزەییت بە منـدا بێتـەوە، چیدیکە خـەمم مـەدێ، هـەر کە تاریك دادێ دەکەومـە نـاو سـەد غایەلـەی خـەراپ، خـودا دەبێ لـە کێنـدەرێ بـێ؟ چـی بەسـەر هاتبێ؟ شتێکیان لێ نەکردبێ؟ چیتر خزمەتی ئەو سەگ‌و گورگانە مەکـە، ئـەوان ئـەمن‌و توویـان لـە گونـدی دەرپـەڕانـد، وەك تـەیری

تەریو لە هێلانە بە نیوەشەو هەڵیانفڕاندین.. لەوێندەرێ سەپان‌و گاوان‌و شوان‌و کیشەکەر بووین، لێرەش خزمەتکارو کرێ گرتەو جل شۆر، چیدیکە وەکی دەرۆزەکەر لە بەر قاپی ئەم‌و ئەو مەکەوە، لە کنت وایە چاوم دونیا نابینی؟ هەموو رۆژێك لەو چۆڵ‌و قەفرەدا بیرم لە لاتە، لە دڵم گرانە سەرلەبەیانیان زوو لە یەکە یەکەی دەرگاکان دەدەی، ئەمن دەزانم جار هەیە چێشتەنگاو دەرگات لێ دەکەنەوە، ئەتووش کزو مات لە بەردەرگاکانیان دادەنیشیت‌و لە سەرمانا خۆت وێك دێنیتەوە، ئەوە خوایە دەرگای بەهەشتت لێ بکرێتەوە، لە پاش چەندین سەعات ئاغاژنێك لە خەو رادەبێ و بە رێکەوت دەرگا دەکاتەوە، خۆی تەسك دەکاتەوە، دەم پان‌و قەحپە بە کۆڵێ مەکرەوە گازت دەکا.. هەمە.. ئەوە لێرەی؟ لە مێژە لە بەر دەرگای؟ ئەتووش درۆیان دەکەی.. (سافی)خان تۆزێکە لێرەم.. چ قەیدی‌یە.. خەوە تۆتکە گرتمی.. مەترسێ.. ئەوان شەرمێ لە کەس ناکەن، ئەو بێ شەرەفانە دەناسم، کابرا ئەتوو ئەوەندە دەمت پیس نەبی باشە، ئاخر بەلاش نی‌یە بە بایزە شێت بانگت دەکەن.. ئا.. ئەمن شێتم چونکە قوماشی کورتەك‌و شەرواڵەکەم ئینگلیزی نی‌یە، جەمەدانی بە گوڵینگەو کلاوی بە باق‌و بریق لەسەر نانێم، شێتم چونکە هەروەختی زەوقم هەستا حەیران‌و لاوکی خۆم دەرێم‌و سواری توو دەبم، شێتم چونکە رەشۆڵان راو دەکەم‌و دەرخواردی ئارەق خۆرەکانی دەدەم، سڵێوە هەقی هەبوو دەیگوت: ئاغاکان ئەتوویان لە گوندی راونا، ئەتووش ئەوەندە بێ غیرەتی رەشۆڵەکان راو دەنێی، لێرەش، لە شاری، جێمان نەبۆوە.. ئەوەتا لە برسان

دونیای هیچ راوی من‌و توو دەنێ.. منداڵە بێ عارەکانی شارو هەندێ لە عەتارو بەقارو بازرگان‌و زەڕەنگەرو قەسابەکانیش، کە حەزیان لە سوعبەت‌و قۆشمە بێ، جڕت لۆ کرمانجان لێ دەدەن، تا هەنووکە بە دەم هۆیها و فیکە لێدان‌و جڕت لێدانەوە چەند کەسیان هەر لە هیچ‌و خۆڕایی شێت کرد، وام لێ هاتی‌یە خۆ لە چاوی عالەمێ بشارمەوە، بە من بی قەت نەچمە ناو بازاڕی، هەمین لەوە دەچی ژیانی مە هەر راوڕاوێن بی.. هەندەك جار کە بیر لەو دونیایەی دەکەمەوە لە راوێکی گەلە گەورە دەچی، یەك راوی ئەوی دیکە دەنێ، دواجاریش هەر هەژارو بەش مەینەتی وەکی مە دەبنە نێچیر، وای هەمین ئەو ژیانە چەند لە گرانەتا دەچی......

واش نی‌یە راوچی مایەپووچ.. هەنووکە لێرە بووایە بە شان هەڵتەکاندن‌و لێو هەڵقورتانێکەوە ترس‌و خەم‌و قەهری دەڕەواندییەوە، بەرانپیلی فڕێ دەدا، خانمانەو دەست‌و برد سەرکە بزۆتەکانی لە ژێر قاڵدرمەکە دەردەهێنا و ئەوەندەی بڵێی یەك‌و دوو زۆپاکەی گڕ دەدایەوە، هێدی هێدی تەلاش‌و چیلکەی تێ دەخست، سێبەی زەردی کڵپە لەسەر رووخساری ماندووی سەمای دەکرد، بێ هەمین دونیا چ ساردو تاریکە خودا، خەیاڵێك دەتبا و خەیاڵێك دەتهێنێتەوە، لە ناکاوو بێ ئاگا لە خۆت، لە قەهری زەمانە دوو تنۆك فرمێسکی درشت‌و لە چاوانت تکان، هی سوێی سەرمای ژوورەکە بوو یان یادەوەری تاڵ، لە هەناوتەوە قوڵپی گریانێك سەری هەڵدا، دەکولای، خەمێکی قورس‌و گران‌و جەرگبڕ بەرچاوانی گرتی، ژووری خامۆش‌و حەوشەکە بۆنی مەرگی لێ دەهات، جاروبار گرمەی گەواڵە رەشۆڵە برسی و دیل‌و

مانـدووەکانی دەخسـتە سـەر قاژەقـاژ، لـە ترسـی بـێ دەنگـی و نەهاتنـەوەی هـەمین حـەزت دەکـرد لـە قاژەقـاژ نەکـەون، لـە دوورەوەش تەنها دەنگێکی ئاشنا بە گوێت زرم و کوتی ئاشەکەی چـەلەبی بـوو، بـەردەوامیش، لەوەتـەی لـەم گەڕەکـە دەژیـت، لـەم شارە.. بەردەوام زریکەیـەك لـە گوێتدا دەزرنگێتـەوە، هەنـدێ جار ئـەو زریکەیـە ئەوەنـدە ناقۆڵایـە کـە خەریکـە پـەردەی گوێیـەکانت بدڕێنێ، گوێ بۆ هەموو دەنگ و سەداو چرپەو هەناسـەکانی شـەو سووك دەکەی، نیوەشەوان بەر لەوەی بنووی، یەکـەمجار گوێـت لـە نـووزەی گۆرانیـیـەکی غـەمگین و دوورو برینـدار دەبـێ کـە هـەر دەڵـێی خوێنـاوەو دەڕژێتـە هـەردوو گوێتـەوە، تاوێـك و دەبـێ بـە ئـاهو هەناسـەیکی دڵ پـڕوکێن، پاشـان زریکەیـەکی بـێ ئامـان، زریکـەی سـەدەها ژن، تۆقیـوو زەنـدەق چـوو، هـەروەك بڵـێی لـە قووڵایی تاریکی ئەشکەوتەکانەوە یان دەربەنـدو دۆڵەکانـەوە، لەو زریکـەو هاوارانـە دەچـن کـە هـی کۆمەڵـە ژنێـك بـن، بکـوژرێن، بسووتێن، بخنکێن، بەیەکەوە بمرن، بانگی خەڵکانێکی خـەوتوو بکـەن تـا وەئاگا بێن و فریایـان بکـەون، زریکەیـەکی جـەرگبڕ، کـەم شـەو هەیـە گوێـت لـەو زریکـە بـێ ئامانـە نـەبێ، دڵتـەزێن، غـیرەت بـەزێن.. ئەبـەدی، وەك عەزیایـەکی لـە زنجـیر بەسـتراو، بـە پـێچ و لوول، لە ئاسمانێکی تاریکەوە دادەبەزێ، لەو جۆرە زریکانـەی کە هـەروەك بڵـێی لەوەتـەی دونیـا دروسـت بـووە، نەبڕاوەتـەوە، لـە قورگێکەوە دێ، ژەنگ لێی دابێ، لـە زریکـەی ئافرەتێکی کڵۆڵ و تەنیا دەچێ کە کۆمەڵێك پیاوی دڕندەو تووڕەو تۆسن بە خەنجـەر لـەت و پـەتی بکـەن، زریکـەی کچێك کـە بـە چـەندەها لاوو تـۆلازی

هەوەسباز لە دە لاوە تێ ی بەربن و بێ بنی بکەن، لە پاشان پەل پەلی بکەن، هەر لەت و کوتێکیش ببێ بە کچێکی دیکەو ژنێکی دیکەو بزریکێنێ، هاوارو ناڵەو زریکەکان تێکەڵ دەبوون و پاشان پەرت دەبوون، هەڵدەفڕین و دەکەوتنەوە، زۆر جاران شێتانە شەوان جێ و بالینگانی گەرمت جێ دەهێشت و دەچوویتە نێو حەوشەی خامۆش و سەربانی سارد، بە هەر چوار لادا، هەر لەسەر قاڵدرمە خزەکانەوە ئاوڕ لە دوای ئاوڕت دەدایەوە، پاشان کۆڵانی خامۆش و تاریك و بێ سرتە، زریکەکە هەر لە گوێتدا زرینگاوەتەوە، وەلێ نەتدەزانی روو لە کوێ بکەی، تۆ بڵێی ئەو هات و هاوارو زەناو قیامەتە قەڵەبالغی مەملەکەتی جنۆکان بێ؟ ئەو شەوە ملت پێوەنا.. کۆڵانەو کۆڵان.. شێتانە بە راست و چەپدا دەتڕوانی، لە ئەستێرە کوژاوەکان کە دەتبینی چۆن دادەکشان، دەبێ دیسانەوە کێ بمرێ..؟ خودا هاوار.. با ئەستێرە رژاوەکان رۆحی کڵۆڵی خەڵکی گەڕەك نەبن، لە بەردەمی یەك بە یەکی دەرگای شەق و شڕیماڵەکان دەوەستایت، گوێت هەڵدەخست.. خودا.. ئەم زریکەیەی کەڕی کردم زریکەی کام ماڵە؟ ئەمن دەبێ فریای کەوم..! هەر تاوێك و زریکە دەبوو بە فیقەی زوڕنا و زرم و کوتی دەهۆڵ.. عەجایب.. هەر هەنووکە چ دادو فیغان و گەرمە شینێك بوو.. چ زوو گۆڕا بە شایی و لۆغان؟ قریوەو پێکەنینی کوڕو کاڵان، قریوەیەکی زۆر گاڵتەجاڕانە، گاڵتە بە تۆ کە نیوە شەوان لە بن باڵی گەرمی هەمینێ دێیتە دەرێ و دەکەویتە دوای زریکەیەکی بێ ئامان، گوێت پڕ بوو لە حیلکە حیلکی شەرمنانەو شەهوەتبازانەی کچان و شاباشی بڵندو پچڕپچڕی پیاوێکی

قرخن، ئەو هەراو زەناو زایەڵەیە جێی گومانە، ترس، سەرسامی، ئەمەیان فریوی شەیتان‌و لەمەچێترانە.. نەچیت.. دەنا وەکی تر دەتگرن‌و کچی (شا)ی جنۆکانت لێ مارە دەکەن‌و.. ناهێڵن بۆ کن هەمینێ بگەڕێیتەوە، کۆشێك منالی سەرکەو بنکەت پێ دەنێنەوە، نەکەی دەروێش، ئەمەیان فریوە، وەلێ ئەوە چ شایی‌و لۆغانێکە، دەستخەڕۆ مەبەو بگەڕێوە پاڵ هەمینێ، لە ناکاو زریکەی پرسەداران‌و قریوەی شاییکەران لە گوێتا تێکەڵ بوون، تاوێك لە لای قیبلەوە ئەو قاوو قیژە بە سەربانەکەدا دابارین‌و لە درزە زۆرەکانی کەلاوەکەوە دادەڕژانە ژوورەکەت، تاوێك لە رۆژهەلات‌و تاوێکی دیکە لە رۆژئاواوە.. شاباش.. شاباش.. دەروێش بایز سەد لیرە شاباش.. سەد لێرەم لە کوێ بوو؟ وەی بابەڕۆ.. دایکەڕۆ.. بە خۆم رۆ، دەروێشی هیلاك‌و شەقیم رۆ.. سەیدی مەخلووقات.. موحەمەد سەڵەوات، کوڕینە خێرتان دەگاتێ‌و شان بخەنە ژێر تەرمەکەی دەروێش، ئەوە لە دوورەوە چ دەبینێ؟ کۆمەڵێ پیاوی گرگن کە دەست رادەوەشێنن‌و حەیزەران بادەدەن، تەوقە دەکەن‌و دەست لە ملی یەکدی دەکەن، دەگرین‌و دەلاڵێنەوە، شایی‌و.. گەردن ئازادی.. یان شینەو بەخشندەیی خواستن، لەگەڵ گریانی پرسەداران بۆ مەرگی خۆت دەگریایت، وەك هەنووکە.. کە دیسانەوە گوێت لەو زریکە نەپساوەیە، ئەمشەویان، هەر دەبێ، زریکەی هەمین بێ، قوڵپی گریانێك سەری کرد، گەیشتە بەربینەت، فرمێسکەکان دەخۆیتەوە، لە تاو هێرشی ئەو خەمە هەردوو دەستت لە زەوییەکە گیر کردو هەستایتەوە سەرپێ، گێژ بوویت، هەنووکە لێرە بووایە زوو دەهاتە بن باڵت،

تۆش پتر خۆت دەخستە حاڵی جان و خۆت بێهێز دەکرد تا باسکی راستەت لە ناوقەدی یەوە بئاڵێنی، هێدی هێدی هەر بە بۆنی ئەو هوشیار دەبوویتەوە، ئەمڕۆ بەیانی کە وات لێ هات تا ناو دەرگاکە و کۆلانیش لەگەڵتا هات، هەتا لە چاوان بزر بوویت ئەم لە ناوەڕاستی کۆلانێ، بێ شەرم و پرینگانەوە، وەستا.. بە قەهرەوە لێکدی رامان.. دەتووت دوا دەست لێک بەردان و ماڵئاوایی یە، دوا کۆچ و سەفەرە، بێ دەستەڵات و ماندووانە هاتیتە ناو حەوشە و گوێت هەڵخست، چی بکەی..؟ هەنووکە چ بکەی؟ روو لە کوێ بکەی؟ لە کام دەرگا بدەی؟ کام کۆلان و گەڕەك بپشکنی؟ دەتووت دونیا وێران بووە و ئاسمان بەسەر سەری تۆدا تەپیوە، گران هەناسەت دەدا، دەتووت: گەڕەك نا.. بەڵکو هەموو شار جگە لە خۆتی تاق و تەنیا کەسێکی تیا نەماوە، باش دەباری، زۆر بە زەحمەت ئاگری چراکان دڕیان بە تاریکی حەوشەکە دەدا، لە نێرەکەرەکە و مانگا و تۆڕی پڕی ریشۆڵەکان رامای، تا ناو دەرگاکە هاتیت و ملت درێژ کرد، بە هەردوو دیوی کۆلانی کپ و بێ دەنگدا روانیت، رۆح لەبەری پێدا ناڕوات، تەنگەتاو بوویت، دەرگات لەسەر پشت بەجێ هێشت، بێ ئاگا لە خۆت لە دەرگای ماڵە دراوسێ یەکانت دەدا، ژن و پیاوی هیلاك لە ژێری سەرمای پیرەزستاندا، بە دەست و پەنجەیەکی لەرزۆکەوە، دەرگایان دەکردەوە، منداڵی سەرکە و بنکە لە ژێر قاچ و قولیانەوە سەرتاتکێیان بوو، پێیان دەوتی: با دڵت چ غایەلە نەکا دەروێش.. هەنووکە دێتەوە.. چ جاران وا دوا نەکەوتی‌یە..؟ پێم شك نایە.. دەبێ سەعات چەند بێ؟ بانگی شێوانی فەرمووە؟ چما

تا هەنووکە نوێژەکەت نەکردی‌یە؟ هەمین هەموو شتێکی لەبیر بردمەوە، دەروێش هەتا ئەو دێتەوە وەرە لێرە دانیشەو پارووە نانەکی بخۆ، چما رۆح بە گەرووەمدا دەچێ، هێدی هێدی باران تاوی دەسەند، دەترسای ئەو ماڵ میراتە لە رێ بێ، تاریکی دونیای لە خۆ وەرپێچاوە، دەرگایەك.. دوو.. دە.. بە تەمای چی؟ بە دووی‌دا دەچم.. دونیایە هاتەوە.. پێی بڵێن تووخوا.. بڵێن دەروێش حەجمانی لەبەر برا، ئۆقرەی نەما، دەگەڕێم، دانیشم شێت دەبم، سەرێك لەو ماڵە ئاغاو چەلەبی و بەگزادەو ئەفەندی‌یانە دەدەم، ئەوە خوایە سەرە داوێکم دەست بکەوێ، بەڵکو ئەوان راگیریان کردبی، چیدیکە خۆم پێ راناگیرێ، هەتا دێمەوە چاوێکت لە دەرگاکە بی، باران ئاسمان‌و زەوی بەیەکەوە دەدووری‌یەوە، خودای ئاسمانان فریای کەوە، بە فریام کەوە، ساقۆ عەسکەری‌یەکەت لە خۆتەوە وەرپێچا، کزەبایەکی ساردیش وەك گوێزان دەم‌و لێوتی دەبڕی، پێستی ژێر ردێنە پڕەکەتی دەتەزاند، هەردوو دەستت خستە نێو گیرفانەکانت، لەنگەرت تێکچوو، دەرتهێنان، یەکە یەکە لە دەرگاکانت دەدا، ئەوە چەندەمین دەرگایە؟ تۆ چوزانی! دەرگا نەبوو راتنەگرێ، هەبوو نەیدەکردەوە، دزو پیاو خەراپ زۆر بووینە، کۆڵانەکانی بۆنی مەرگیان لێ دەهات، هەر هەمووی ژیڕك ئاسا چووبوونەوە ناو قاوغی خۆیان، وەك شێت شەرمت شکاو لە تاوو ترسی ئەو کۆستە بە پەلە شەقاوت هەڵدەگرت‌و لە دەرگاکانت دەدا، دەتویست هەر هەموو بێنە دەرێ‌و لەگەڵتا بۆ هەمین بگەڕێن، دەرگایەك دادەخراو دەرگایەك دەکرایەوە، باران‌و تاریکی‌و ترس

ڕێیان لێ هەڵە دەکردی، لەودیو دەرگاکانەوە بە کزیو مەلوولیو ترسەوە دەیانپرسی: (ئەوە کێیە؟)

تۆش قورگت نەبوو پێی هاوار بکەی، لە بەر خۆتەوە وەك سۆفییەك زیکر بە ناوی خوداوە بکات" لە ژێر لێوەوە دەتووت: (هەمین.. هەمین.. هەمین)، ئەتوو لە کێندەری ماڵ میرات؟ (با) تا دەهات توندتری دەکرد، کە لە رستەو تەنافو عەلەتریکەکانی سەربانەکانی دەدا وژەوژی هەراسانی کردیت، ورشەورشی درەختەکانی خەمێکی قووڵی دەخستە دڵتەوە، عادەتی ئەمشەو گەلێ لە ئاریەلی رادیۆکان دەکەونە خوارێ...

هەمین.. ژن بەونەکەی.. شەیتان بە لەعنەت.. دەروێش قەت حەزم لێ نییە بە پایز یان بە زستانێ بمرم، گرمەی گەواڵە رایچڵەکاندی، بروسکێك بۆ تاوێك دونیای لە بەرچاوت رۆشن کردەوە، هەر دەڵێی خۆشی ئەوساتە کورتانەی ناو باوەشی هەمینە لە هەموو عومری تۆدا، لەگەڵ هەر گرمەی هەورە تریشقەیەك خۆی دەخستە بن باڵت، دەترسا، شەوانە کە دەباری دەخزانە ناو باوەشی یەکدی، بارانو هەورە تریشقە باشترین بیانوو بوو، وەرە هەمین، ئەوەتا (ئیسرافیل) هەوران رادەدا، پتر سەرت دەخستە ناو کۆشی، نێو جۆگەلەی هەردوو مەمکە شۆڕو گەورۆنەکانی، منداڵ دەبوویتەوە، سینەو مەمکی بۆنگرتوو بە مێخەكو قەنەفڵو گیابەند کە دوای حەمامیش هەر دەمایەوە، پەڵەی دەداو خاك تێر ئاو دەبوو، خوێنی شەهوەتێك لە دەمارەکانتا دەجما..

(هەمین هەقە ئەتووش پەڵە بدەی..!)

تاو نا تاوێ لە ترسی باران خۆت لە ژێر تاقی دەرگاکان گرمۆڵە دەکرد، تاوێك‌و پەشیمان دەبوویتەوە، هەنووکە هەمین وا بەرێوەو باران لێی دەدا، کەچی تۆش بێغیرەتانە خۆ لەباران دەپارێزی، کڵاوو جەمەدانیت ئاویان لێ دەتکا، بە پەنای هەردوو گوێچکەکانتەوە رێچکەیان دەبەست‌و بەرو پشتیان تەڕ دەکردی، ئەمشەو حەسحەسیش بە دەرەوە نییە، سەگە بەڕەڵڵاکانیش لە وەڕین کەوتوون، شار بێ ئاگا لە تۆو لە هەمینی کەلەکەوێت.. تۆ بڵێی بێ تۆ مانگاو کەرو مریشك‌و جووجەڵەکانت.. رەشۆڵە دیلەکانی نێو تۆڕەکەت چ بکەن؟ هەنووکە دەترسێن، هەنووکە (با) دەرگا شەق‌و شڕەکە بەیەك دا دەداو زنجیرەکەش دەیکوتێ، بێ هەمینێ وا چاکە ماڵ کاول بێ، ئەمشەو لەدوو مەلی لانە شێواو دەچن، خودایە نەیکەی بەلافاوەکەی نوح‌و بە گوناهی خەڵکیمان لەگەڵ نەکەی، هاوارم وەبەر توو حەزرەتی وەکاشە.. غەوسی گەیلانی.. خدری زیندە.. خودایە دوور بێ لە هەموو بەڵایەك‌و تیری غەیبی، هەر ئەو جارەی بە سەلامەتی بێتەوە، چیدیکە تووڕەم مەکە بایز! خەمم مەدێ.. ئەوەندە پیر بوویت بە قەد رۆژانی عومرت ترست لێ نیشتییە، هەر رۆژێکەو بە خۆت نازانی ئەو کەلاوەیەت لۆ چۆل دەکەم، ئەوسا بزانم چەندە عگیدی، ئەمنت لە کن نەبم دەست لە گووی خۆت دەگێڕی، هەمین گۆرەوییەکانم.. هەمین کەوشەکانم.. کوا پیشەقانەکەم.. تۆڕەکە لە کێندەرێیە..؟ کیسەی تووتن؟ هەر ئەوەندەت ماوە بڵێی خۆم لە کێندەرێم؟ خودا ئەو خەیاڵە خەراپەم لەسەر دەرکە، لە پاش هەمینی ئەمن چ بکەم؟ هەمین جوان دەرگاکە کلیل دە، قفڵەکە

سەح کەوە، مەترسێ پیرەپیاو.. مەگەر لە کونی بۆڕی زۆپاکەوە بێنە ژۆرێ.. خلیسکت بردو کەوتیت، وای لەو قوڕو زێلاقەیە، لەشت تەزی، سەرما هەموو لەشت دەرزی ئاژن دەکا، لە ناکاو تارماییەک دەستی گرتی، تارماییەکی رەشباو، یان خێویکی نیوەشەو، یان ژنێك کە خۆی لە عەباوە وەرپێچابێ، شەوو باران لێ نەگەڕان هیچ ببینی، هەمین ئەوە خۆتی.. کێلم کەوە.. قسان بکە.. هەموو پاشەڵم قوڕاوی بووە، لە دڵۆپە بارانی سەر بە کڵاوە رادەمای، بە بەردەمتا ریزیان دەبەستو دەتەقینەوە، شریخەی بروسکێك تارماییەکەی نەهێشت، خۆت هەستایتەوە یان تارماییەکە بوو دەستی گرتی؟ تۆ چوزانی.. تارماییەکە زوو رەوییەوە، هاوارت کرد، هەمین، کچێ هەمین، غارت دەدا راوەدووی تەمی تارماییەکەت دەنا، (با)یەك وەك زەلام چنگی لە بەرۆکت گیر دەکردو نەیدەهێشت تاو بدەی، کەسیرەو پەل تەزیو تەکانت دەدا، وەك مەلێکی ناو گەردەلوول، وێڵو کوێر، بۆ پەنایەك دەگەڕای، لە هەوادا هەراو هەنگامەی وەیشوومەو.. (با)ی سڕە، لە دڵیشتا زریانو گێژەڵووکەی خەم، خۆی بوو.. ئا.. خۆی بوو.. درۆ نەبوو.. تارمایی نەبوو.. چاوم ڕەشکەو پێشکە ناکات، گەرمی دەستی ئەو دەناسمەوەو وا هێشتا گەرمی ئەو دەستە لە سەری یەکە یەکەی پەنجەکانم جێ ماوە، تۆ بڵێی خدری زیندە بووبێو فێڵی لێ کردبم، هۆ پیاوچاکان، فریشتەکانی ئاسمان، رۆحی جندۆکە پاکەکان واز لە من بینن‌و فریای هەمین بکەون، لە کێندەرێیە؟ بۆ منی بدۆزنەوە، ئەو تەمو تارماییانە لە زەوییەوە هەڵدەستن یان لە ئاسمانەوە دادەبارێن؟ چ ڕێگەیەك

بگرمە بەر؟ ئەگەر ئەم شەو بەڕێوە بێ بە کام ڕێدا دێتەوە؟ خەڵکی گەڕەك لە سەد لاوە ڕێچکەو شاڕێگەیان کردۆتەوە.. تارمایی‌یەکان لە سەری کۆڵانەکان وەدەر دەکەون‌و ون دەبن، بچیتە بن پەڕەکەی عاسمانێ هەر دەتبینمەوە.. کە تووڕە بووم‌و ڕۆیشتم.. نایەمەوە..

پێڵاوە لاستیکەکانت ئاویان دەدزی، هەردوو پێیەکانت لە ناویاندا دەخلیسکان، دەبوو گۆچانەکە بێنی، هەمین.. هەمین.. هەموو شتێکی لە بیر بردیتەوە، لە لا کۆڵانێك پیاو بوو یان تارمایی لێی پرسیت:

(بەم شەوە شوومە چ دەکەی کابرا؟)

ژنەکەم نەهاتیتەوە. ژنێك تا هەنووکە نەیەتەوە هەقی تەلاقدانی هەیە.. یەخەگیری بوویت. زەبری (با) بوو یان تینی کابرا تۆی لە قوڕو چڵپاوەکە گەوزاند، لە چاو تروکانێکدا نە دەنگ ماو نە ڕەنگ، بە پەلە هەستایتەوە، هەر هەنووکە دەتبینمەوە، دیارە باوکە ئادەمیش هەر ئاواهی بە دوای حەوادا گەڕاوە.. گەڕاوە.. نەوەستا تا دۆزییەوە.. ئاخۆ چی دیوەو چەندی پێ چووە؟، بگەڕێ‌و نائومێدی عەیبە، هەمین لەوە زیاتر دێنێ.. لە ژێر باران‌و ڕەهێڵەدا تاریکی شەوت دەبڕی، ئارەقەو باران لەسەر پێستت تێکەڵ دەبوون، غەریقی قوڕو لیتاو گەیشتیتە بەرقاپی کۆشکە بڵندەکەی چەلەبی، هاش‌و هووشی (با) کە لە درەختە چڕەکانی ناو باخچەکەی دەدا ترس‌و سامێکی زۆری وەك گەڵا دادەوەراند، چراخانی ژوورەکان، ژوورە زۆر بڵندەکانی دڕی بە تاریکی دەداو پڕشنگی ڕەنگاوڕەنگی بە هەر

چوار دەوردا دەپرژاند، بارانی بەخوڕ داڕژاوی پشت پەنجەرەکانی ڕەنگ ڕێژ دەکرد، هەمین لەوێ بێ ئەو چراخانە چ ڕۆشنیو ڕۆناهیەکە خودا.. خودا.. نائومێدم مەکەو مەمکوژە، موعجیزەیەك بنوێنەو با لەوێ بێ، پلت بە زەنگەکەوە نا، زۆر وەستای دەنگێك هاتە بەرگوێت، لە پشت دەرگا سێ دەریو بەرزی ئەو قەلایە باوو باران دەنگەکەی دەبرد، دلگەرمانە پرسیت:

(ئەرێ هەمین لێرەیە؟)

دەنگێك، وەك بلێی لە بنی بیرەوە بێ، هاواری کرد: (ئەتوو کێی؟)

(دەروێشم.. دەروێش بایز..)

بە قورگی پڕ لە گریانەوە پرسیت: (هەمین.. هەمینی ژنم تا هەنووکە دیار نییە)

ئانو سات باران پتر دایکرد، (با) تەوژمی دیکەی سەند، شریخەی بروسك، وەك لە حەکایەتەکان روودەدا نە دەرگا کرایەوەو نە لە هیچ گەیشتی، غەلبەغەلبی پشت دەرگاکە بە دەم کۆکەکۆکەوە لە ژێر بارانو تاریکیدا مرد، تۆ هەر قسەت دەکرد، پرسیارت دەکرد، وڕێنەت دەکرد، لەودیو دەنگو سەنگ نەما، ئەمشەو لە دەرگای مالی هەموو پیاوماقوولەکان دەدەی، ئاغاو بەگزادەکان، کوێخاو مەلازادەکان، بازرگانە قەبەکان، ئەوانەی هەمین هێلکەو شیریان پێ دەفرۆشێ، نانیان بۆ دەکات، جلیان بۆ دەشوات، لەوانەشە کەس نەوێرێ دەرگا بکاتەوە، لە گەڕەکەکەی خۆشتان هەندێکیان بە شێت دەزانن و ناوێرن دەرگات لێ

بکەنەوە، لەو شەوانەی درەنگانێ کە گوێت لەو زریکەیە دەبوو کە لە گوێتدا دەزرنگایەوە.. دەچوویتە دەرو لە دەرگای یەك دوو ماڵت دەدا.. دەتپرسی: (ئەرێ ئەو هاوارە چی بوو.. لێرەوە نەهات؟)، ئەوانیش سەریان دەلەقاندو وەك لەگێلێك رابمێنن دەرگایان بە رووتدا دادەخستەوە..

کەوتیتە ناو جەرگەی شار.. پڕ بە جادەو کۆڵانەکان ئاو تافەتاف دەڕۆی، باران هەموو شتێکی دەشووشتەوە، لەوە دەچێ ئەمشەو دڵی بەردیش تەڕ بکات، تۆ بڵێی هەنووکە هەمین نەچووبێتەوە؟ چش لە باران و با و سەرما و سۆڵەی ئەمشەو، چش لە هیلاکی و دەردەدڵ، تەوژمی باران تاکێکی پێڵاوەکەی لێ بردیت، پتر هەستت بە تەوژمی باراناوەکە کرد، لەنگەرت تێکچوو، هەوڵت دەدا خۆت راگیر بکەی، دەستت بە دارو دیوارو قەپەنگی دوکانەکان و شیش بەندی سەر جادەکانەوە دەگرت، دەخیلی دارتەلەکان دەبوویت، سووك لە بەردەم (با)دا دەهەژیت، ئاوی زۆری باران رووخسارو ئاکارو دیمەنی هەموو شتێك و شوێنێکی لە بەرچاوتا گۆڕی بوو، لە شارێکی غەریب دەچوو، شارێك یەکەم جارت بێ ببینی، دەتویست کۆڵانە و کۆڵان بچیتەوە سەر ماڵەکەی سمایل بەگ، کت و پڕ کەوتیتەوە ناو گێژەنێك کە تا ئەژنۆیان تەڕی دەکردی، کەوتیت..، لەوبەری کۆڵانەکەوە تارمایییەك وەدەرکەوت، هاوارێك هاتە بەرگوێت، هەستەوە دەنا ئاو دەتبا، قوڕاوێك بەر باخەڵی پڕ کردیت، سەرو گوێلاکت کەوتە ژێر ئاوو دەم و لووت و گوێت پڕ بوون لە ئاوێکی لیخن، لە لیتەیەکی لینج کە وا بکات چیدیکە گوێت لە دەنگەکانی دەرەوە

نـەبێ، تـەوژمی ئـاو، لیتـەی ژێـرت نەیاندەهێشـت هەسـتیتەوە، غیرەت سەگ بتخوات، تەکان نەدەم دەخنکێم، هەمینم چاوەڕێمە، ئەو تارماییەیە کێ بوو؟ کە هەمینت هێنایەوە بەر دیدەی خەیاڵت یەکشەق تەکانت داو هەستایتەوە، بە لەرزەلەرز خۆت گەیاندە بن دیوارێك کە تا وێندەرێ بارانا و شەپۆلی دەدا، گیرفانەکانت پڕ بوون لە قوڕاو.. هەردوو چنگیشت پڕ لە لیتە، وەك عفریتێك لە ژێر لافاوی ئاوەکە هاتیتە دەرێ، نابێ بوەستیت، وەختی ئەوە نیيە، خودا هەمین بگرێ، ئەوەندە جلت پێ لەبەر دەکا ئاو قورسی کردووی، ئەو چ بزانێ لە شەوێکی واداو لە ژێر باراندا بە دوایدا دەگەڕێی، وەختی وڕێنە نیيە دەروێش، زووکە بگە بەردەرگای کۆشکەکان و لە گریژنەوە دەریان بێنە، دەرگا دوو دەری و سێ دەرییەکان، ئەمشەو مەهێڵە کەس بنوێ، با هەموو شار بزانێ هەمینت لێ بزر بووە، ئاسمان داتەپیوەو ئەم بارانەش جگە لە گریانی تۆ هیچی دیکە نیيە، کەم دەرگا ما، هی ئاشنا و نائاشنا، داراو نەدارا، تۆ هەڵقەکەی رانەتەکێنی، پل بە زەنگەکەیەوە نەنێی، لە هیچ کام لەو ماڵانە نەبوو، زەوی قووتی دا یان ئاسمان هەڵی کێشا، نائومێد مەبەو بگەڕێ، بە نێو کۆڵان و جادەکاندا، گەڕەکە دوورو نزیکەکان، هاوار.. هاوار.. هاوار بکە.. هۆ هەمینەکەم ئەتوو لە کێندەری؟ بە دەم قوڵپی گریانەوە، بە دەنگێکی مەحزوونەوە، هاوارت دەنگی دەدایەوە، هاوار دوای هاوار.. زریکە دوای زریکە.. ناڵین لە پاش ناڵین.. دەنێو ئەو لافاوە کت و پڕەدا دەخنکان، هۆ هەمین.. هەمین.. قەهرو تاسە لە هاوارەکەتدا تێکەڵ دەبوون، ئەو شەوە زۆر کەس لە خەو راپەڕی و

ــــــــــ

گوێی لەو ناوە بوو، پاشان وەك ئەوەی خەونێکی دیبێ.. خەو بردییەوە، (با) هاوارەکەتی دەخستە سەر باڵی و دەیگەیاندە دوورترین کونج و کۆڵان، سەداو هاوارەکان دەفڕین و دەهاتنەوە لە سەر چڵەپۆپی ئەسپیندارو چنارو گوێزو هەنارو هەنجیرو شەنگەبی‌یەکان دەنیشتنەوە.. کەی رەوای هەقە لە شەوێکی وادا شارێك خەوتبێ..؟ زرم و کوتی لێدانی دەرگایەکی دیکەو، قوربان ئەمەیان چ گەڕەکێکە؟ ئەم جادەیە دەمباتەوە کێندەرێ؟ مزگەوتەکانیش دەرگاکانیان داخستووە، حەسحەسەکانیش نائومێد لە ئاگرکردنەوە خودا دەزانێ خۆیان لە کوێ حەشار داوە؟ دوو رێیان و سێ رێیان و چوار رێیانەکان سەریان لێ شێواندی، هاوارکەو رۆحی هەمین لە ئاسمانانیش بێ دادەبەزێ، هاوارت بخە سەر باڵی (با).. سەر شەپۆڵە وردەکانی ئەم لافاوە تا دەگاتە کن هەمینێ، کێ ناڵێ هەنووکە ئەویش نەگەڕاوەتەوە؟ بچمەوە یان بگەڕێم؟ ئەدی کوا دەروێش؟ ژنانی دراوسێ دەست بە یەك دادەن.. و.. خوشکم زۆرمان پێ گوت.. دانیشە.. چاوەڕێ بکە.. پارووە نانێك بخۆ.. چایەکی گەرم.. هەنووکە دێتەوە.. وابێ ئەویش خۆی ناگرێ و بە دووما دەگەڕێ، ئەوشۆ.. شەوی پیرە زستانەو خودایە لە شەوێکی وا تووشدا لێکمان نەکەی، خودایە.. دەستم بگرەو رێم پیشان بدە، ئەمشەو ئاسمان دڕاوەو لە بڵندایی ئاسمانان پرسەیەو چی فریشتەو ئەهلی بەهەشت و دۆزەخ هەن بۆ من و هەمینێ قوڕ دەپێون، زەوی قوڕو ئاسمان قوڕ، تاریکی لە سەد لاوە دەڕژێ و دادەکشێ، گشت لامپاو چراو فانووس و قەندیلەکانی نێو کەلاوەکانیش کوژاونەتەوە، لە ماڵەکەی تۆدا

ئەمشەو مەگەر (با) خۆی چراکانت بکوژێنێتەوە، ریشۆڵەکان لە دواشەوی گرتنیاندا بە دەستی هەمینێ سەر نەبڕان، بەڵکو هەمین خۆی چوو بێتەوەو بە چەقۆ کولەکەی سەری ریشۆڵەکانی بڕیبێ، هەتا دەچمەوە ئاوەڕووتیان بکا، خودایە وابێ، ئەژنۆکانت دەلەرزن، ئێوارە هیچت نەخوارد تا هێزو شەنگی گەڕان لە خوێنتا بگەڕێ، بەهار یان هاوین بووایە لەسەر تەختەی چایخانەیەك کەمەکێ رادەکشایت، خودا گەر بەتەمای لافاوەکەی (نوح)یت، ئەوە نە منو نە هەمین ئەوەندە گوناهبار نین تا پاکمان کەیتەوە، کتو پڕ هەستت کرد کە هەر هەنووکە لە سەری کۆڵانێکدا، لە بەردەمی دوکانێکدا، لە ژێر چەتری پاسێکدا، لە ژێر تاقی دەرگای ماڵە خوا پێداوێکدا، هی مزگەوتێك، یان کەلاوەیەکدا کتو پڕ دەیدۆزیتەوە، بە تاسەوە لە ئامێزی دەگریتو بارانو بروسك سەرلەنوێ لە یەکدیتان مارە دەکاتەوە، بۆ ئەوەی هێز بدەیتەوە ئەژنۆکانت (هەمین)ت هێنایەوە بەر دیدەی خەیاڵت، شێوەی لە یەکەم رۆژی ناسیندا، کە بینیت.. کە حەزت لێ کرد.. کە شاییت لەگەڵ کردو کە دەستیت گوشی.. کە بۆنت کرد.. کە ماچت کرد.. کە بۆ یەکەمجار لەگەڵیا خەوتی.. چ سووکەڵەو جوانکیلە.. چ خوێن شیرین بوو.. چ پرشنگێك لە چاوانیا دەدرەوشایەوە، چ گرێك لە خوێنیدا، چ گرانو ژنانی هەردوو شانی هەڵتەکاند، سینەو مەمکی پڕی لە ژێر کراسو سوخمەوە هەڵدەتەکی، نا هەمین هەر هی خۆتەو تۆ دوعات کردووە بەر لەو بمریت، مەحاڵە بە تەنیا جێت بهێڵێ، لەوە نەدەچوو دەستت بەربدا، تا نەبووریتەوە شایی جێ ناهێڵێ، ئەو کافر بابە سێ خەڵوەتی

درێژی پێ شکاندی، هەروەك پەرییەکی بەدنیهاد، یەکەمجار وەك بیرت بێ لە ناو دەرگای حەمامەکە وەستاو داوای سابوونی لێ کردی، دووەمیان، وەك بیرت بێ لە بەردەمتا نوێژی دەکردو بۆ سوژدەبردن تەوێڵی خستە سەر زەویو لە بەرچاوتا هەردوو لا سمتو کەفەڵی ژوورەکەیان لێ داگیر کردی، سێیەمیان وەك بیرت بێ لە پشتتەوە سواری کەرێ بوو، وا توند هەردوو باسکی تێ وەرێنابووی کە ئیدی وەك کورپژگەیەکی مناڵکار کەوتبوویتە ناو باوەشی، ئەم لافاوە.. ئەم شەوە تووشە چییە؟ کێ ناڵێ لە گوناهی شکاندنی ئەو سێ خەڵوەتەو تۆڵەی خواهانە نییە؟ لافاوەکە تا دەهات سەری دەکرد، ئاوێکی سوورو لیخن، پڕ قوڕو لیتە، شەڕت لەگەڵ شەپۆلەکان دەکرد، تەواو شەنگت نەما، هیچ خەیاڵێکی جوانو خۆش دادت نادات، هەر شەپۆلێکی هار کە لێت دەدا رووخساری هەمین ژێر ئاو دەخا، بە راستو چەپدا دەکەوتی، لە ناو ئاودا پیاو وەك پووش سووك دەبێ، گێژو وێژ.. تەوژمی بەتینی ئاو گەمانت پێ دەکا، ئاوو ئاگر بێ ئامانن، هەر ئەوەندەی خۆت بۆ شل کردن، زەفەرت پێ دەبەن، نوقم دەبیتو سەرئاو دەکەویت، دەستت ناگاتە هیچ شوێنو شتێك، هەرچییەکی پەنای بۆ دەبەیت، لە ژێر چنگتا رادەکا، خودا بزرم نەکەی.. نەمخنکێنی.. جارێکی دیکە بە رەنگو رووخساری هەمینم شاد کەیتەوە، شەپۆڵ لە دوای شەپۆڵ شەپازللە لە لا روومەتەکانت دەدا، ژێرئاو کەوتیت، دەخنکێی.. لە گوناهی راوکردنو سەربڕینی هەزاران ریشۆڵەدا دەخنکێی، ئەو ریشۆلانەی دەبوونە مەزەی ئارەق خۆرەکان، زۆر شت لەگەڵتا نوقم

دەبوون، هەموو دونیا رەنگی قوڕی پۆشی، هەمان زریکە هاتەوە بەرگوێت، سەرت لە ژێر قوڕاوەکە دەرهانی و بە راست و چەپدا روانیت، کۆمەڵێ تارمایی، خێو بوون یان خەڵك؟.. خودا دەزانێ.. بە سەدەها دەست بە چراوە، لە سەد لاوە بەسەر ئاوەکەوە دەهاتن، دەگرژینەوە یان دەگریان، نوقم دەبوون، چراکانیان هەڵدەبڕی تا لە ئاودا نەکوژێنەوە، دیسانەوە سەرئاو دەکەوتنەوە، کەوتیتە باسکەمەلە، رووەو خێوە چرا بەدەستەکان، پشتەمەلە.. بۆقەمەلە.. شووشەی چراکان گەرم لە ناو ئەو قوڕاوە ساردەدا درزیان دەبردو دەشکان، گڕەکان لە ناو ئاودا دەمردن، چراکانیش یەکە یەکە سەرئاو دەکەوتن، چەندین عەبای رەش و بەرانپیلی بۆرو سەرپۆش و چارۆگەی زەردو سوورت بینی بەسەر ئاوەوە، چاوتروکانێك ژێر ئاو دەکەوتن، هاوارت لێ دەکردن فریام کەون، هاواریان دەکرد، فریامان کەوە.. هاوارەکان تێکەڵ دەبوون و دەنێو ئەو لافاوەدا دەخنکان، فریام کەون.. فریای هەمین کەون.. کچێ هەمین.. هۆ هەمین.. ئەتوو لە کێندەری؟ لە سەربانەکانەوە هاوار، لە قەڵا و قوللەکانەوە هاوار.. هاوار.. ئەگەر خەیاڵت خەراپ نەبێ، لە سەربانی ماڵەکانەوە، دوکانەکانەوە، ئوتێلەکانەوە، قوتابخانەکانەوە، لە خەستەخانەو سەر منارەی مزگەوتەکانەوە گوریسیان بۆ هەڵدەدای، دەنگیان دەدای.. نەتدەزانی روو لە کێ و لە کوێ بکەی، سەری هیچ کام لە گوریسەکان نەدەگەیشتە دەستت، یان دەگەیشتن و عەمبارەسۆت بوون و دەپچڕان، هۆ هۆ هەمین.. کوانێ؟ نە دەنگ و نە سەنگ.. تارماییەکانی هەردوو بەری جادەو کۆڵانەکان، سەربانەکان وان لە کوێ؟ دەنێو ئەو

لافاوەدا نە گوێ ما.. نە چاو.. نە زمانو نە دەستو نە قاچ.. لە ئاوەوە بۆ ئاو.. ئەوە کێیە لەو گێژەنەدا دەخولێتەوە؟ لە ناکاو دوو چاوی پڕ لە بریسکەو ترسی هەمینێ لە بەرچاوانت وەدەرکەوتن، ئەو چاوانەی بۆ یەکەمجار تۆیان شەیدا کرد.. ئەو چاوانەی لەو بوونەوەرەدا قەت پیر نابنو نەبوون، ئەوە هاتی هەمین؟ گوێت لە ناڵەو هاوارو گریانم بوو.. لە ناو ئاوەکە راست بوویتەوە رووەو ئەو دوو ئەستێرەی چاوە بە تاوو تاسەوە غارت دا کە دەنێو قوڕاوی لافاوەکەدا دەبریسکانەوە، دەماو دەم کەوتیت، هەردوو پێت تێک ئالان، دوو ئەستێرەی چاوەکانی هەمین دەقاو دەق لەسەر رووی پڕ لە گێژەڵووکەی ئاوەکە دەدرەوشانەوەو ون دەبوون، خۆت خستبووە سەر باڵی لافاوەکە تا بتخاتە دوای ئەو چاوانە، تیژتر لە تۆ کەلا شووشەی ئەو چاوانە بە تینی تەوژمەکە لێت دوور دەکەوتنەوە، قۆڵو باسکت بەر دارو بەردو رۆخی شۆستەکان دەکەوت، دەمێک جەمەدانیو کڵاوەکەت سەرئاو کەوتن، پاشان وەك پارچەیەك لە تۆ نوقم بوون، تاکێك لە پێڵاوەکانیشت ئاو بردی، لە ژێر ئاویشدا ئەو کەلا شووشەی چاوانە دەبریسکانەوە، هەمین.. هۆ هەمین ژنی چاك بەو بە تەنیا جێم مەهێڵە، مانای چی بە تەنها چاوەکانی دەبینم؟ بە هەر چوار دەورتا چاوی رەشو بریسکەدار زۆر بوون، دەنێو ئەو هەموو چاوانەدا چاوانی هەمین بزر بوون، چنگت لێ گیر دەکردن، لە بری دوو چاو چنگێك قڕو قاڵ بە دەستتەوە دەهات، بە سەر لافاوەکەوە درەختی زەبەللاحت بینی.. بە هێلانەوە.. بە پۆلێك ریشۆڵەوە سەرئاو کەوتبوون.. درەختێك.. دوو.. دە.. هێلانەیەك..

---

دوو.. دە.. پۆلە رەشۆڵەیەك.. دوو.. دە.. لافاوەکە گاشە بەردی گەورۆنەی رادەماڵی، بەرگۆزینگت دەکەوت و دەیتاساندی، بە بەرچاوتەوە تەویلەو گەوەڕەکانت دەبینی یان ئەوەتا چاوت رەشکەو پێشکەی دەکرد، تەویلەو گەوەڕی پڕ لە بزن و مەڕ بەسەر شەپۆلی لافاوەکە سەمایان دەکرد، هاوارەکانت (با).. باران.. شەپۆڵ دەیبردن، چ دەنگێك نەیدەتوانی بەسەر ناڵەی ئەو لافاوەدا زاڵ بێ، نە رەشەباو نە لافاو.. نە ئاگر ئاراستەیەکیان نییە هەر هەموویان شتەکان تێکەڵ دەکەن، ئەم (با)یە توندە لە کام لاوە دێ؟ سەرت (با) دەیباو.. قاچەکانیشت ئاو، کە سەرئاو دەکەوتیتەوە گوێت لە زریکەو قریشکەی بێ ئامانی ژنێك دەبوو، لە گەڕەکە دوورەکانەوە، چەندین قریشکەو هاوارو زریکە، لە خانووە قوڕەکانەوە، لە کەلاوەی دروستکراو بە تەنەکەو چینکۆ، هاوار بۆ فریاد رەسێك، ئاخۆ ئەمشەویش چەند ماڵی دیکە دەڕمێ؟ وای لە قیژەی ئەو ژنانە، نەفرەتی پیاوە تووڕەکان، زریکەی مناڵە هەترەش چووەکان، دوا میاواندنی پشیلە سەرئاو کەوتووەکان و وەڕینی سەگە خنکاوەکان، نەتدەزانی ئەو لاشەیەی سەرئاو کەوتووە هی مناڵە یان پشیلەیەکی گوربە، ئەمەیان تابووتە یان بێشکە، دەست بەهەر شتێکەوە دەگری لە رەگەوە دەردێ، هەڵدەتەکێ، دادەڕمێ، نەمامی ساوای سەر شۆستەکان، کورسی شەق و شڕو جێماوی بەردەمی چایخانەکان، بە ئەستوورایی جادەو کۆڵانەکان بە پێچ و لوول وەك دەعبایەکی دەم کراوە هەموو شتێکی هەڵدەلووشێ، مل دەنێ، چی بکەوێتە بەردەم، رایدەماڵێ، لە بەری رۆژئاواو رۆژهەلات هەر ئاسۆیەو

دادەگیرسێ، لچك‌و دامێنی رەشی هەورەکانەو دەسووتێ، دادەدڕێ، شەپۆڵەکان دەبنە قوچەکی چکۆلەو زوو دادەڕمێن، تاوێك رەش‌و تاوێك سپی‌و تاوێکی دیکە زەرد هەڵدەگەڕێن، لا لێوی شەپۆڵەکان کەف دەکەن، کەفێکی سپی یان زەردباو، خۆت گەیاندەوە شیش بەندی قەراغ شۆستەیەك‌و خۆت پێ گرتەوە، شەپۆڵێك هەردوو ئەژنۆی پێ نووشتاندیتەوە، پشتاوپشت تۆی خستەوە، هەستایتەوە، شەپۆڵێکی بەتین‌و تاوتر بەری دایتەوە، تا هەردوو بن هەنگڵت ئاو هاتەوە، تفت‌و تاڵی قوڕاوێك زایە سەر زارت، ئاو لە هەردوو کونی گوێتەوە دەڕژا، رەشەبا چاوەکانی پێ دەنووقاندی، بەردەوام چەخماخەی بروسك دارو دیواری ئەو ناوەی دەخستە ژێر تەباری گڕێکی زەرد، زۆر نزیك.. ڕێك‌و راست بە بەردەمتدا ریشۆڵەیەکی مردوو، ئەوە دووان.. سێ.. چوار.. تۆ بڵێی لافاوی لەعنەتی گەیشتبێتە ماڵەکەت؟ تۆڕەکەی زیواڵ زیواڵ لەت‌و پەت کردبێ‌و گشت رەشۆڵەکانی خنکاندبێ..؟ تۆزێکی دیکە کەرەکەو مانگاکەت‌و مریشکەکان‌و جووجەڵەکانیش بەسەر ئاوەوە دەبینی.. کێ دەزانێ؟ رەنگە ئەوانە رەشۆڵەکانی سەر درەختەکانی باخی شار بن کە لەگەڵ لێزمەی باران‌و تەوژمی تەرزە وەك گەڵا لە درەختەکانەوە هەڵوەری بن، لە سەربان‌و ژێر گوێسوانەو دارتەلەکانەوە، لەوە دەچێ هەر شەپۆڵێك‌و مەرگی ریشۆڵەیەکی پێ پەیوەست بێ، نا.. بڵێ هەر دڵۆپە بارانێك، لە قەهرو خەفەتی شەوێکی وا شووم‌و لە ژێر بارانـدا تکەی فرمێسکەکانت‌و ئارەقەی لەشت نەدەبینران، رەشۆڵەکانم دەمرن‌و (هەمین)یش ونە..! چ خۆشە وەکو ئادەم‌و

حەوا بە یەكدی شادو شوكر ببنەوە، خودایە ئەم بارانە هێور بكەوە دەنا ئەمشەو مانگو ئەستێرەكانیشت دادەڕژێن، هۆ فریشتەكانی ئاسمان بمخەنە سەر شەپۆلێك و فڕێم دەنە بەردەمی هەمینێ، وەك ئەو كەچەجلەی وا بەسەر ئاوەوە، هەر وەك ئەوەی كە لە خەونەكان روو دەدا، تۆ بڵێی ئەو پەڕۆ رەشەی ئاو بردی بەرانپیلی هەمین نەبووبێ؟ تۆ بڵێی ئەو پارچە قوماشە پف دراوەش چارۆگەی ئەو نەبێ؟ خودایە ئەگەر ئەو بە رۆح ماوە با لە گێژەنی ئەو تۆفانەی تۆدا بكەوینەوە ناو باوەشی یەكدی، ئەگەریش قەدەرمان خنكانە دەبا بە یەكەوە بخنكێین، كت و پڕ بە خەیاڵت دادێ خۆت بخەیتە ناو باوەشی ئەم لافاوەو بتبات، لە گێژولوولی خۆیدا رووەو كارێزەكانی ژێر ئەم شارە بتبات، بتخاتە سەر شەپۆلە نەرم و هێمن و گەرمەكانی، ئەو كارێزانەی هەنووكە هەڵمێكی تەنكی لێ هەڵدەستێ، زستان گەرم و هاوینان سارد.. لەوێندەرێ، لە بن بناغەی خانووەكانی شار خۆتان لە چاوانی پیاوە داخدارو سمێڵ بابڕەكان دەشارنەوە، لە هەڕەشەی شێخ.. لە سوعبەتە قورسەكانی سلێوە.. لە برا دوژمنكارەكانی هەمینێ.. لە لاف و گەزافی چەلەبی و ئاغا و ئەفەندی و بەگلەران، تۆ لەو سەری شارو هەمین لەم سەری شار، دەبێ ئەم شارە چەند كۆنە كارێزی تێدا بێ؟ تۆ بڵێی كارێزەكانیش نەرمابن؟ ناچار لەوێدا.. دەنێو زێرابەكاندا یەكدی لە باوەش دەگرن، لەوێ دەیدۆزیتەوە، دەبوو هەر زوو وەك دوو ماسی خۆتان دەنێو كارێزەكان خستبا، بۆ نەكرا مرۆ وەك مەل بفڕێ و وەك ماسی لە ئاودا مەلە بكات؟ ئەوسا بە ئاسانی نانی پەیدا دەكردو ئاسانتر خۆی لە چاوی

دوژمنـــان دەشـــاردەوە، لـــەوێ دەنێـــو زێرابەکانـــدا چ مـــاڵێکی ناشـیرینتان دەبـێ.. قوڕگتـان پـڕ دەبـێ لـە قـوڕاو.. لـە لیتـە.. لـە پاشـەڕۆك.. چ قـەدەرێکی شـوومی دوو عاشـقە، واز لـە پێشـبینی ناشـیرین بێنـەو خـۆت دەخیلـی ئـەم بارانـە بکـە، لەگـەڵ هـاتنی بـەهاری ئەمسـاڵدا کـە کارێزەکـان دەتەقنـەوە تـۆش لـە باوەشـی هەمیندا زینـدوو دەبیتـەوە، لـە گێـژەنێکی زۆر شین و رووندا قژی درێژو ماش و برنجی سەرئاو دەکەوێ، ساڵانێك لەوێ، لە قووڵایی کارێزەکاندا چاوشارکێ دەکەن، خۆتـان لـە خـەڵکی بـێ مروەتـی.. زاڵمی.. بێ دین و دڵی شار دەشارنەوە، ئیدی بەس دەبێ ریشۆڵە کوشـــتن، لـــە بـــەردەرگا کـــەوتن و پاڕانـــەوە لـــە خـــودانی ماڵـــە خواپێداوەکان، تەکان دەو بگەڕێ بەر لەوەی بەیانی بدا، کێ ناڵێ کارێزێك ناتداتە دەست کارێزێکی دیکەو تا دەگەی بە یەکێك لە بیرەکان، لەوێ ماڵێك دابنێن، بیرێکی تەنکە ئاو تیا مەییو، دوور لـە ئـاوەدانی.. کـاروانێکی مانـدوو دێ و لـە تـەکیا پشـوو دەدا، رێبـوارێکی نـەناس دەولکێـك شـۆڕ دەکاتـەوە، هـەردووکتان لەگـەڵ ئاوی فێنك بەرەو رووناکی ئاسمان هەڵدەکێشـێ، وەك دوو پـەری یان جنۆکە، شاگەشکە دەبن، جلتان لەبەر دەکەن و بەرەو شارێکی غەریب دەتانبەن، ئیدی نایەنەوە ئێرە، نا.. هـەر لـەوێ بن.. دەنێـو کارێزەکـان، ئـەو فەسـڵەی ئـاویش دەنیشـێ.. ئێـوە لـەوێ، لـەو خـوارەو لەسـەر لمە نەرمەکـەی چـەند مانگێـك دەخـەون، دەمێکـە نەنووستوون، گەرەکە بێ ترس و لەرز شەوانێك کە لـە تەمـەن مـاوە تێـر بسـرەون، وەك دوو گوڵـە ئەتڵـەس سـەرئاو دەکەونـەوەو نـوقم دەبـن، بـا لـە سـەرەوە گەواڵـەو بروسـك و هەورەتریشـقە بـێ، ئێـوە

لەوێندەرێ مت دەبن و دەنوون، هات و هاوارو زرم و کوتی شار لە خەو وەئاگاتان ناهێنێ، گرم و هوڕی پێچکەو تایەی عەرەبانەو قەمەرەکان، وەئاگا نایەن تا کارێزەکان دەتەقنەوەو جارێکی دیکە سەرئاو دەکەونەوە، لە سەد کون و کەلەبەرە ئاو دەڕژێ و دەتەقێ، تێکەڵ دەبێ، روونتر لە چاوی قرژاڵ، بە پێچ و لوول پرشنگی رەنگاوڕەنگی خۆرێك لە خۆ لوول دەدەن، سالانێك تەڕو جوان و جحێڵ و چەلەنگ دەبنەوە، تێك دەئالێن و منالی زەردو سوور دەنێنەوە، کۆرپەلەی ئاوی.. نەوەیەك.. نەوەیەکی تازە لەو قوولاییەو لە ژێر نسرمی کارێزەکان دەخەنەوە، نیوە منال و نیوە ماسی، جگە لە گەمەکردن بە ئاو هیچی دیکە نازانن، بۆ هەر شوێنێك بچن ئاو دەستتان دەگرێ و دەتانبا، وردە شەپۆل خەمی چەند سالەتان لێ دادشۆرێ و لە وردە گوناهەکان پاك دەبنەوە، ئیدی لە ژێرەوە بۆ هەر کونجێکی شار بتانەوێ دەچن، بە باسکەمەلە دەگەن و گوێ بۆ ریاو درۆی هەندێ لە مالەکان دەگرن، قریوەی خۆشی منالانی خواپێداوەکان، گریەو نالینی منالە برسی و چلمنەکان، کەسیش پێ نازانێ کە ئێوە گوێ بۆ رازو نیازو نهێنی و قریوەو گریەی شارێك دەگرن، زوو زوو بن ئاو و بن ئاو سەر لە مالی شێخ و سلێوەو چەلەبی و خەلکی گەڕەك دەدەن، لە ژێرەوە ئاو قسەکانیان دەهێنێ و ئێوە وەك منال بە دزییەوە دەتریقێنەوە، پێکەنینێکی خنکاو لە قورگتانا دەتاسێ، ئیدی چی بکەن؟ ئاخر نەدەکرا چیدیکە لە شارێکی وا بێ بەزەییدا بژین.. ئیدی تا کەی ترس و دلەڕاوکێ؟ چەندەها جار بۆ هەورو باو و باران حەیرانت چڕیوە.. بەلام ئەوەی ئەمشەو باران نییە..

---

غەزەبی خودایە...!

لە ژێر چەتری دوکانەکە خۆت مەڵاس دا، لە تاوی لافاو چوویتە سەر سەکۆکان، لافاوەکە دەتوت ئەژدیهایەکەو زمانیت بۆ درێژ دەکا، کتو پڕ لاشەیەك بەسەر ئاوەوە دەرکەوت، چاوانت هەڵگلۆفی، تاوێك بزرو تاوێك سەرئاو کەوتەوە، چەخماخەی بروسکێك دونیای بەردیدەتی رۆشن کردەوە، لە عەبایەکی پف دراو دەچوو، یان هەر شتێك کە خۆی لە عەبایەکەوە لوول دابێ، ئاو هێنای، نزیك کەوتەوە، خۆت هەڵدایە ناو گێژەنەکە بیگریتەوە، بە دەمدا کەوتیو ددانەکانی پێشەوەت بەر بەردێك کەوت، دەمت پڕ بوو لە شلەیەکی گەرمو سوێر، شەپۆلێکی ناقۆڵا عەبا پف دراوەکەی دوور خستەوە، شەپۆلێکی شێت رایتەکاندیو پشتاوپشت رەتت بردو خۆت بە قەپەنگی دوکانێك گرتەوەو هەردوو دەستت لە هەڵقەکانی ژێرەوە گیر کرد، زەخمێکی توندی ئاو وای کرد توندتر دەست بە قوڵفەکانەوە بگریت، نەڕۆی قاچەکانت سڕ دەبنو دەیانبەستێ، گوێرانە ملت نا، سەر لێ شێواو، رووەو کام لا خودایە، رووەو کام لا؟ ئێرە کوێیە؟ سەعات چەندە؟ سی ساڵە لەم شارەیتو کونو قوژبن نەماوە رەنجی تیا نەدەیت، لە شەوێکی وا تۆفو باراندا هەر هەموو جادەو کۆڵانەکان لە یەك دەچن، هەموو دوکانەکان، خانووە خۆشەکان، کەلاوە شان شکاوەکان، هەر هەمووی بووە بە یەك، نایانەوێ بیانناسیتەوە، ئێرە رۆژهەلات یان رۆژئاوای قەڵاتە؟ چاکتر وایە بەسەر قەڵادا هەڵبگەڕێی، لەوێ لافاوی (نوح)یش هەڵسێ تۆ ناگرێتەوە، بەڵام نا.. شەرمە.. تۆ بە دوای

هەمینێدا دەگەڕێی، گوێ هەڵدەخەیت جگە لە خوڕەمو تافەتافی ئاو هیچ دەنگێک نابیستی، بۆ دەبێ تۆ تاکە پیاوێک بی لە شارێکی نوستووو کڕکەوتوودا؟ لە شەوێکی وا ناخۆشو تۆفاندا ژنەکەت بزر بکەیت؟ لە هەر چوار لاوە تاریکی گەمارۆی دەدای، دڵی هیلاکو پڕ لە ترست بە تاو لێ دەدا، ترسی ئەوەی لە شەوێکی وا تووشدا زەفەریان بە هەمین بردبێ، لە لا کوڵانێکی چەپەک، لە نێو کەلاوە کۆنێکدا، گۆڕستانێکدا یان ژێر پردێک، بێ نرکەو ناڵە، بێ هاوارو زریکە دەستیان لە هەوکی نابێ، بێ خشپە، بێ هەستو خوستو کەس نەیزانیبێ. پارچە کارتۆنێک لەو ناوەدا نەماوە گڕی تێ بەر بدەیتو خۆت گەرم کەیتەوە، لە خەیاڵی ئەوەدای لە هەموو دەرگاکان بدەی، ئەوەی نەیکردەوە، بیشکێنی، تۆ بڵێی یەکێکیانت بیر چووبێتەوە؟ خەریکە ئاسمان روون بێتەوە، هێدی هێدی بە ژێر چەتری دوکانەکاندا لەترت دەدا، رۆماتیزمەکە لێت دەداتەوە، قوڕاوێک لە دەمو هەردوو کونی گوێتەوە دەڕژا، سەرمای ئەمشەو گەیشتە ناو مۆخو ئێسقانەکانت، دەبوو لە رەشۆڵەکانەوە فێر بیت سەرمات نەبێ، دەستێکت بە قژوقاڵتدا هێنا کە بە ملتەوە نووسابوون، کوڵێ پێی قەڵس بووی، لە قەراغ قەپەنگو دەرگای دوکانە داخراوەکانەوە چەندین مەلی مردارەوەبووت بینی، چەندین مشکو جرجی تۆپیو، لە نێو مەلەکاندا کە باش نەدەناسرانەوە، چەندین رەشۆڵەت بینی، لە قەهری بزربوونی هەمێنو خنکانی رەشۆڵەکان چاوانت پڕ بوون لە گریان، هەموو بەیانیەک لەم وەختەدا لە باوەشی گەرمی هەمینێ دەهاتیتە دەر، وای لەو باوەشە، دەبێ

بەهەشت هەر باوەشی گەرمو پڕسۆزی ژنێكی وەك هەمین بێ، هەمین ئەگەر لەوێ بەهەشتی بووم حەفتا حۆرییەكە بە تـوو ناگۆڕمەوە، دوێنێ شەو وەك بڵێی بۆنی كۆستێكی گەورەی كردبێ، پێشبینی نەهامەتیو مەرگەساتێك تا نیوەشەو كەلەكەی دەگۆڕی، چەند جارێك هەستاو گڕی لامپاكەی زیاد كرد.. (بایز خەوم نایە.. دەترسێمو حەز دەكەم ژوورەكە روونـاكتر بـی!)، بەیانیان مەلابانگدان وەك مریشكی دانكەگرتوو دەكەوتە قرتەقرت، قاپو تەشتو مەنجەڵو مەسینەو پەقەرجی بە یەك دادەدا، وەئاگای دەهێنای، دەتووت لەو دونیایە جگە لە هەردووكتان كەسی دیكەی تێدا نیيە، هەردووكتانو بەس، تەنیاو بێكەس، ئاوی بۆ گەرم دەكردی، زۆپاكەی جۆش دەدا، چای دێم دەكرد، هێلكەی دەكوڵاند، سپی دەكرد، شاژنانە بەڕێی دەكردی، دەتووت بۆ تاوێك ئاسمان لە گریان ژێر بۆتەوە، گەرمی لەشت هەلاوی لە جلە تەڕەكانت هەڵدەستاند، لەو گەڕانو سووڕانەدا گەیشتیتە نزیك شوورەی گۆڕستانی (شێخی چۆلی)، لە گۆڕەكانت روانی، گۆڕی پەڕپووتو هی خاوێن، چەتردارو بێ چەتر، چی بێ باكانە نووستوون، بێ خەمو بێ ئاگا لە لافاوی ئەمشەو، بایز.. كوڕە بایز.. ئەمنت بمرم ئەگەر كرا قەت لە هەولێرێ مەمنێژە، ئۆباڵی منت بە ئەستۆ، لێرە گەلەكی ماندیو شەقی بووم، گەلەك ترسام، پیرە هەولێر پیری كردم، وەسیەتم وەرگرەو بمبەوە گوندەكەی خۆمان، با پاش مردنم لەوێ بحەسێمەوە، ئەوە ئەگەر گۆڕمان بە قیسمەت بی، كێ دەزانێ؟ داتە پڕمەی گریان.. عەیب نەبوو.. ژمارەیەك لە خەڵكی شپرزەو

هیلاکی دەست لافاوەکە بە تەکتا ڕەت دەبوون و دەگریان، لەوە دەچوو هەموو کەس لەو ڕۆژەدا بگری، دەنا ئەمن حەزم لێ نیيە بچمەوە ئەو گوندەی دەریان کردم، هەمین پێم خۆشە گۆڕەکەشم هەروەکو خۆم غەریب و بێ کەس بی، حەزم لێیە گۆڕەکەم لە نزیک جادەیەکی قەڵەبالغ بی، گوێم لە هات و هاوارو قیژەی خەڵکی بی، ترسی مەرگ و خەمی هەمین دانەچۆقەیان پێ خستیت، چەناگەی خۆت پێ ڕاگیر نەدەکرا، گەیشتیتە سەر پردەکەو لە هاژەو لرفەی ئاوەکەی ژێرەوە ترسای، هەموو شتێکی رادەماڵی، دەروێش کە مردم بمبەوە دەشتێ و هەموو بەهاران وەرە سەر قەبرەکەم و چەپکەکی نێرگز لە سەرینم دانێ، هەقت نەبێ بۆنیان دەکەم، قوڵپت دەدا، لە ناخەوە دەکوڵای، سێ ریز فرمێسکت دەباراند، تەواو خەریکە بەیانی دەداو نەتدۆزییەوە، ئەو نەیزانی ئەمشەو بارانی هەموو ئاسمانان بەسەرتا باری، لە دەرگای سەدەها ماڵت دا، لە تەنها شەوێکی بزربوونی ئەودا تۆ بایی دە ساڵ پیر بوویت، پیرتر لە شاری هەولێرێ، پێ هەڵگرە زەردەی بەیانی داو چەندین ماڵ ماوە لە دەرگاکانیان بدەی، بەرەبەرە بەرچاوت ڕووناک دەبۆوە، لە نێو قوڕو لیتاوی جادەکان سەدەها سۆڵ و کۆنە پێڵاوی کۆنت بینی، چەند پارچە قوماشی ڕەش و بۆر کە دەکرێ عەباو بەرانپیلی ژنان بوون، لە کێ بەجێماون؟ لە کوێوە لافاو هێناونی؟ ئەمشەو لە هەموو شوێنێکدا ڕەشۆڵەی مردووت بینی، بێ ناز لە قوڕدا چەقیو، یان دەنووک شکاو و مل قرتاو بەسەر شەپۆلی ئاوەوە سەمایان دەکرد، بڕوا ناکەی ئەمشەو هیچ ڕەشۆڵەیەک بەسەر درەختەکانی شارەوە مابێ، ئەوشۆ شەوی

کوژرانی گشت رەشۆڵەکان بوو، دەنووشتایتەوەو بەسەری پەنجەکانت هەڵگیرو وەرگێرت دەکردن، وەك ئەوەی بیانناسیتەوە، دەستت لەو پەڕۆو قوماشانە دەدا تا بزانیت کامیان بە قوڵفو گرێ دراوە تاوەکو سەحیان بکەیتەوە، کێ ناڵێ یەکێك لەو بەرانپیلانە هی هەمینێ نییە؟ تەپڵی سەرت تەزی، کڵاوو جەمەدانییەکەشت ئاو بردی، ئەگەر ئەو لافاوە لەعنەتییە نەبووایە، کەوتنە خوارەوەی کڵاوو جەمەدانی کەوتنی شەرەفە، سەیرە.. جەمەدانیو شەرەف چی دەیانبەستێ بە یەکەوە؟ وەك شێت پژدێنەکەت سەح کردەوە، نەتزانی لە کەیەوە شل بۆتەوەو لە بەرپێت دەخشا، سەرکۆتو پێ خاوس ملت دەنا، لەترت دەدا، وەك کەسێك تەرمی ئازیزێکی بەسەر شانەوە بێ، کورتەكو شەڕواڵی تەڕو نووساو بە لەشتدا ئەوەندەی دیکە لەڕو لاوازی کردبووی، ئێە.. گەر هەمین ئاواهی بتبینێ ناتناسێتەوە، لە درەختەکانی هەردوو بەری جادەکە رامای، ئەوانیش دەگریان، هەموو شتێك ئاوی لێ دەتکا، ئەمشەو ناو دڵی بەردیش تەڕ ببوو، کەسێك ئاواهی سەرکۆتو پێ خواس بتبینێ وا زەن دەکا تێکچووی، لێرەو لەوێ، بەم بەیانییە زووە، نانەواو قەسابو عەتارو توونچی حەمامو لۆقتنەچیو عەمەل مەندەو پیاوی رووتەڵە وەك تارماییو بێ خشپە رێ دەکەن، گرمۆڵەو شکاوەو سەرمابردەڵە، کەس سەیرت ناکا وەك ئەوەی نەبیت یان نەتبینن، لە ئاخر زەمان دەچێ کە هەر کەسەو خەمی خۆیەتی، لێرەوە ماڵی خدری پاشا نزیکەو چش لەوەی ئاواهی دەمبینن، دەبا چەلەبیو ئاغاو کوێخاو بەگلەرو ئەفەندیو پیاو ماقووڵەکانی شار با بەم

حاڵــەوە بمبیــنن، بــا بــزانن کــە مــن رووتو رەجــاڵی دەســتی هــەموویانم، پیــاوە تفــەنگ بەدەســتەکانیان لــێم دەخوڕنــەوە، دەرم دەکــەن، لــە دوورەوە، لــە پــاش کــپ بوونــەوەی بــاوو بۆرانەکــە فیشکەفیشکی غەمهێنی شەمەندەفەرەکەو زریکەی بێ ئامانی کە دەتووت قیژەو زریکەی سەدان ژنی کۆست کەوتووە بەیەکەوە هەر هەموو ئاسمانی هەولێری پڕ کرد لە هاوار، لە هەموو شوێنێکدا دەنگی دایەوە، دەتووت لە تاو کۆستی ئەو لافاوەو یان لە تاو سەفەرێکی دوور دەزریکێنێ، لە تاو لێك دابڕانو ماڵئاوایی، هەموو جارێك کە گوێت لەو زریکەیە دەبێت، دەترسیت، خەمێك بەرچاوانت تاریك دەکاو مردنت بیر دێتەوە، زریکەی ئەو قیتارە کە هەر دەڵێی مارێکی زەبەللاحە، بەو دەنگە ناقۆڵایەی کە هێڵی ئاسنەکان دەکوتێ، چك.. چك.. چك ئەو رۆژەت بیر دەخاتەوە کە هەمین رەدووت کەوت، ئەو رۆژەی لە چەندین قۆناغدا ویستتان لابدەنو هەناسەیەك هەڵکێشن، نەتاندەوێرا.. تا ئەو وەختەی گەیشتنە یەکێك لە پردەکانی ژێر سکەکە، لە ترسی تانجیو سەگو پیاوەکانی باپیر ئاغا لە ناو بۆڕییەکی پڕ لە مارو مێروو چووبوونە ناو باوەشی یەکدی، دەترسان وەکو (حەسەنو مریەم) بتانکوژن، ئۆوە.. چ زەمانێکی دوورە، گوێت بۆ دوا زریکەی قیتارەکە هەڵخست، چەندین جار تۆو هەمین خەونتان بەوەوە دەدی سواری ئەو شەمەندەفەرە بنو تا ئەبەد دانەبەزن، بڕوات.. بڕوات.. دوور.. دوور.. دەشتو دەرو.. کێوو دەربەند ببڕێو لە مەملەکەتێکدا داتانبگرێ کەس بەو چیرۆکەتان نەزانێ، چ قەیدییە.. با بە قەرەجی بژین.. وەلێ بێ ترس.. نەك ئەم ژیانە کە

---

هەر کت و مت لەو گرانەتایە دەچێ کە قەت چاکبوونەوەی لە دوا نەبێ، دەتویست لەو ڕێبوارو عەمەل مەندە تیژ ڕەوانە بپرسیت: ئەری ئەنگۆ ژنێکی کەڵەگەت و قژ ماش و برنجیتان نەدیتی‌یە؟ سەرتاپای جلی ڕەشە، بەرانپیل ڕەش و کراس ڕەش و کەوا ڕەش و بەخت ڕەش؟ دەستێکت بۆ سەعاتە عەرەبی‌یەکەی بەرباخەڵت برد.. ئۆو.. ئەویش ئاوی لێ دەتکا، بە دەم ڕێوە پەلەت کرد تا بگەیتە بەردەرگای یەکێ لەو کۆشکانەی هێشتا گڵۆپی بەردەرگاکەی نەکوژابۆوە، قەپاغی سەعاتەکەت کردەوە، نووساندت بە گوێتەوە، دەمێك بوو نووستبوو، عومرێکە ئەم سەعاتەی تۆ نە پاش کەوتووەو نە پێش کەوتووە، قەتیش نەوەستاوە، هەمین بە عەزرەتم جارێك لە جاران ئەو سەعاتە بوەستێ، بەسەری بابت دەوەستێ، ڕۆژێك دادێ هەموو شت بوەستێ، ئەمن دەوەستم.. ئەتوو دەوەستی، سەعاتەکەت، هەموو دونیا دەوەستێ، عەجایبت لێ دێ هەمین ئاواهی قسەی دەکرد، دەی تووڕە مەبە، دەزانم ماندی، تەواو قسان ناکەم.. بنوو.. بنوو.. ئەمنیش گەلەك هیلاك و شەقیم.. لە ژێر تاقی دەرگاکەو ئەو تۆزە گەرمی و تاوی گڵۆپەکە وای لێ کردی ببۆرژێی، پڕ بە دڵ حەزت دەکرد بگەڕێیتەوە ماڵێ و لە ناو جێ و بالینگانی گەرمی خۆت، لە بەردەمی زۆپای جۆش دراو دوو شەوو دوو ڕۆژ بێ کەلەکە وەرگێڕان بنووی، هەمین بە دەستی خۆی لێفەکەت بەسەردا بداو لە ژوور سەرتەوە دابنیشێ و سۆزێکت بۆ بچڕێ، ئەو ماڵ میراتە دەنگی لە دەنگی تۆ خۆشترە، هەموو خەڵکی بە عەزرەتن جارێك، هەر تەنها جارێك گوێیان لە دەنگی بێ، نایڵێ،

تەنهاو تەنها وەختێك خەم دایدەگرێ، بە دڵێکی پڕ لە سۆزو گەرمەوە بەندێکت بۆ دەچڕێ، بەندێك کە دڵشکان و غوربەت و قەهری هەموو ژنانی دەشتی قەراج و کەندێناوەی تیا بێ...

بە دەم ڕێوە سەرت هەڵبڕی و ڕووەو قیبلە ڕوانیت کە هێدی هێدی ڕوون دەبۆوە، لرفەلرفی ئاو دوورو نزیك دەهاتە بەرگوێت و لافاوی ئەمشەوت بیر دەهاتەوە، پیاوێك.. بوون بە دوو.. بە سێ و چوار.. نا.. تا دەهات ژمارەیان زیادی دەکردو بە تەنگەتاوی غاریان دەدا، بۆ کوێ؟ نازانی.. بێ شك کارەساتێکی دوای لافاوەکەیە وا شێتی کردوون، کت و پڕ هاوارو زریکەیەکی دوور هاتەوە بەر گوێت، وەك ئەو زریکەیەی جارو بار نیوە شەوان دەهاتە بەر گوێت و خەوی لێ دەزڕاندی، ژنێك وەك ئەوەی لە نێو دڵی تاریکییەوە بێ، لە کونی ئەشکەوتێکەوە، لە درزی دیوارێکی ڕووخاوەوە بێتە دەرێ، قژی خۆی دەڕنییەوە بەهەشتاوی غاری دەداو تەشك و تیریژی کەواکەی، دامێنی کراسەکەی لەو قوڕاوە دەخشان، دەگریاو لە هەردوولا ڕوومەتی خۆی دەداو باوکە ڕۆڕۆی بوو، بە دەم غارەوە سەمایەکی شێتانەی دەکرد، هەر دەتووت دەیەوێ ئەم زەوییە لەعنەتییە بەجێ بێڵێ و ڕووەو ئاسمان بفڕێ، کۆمەڵێك ژنی لە قوڕاو هەڵکێشراو کەوتبوونە دوای، تێك دەقژقژان و ساتمەیەیان لە بەردو دارو لە یەکدی دەکرد، ترس کەڕو لاڵی کردبوون، بە ئیشارەت یەکدیان دەدواند، ترس و سامێکی زۆرت لێ نیشت، لە تاو ئەو دیمەنە ترسناکە هەردوو ئەژنۆت دەلەرزین، ویستت دوایان بکەویت، وەك تارمایی قیژەیان نەماو بزر بوون، گەیشتیتە قەراغ گەڕەکی (گڵکەند)،

رووەو لێـواری ئـەو چـاڵاوە چـووی کـە دەتـووت خەرەنـدە دەمـی کردۆتەوە، بە هەزارەها ماڵی هـەژار لـە نێـو ئـەو زۆنگـاوەدا دەژیـن، هـەرکێ مـەترێك زەوی پـێ نـەکرێدرێ دەنێـو ئـەو چاڵەدا کەلاوەیـەك قوت دەکاتەوە، دەبێ ئەمشەو چەند ماڵ لەوێ رمابێ؟ چەند کـەس خنکابـێ؟ زسـتانان لافـاو و قـوڕاو و چـڵکاوی هـەموو شـار، بگـرە پاشـەرۆکی هـەموو گەرەکـەکانی دیکـەش دەڕژێتـەوە نـاو گڵکەنـد، ساڵ نییە چەند کەسێك لەوێ نەخنکێ، لە برسانا نەمرێ، دەیەها دەردو دوو.. لـە سـیل و وەرەمـەوە بیگـرە تـا میـزی خوێنـاوی، خانەدانەکان ناویـان لـێ نـاوە گـەڕەکی دۆم و قەرەجەکان، گـەڕەکی سـەگخۆران، گـەڕەکی لـە برسـا مردووەکـان، گـەڕەکی قەحپـەو گـــەوادەکان و.. دزەکـــان و.. قـــوڵ بڕەکـــان.. دەســـتە دەســـتە پیاومـاقوولان داوایـان لـە (موتەسـریف) کـرد کـە ئـەم گەڕەکـە نەهێڵێ و ئەو چاڵە پڕ بکەنەوە کە بۆتە مۆڵگەی دزو حیزو مێش و مەگەز.. داوایان کرد کە ئەگەر بکرێ ئەو دەعبایانە لـە شـار دوور بخەنـەوە، ئـاخر شـوورەیی‌یە شـارێکی دێرینـی وەك هـەولێر کـە عومری شەش هەزار ساڵە پیسترین گەڕەکی دونیا لـەوێ بێ و نـاو جەرگەی شاریش جێی بێ، جگە لە میکرۆبات و مناڵی هـارو هـاج چی بەرهەم دێنن؟ لە بەر خۆتەوە دڵت گەرم دەبـێ و جنێـو بـە دارو بـەرد دەدەی، هـێی پیـاوە بەشـەرەفەکانی شـار گـەر ئـەنگۆ پیـاو بوونایـە گـەڕەکێکی وا نـەدەبوو، گەیشـتیتە سـەر تەپۆڵکەیـەك کـە زبڵخانە بوو.. روانیت.. چ قیامەتێکە خـودا؟ دەتـووت هـەزاران دەم بـە یەکـەوە هـاوار بـۆ تـۆ دەکـەن، دەگـرین و دەقیـژێنن کـە لـەو زەلکـاوەی تـێی کـەوتوون قورتاریـان بکـەی، لـەو بەرزاییـیەوە لـە

خودایەکی کڵۆڵو بەستەزمان دەچووی، ئەوانیش هەزاران مەردوومی خنکاو و نیوە خنکاو، تا حەدی هەندێ لە سەربانی کەلاوەکان ئاو داپپۆشیبوو، کەلاوەکانی دیکە لەوە دەچوو سەرئاو کەوتبن، بێ شك ئەو سەدەها منداڵەی وان بە باوەشی دایكو باوکیانەوە دانەچۆقەیان پێ کەوتبوو، لە سەدەها چۆلەکەی تەڕ دەچوون، دیار بوو کە هەر هەموو بە دیواری ئەو چاڵە دەم کراوەیەدا هەڵدەگەڕان، بە خۆو بە منداڵەکانیانەوە دەخزانو بەر دەبوونەوە، درەنگ وەختێ ماشێنە سوورەکانی ئاگرکوژێنەوە دێن تا ئاوی لافاوەکە دەربدەن، هەر هەموو ناوەڕاستی چاڵاوەکەیان جێ هێشتبوو کە بەسەر ئاوەوە هەزاران وردە تفاقی ماڵەکانت دەدی سووك سەرئاو کەوتبوون، قاپو قاچاغ، مەسینە، هێلەكو بێژنگ، سەدان مریشكو جووجەڵەو کەلەشێری خنکاو، کەچە جلو پەڕۆ پاتاڵی زۆر، کتێبو پەڕاوی مەکتەب، تەختە دار، گۆچان، تاژیو توولەی ئاوساو، بێشکەی دار، کتلی چا، ساجی دار، تیرۆك، پنە، تەشتو مەنجەڵی بێ شومار، باول.. هەندێك لاشەی ئاوساوو وردیلە کە نەدەکرا بزانیت هی منداڵە یان پشیلە، کەس تێ ناگات ئەو خەڵکە چۆن غیرەت دەکەن دەنێو ئەو گۆڕە گەورەیەدا دەژین؟ تۆ بڵێی هەر خۆیان حەز بە مەرگ نەکەن؟ پیاوانی بە سیلو وەرەمەوە دەمرن، ژنانی بێ شەنگو تاقەتیش بەسەر منداڵەوە، منداڵەکانیش لەبری میزو گوو خوێن دادەنیشن، هاوینان لەو زەلکاوەی ناوەڕاستی گەڕەکێ هەر هەموو مەلە دەکەن، ئۆو دەروێش چ غایەلەیەك رایگرتووی، درەنگەو هەمینت نەدۆزییەوە، وەلێ چاوتروکاندن لەو رۆژی قیامەتە، لەو حەشرو

نەشـرە، لـەو عەزازیلـە لـە قـوڕ چـەقیوە بەلاتـەوە خیانـەت بـوو، خـەمێکی ئاواهی کـە جـەرگ دەکا بـە خوێنـا و خـەمی خـۆت لـە لا کەمـەکێ سـووکتر دەکـا، هـەموو گـەڕەك بەیەکـەوە لـە نـاو ئـاوی لافاوەکـەدا مەلـەی دەکـرد، بـە هـەزاران پیـاو و ژن و منـاڵ، پـیر و جحێڵ، بە خۆو بە مانگا و مەڕ و بزن و بێشکەوە، بـە خـۆو بـەو کـەم بزورگـەی مـابۆوە بـە قـەراغی چاڵەکەدا سـەردەکەوتن، لـە هـەموو لایەکەوە، سەردەکەوتن و دەخزین، دەتووت لە دەعبایەك رادەکەن، لـە کۆمـەڵێ خەڵقەنـدەی سـەیر دەچـوون کـە مەگـەر تـەنها مـرۆڤ لـە خەونێکی زۆر ناخۆش و ناشیریندا بیانبینێ، تۆ بڵـێی کارەساتی گەورەی ئەمشەو، ونبوونی هەمین و ئـەو تۆفـان و بـاو و بۆرانـە، ئـەو هـەموو هـەراو مـاڵ کاولییـە، هـەر هـەمووی خـەونێکی نـاخۆش نەبێ؟ چش لەوەی منی پساند.. بەس.. ئێی وەئاگا بێم و درۆبێ، کـت و پـڕ وابـێ هـەمین لـە نـاو پێخـەفێکی گـەرم و نەرمـدا لـە تـەك خۆمدا ببینم و لە تاوان باوەشی پێدا بکەم و بەسەریدا بگریم، بڵێم ئۆخەی کە خەون بوو، چەندەها جار هـەردووکتان بـە دەم خـەوەوە وڕێنەتان کردووەو.. پڕ بە کەلاوەکە لە ترسانا هاوارتـان کـردووە، خـەونی ناخۆشـتان دیـوە، کـت و پـڕ تـۆ هـەمینت بێدار کردۆتـەوە، یـان ئـەو رایتەکانـدووی، شـەیتانت بـە نـەفرەت کـردووە، ئـەوەیان پیشـەی سـەدەها شـەوتان بـووە، کەسیشـتان لـەوی دیکـە زویـر و دڕدۆنگ نەدەبوو، ئای کە ژیان خۆی دەبێ بـە مۆتەکـە و خـەونێکی نـاخۆش و نـەبڕاوە، خـەونێك کـە تیایـدا هـەزار جـاران بکوژرێیـت، بمریـت، بخنکێیـت، بسـووتێیت، لـە خوێنـدا بگـەوزیت و.. کەچـی هەموو جارێك بۆ هـەمان مـەرگ و خـوێن و کوشـتن زینـدوو بیتـەوە،

هەر لەو رۆژەوەی بە جووتە هەڵەتە بوون ژیان بوو بە خەونێکی پڕ لە ترس و بیم و دڵەڕاوکێ، هەر بە پێ مەلە سەدەها باوك لە ناو ئاوەکەدا خۆیان راگیر دەکرد و منداڵەکانیان رووەو ئاسمان هەڵدەبڕی، هەڵقاو هەڵق بە چوار دەوری چاڵاوەکە حەشاماتێکی زۆر لەو قیامەتە ورد دەبوونەوە، پشتێن و گوریس و پەتیان هەڵدەدا، کەم کەس زاتی دەکرد خۆی غل بکاتەوە و تەسلیمی ئەو قەدەرە بێ کە ئەوانی دیکەی تێ کەوتبوو، پشتێن و گوریس و پەتەکان دەگەیشتن و نەدەگەیشتنە دەستی منداڵ و مەزنی نیوە خنکاو، کت و پڕ کە یەکێك پێی دەخزی و غل دەبۆوە دەکەسی دیکەی لەگەڵ خۆی رادەماڵی و وەك گاشە بەرد بەریەکدی دەکەوتن، هەر هەموو بەیەکەوە دەڕژانەوە ناو چڵکاوی چاڵاوەکان، ناو کەند و لەند و قۆرتەکان، دایکە هەرە بە غیرەتەکانیش وەك مێردەکانیان بە هەردوو دەستی شل و شەکەت منداڵەکانیان هەڵبڕی بوو وەك ئەوەی هانا بۆ خودا ببەن کە هەتا زووە منداڵە نەخنکاوەکانیان لێ وەربگرێ، چاوانت پڕ بوون لە گریان، ئەمەیان دوا دیمەن بوو کە ئیدی چیتر لە عۆدەی ئەوەدا نەمای پڕ بە هەردوو چاوانت سەیری بکەی، هیچت پێ نەدەکرا، کافرانە وتت: کە خودا خۆی فەرامۆشی کردبن.. ئەمن چیم پێ دەکرێ؟ بە پەلە و بە ترسەوە وتت: خودایە لێم خۆش بە و ئەورۆ رۆژێکە و بۆ منی بەندە هەر لە قیامەت دەچێ، لە چاو تروکانێکدا ئاپوورەی تێکچڕژاوی خەڵکێکی زۆر بە ناو کۆڵانەکاندا بە هەشتاوی غاریان دەدا، هەر هەموویان بە یەکەوە لە تاکە بوونەوەرێك دەچوون کە سەد سەر و سەد چاو و سەد دەست و سەد قاچ و پێیان هەبێ،

هەناسەبڕکێ یان پێ کەوتبوو، دەتووت لە تاو دەعبایەك رادەکەن، دەعبایەك لە دەعباکانی ناو ئەفسانەکان، ئەژدیهایەك لە ئەژدیهاکانی ناو خەونە خەراپەکان و پێشبینیەیە پڕ بەلاکان، دەعبایەك لە ئاو.. بەلام دەعبا.. درۆینەی ئاو لە هی ئاگر کوشندەترە، ئەو لافاوە رۆحی تۆی برد، وا تەڕ بوویت کە تا ئەبەد وشك نەبیتەوە، هەنووکە دەقاو دەق دۆزەخت لە لا خۆشە، دۆزەخێکی دایساو، رەنگە بە تەنها ئەو ئاگرە بتوانێ سەرمای ناو هەناوت بکوژێ، سەرمای دونیاو، سەرمای بزربوونی هەمینێ، لەسەر دوو پێیان وەستاوی، سەیرە هێشتا دەتوانی لەسەر قاچەکانت خۆت هەڵبگری، بە دوو چاوی پڵنگ ئاسات، وەلێ کوژاوە، دوور روانیت و سەرت بۆ ئاسمان هەڵبڕی، خودا ئەو هەموو عەزابە بۆ؟ خۆ من ئادەم نیم تا لە گوڵەگەنمەکەم خواردبێت و بەر لەعنەتی تۆو کەوتبم و فڕێت دابمە سەر زەوییەکی وەها خاپوور؟ نە هەمینیش حەوایەکی فریوە دەرە.. ئەمن و ئەو جگە لە دوو بنیادەمی کڵۆڵ و رەنج بە خەسار بێ دەرەتان هیچی دیکە نین..

تەکانت داو خۆت لە چاڵی پڕ لە قوڕاو رزگار کرد، وەك پیاوێك کە هەموو ئێسقان و جومکەکانی لێك ترازابن، هەلاهەلاو داڕزاو بە رێگەدا دەڕۆیشتی، پتر لە داهۆڵ دەچووی، خەڵکی وا پەشۆکاون کە ئاوڕ لە تۆ نادەنەوە، ئاوڕ لە پیاوێکی لە قوڕاو هەڵکێشراو، سەرکۆت و پێ خاوس، کەوتیتە جووڵاندنی پەنجەکانت نەبا بیانبەستێ، هەر دوو لا لێوت کەفی سپیان دەردا کە بۆنی تووتن و ژەقنەبووتی لێ دەهات، دەبێ زۆرت برسی بێ و

نەیزانی، دیسانەوە گوێت لە هاوارو زریکەیە، هاوارەکە دەڵێ: رماوە.. ماڵی وێرانم هەمووی بەسەر یەکدیدا رماوە، لە دوورەوە قەڵا سەرسەختانە بە پێوە وەستابوو، منارەی (چۆلی)یش رەپ و رێك بە ئاسماندا هەڵکشابوو، دەڵێن لەوێدا چوار خوا هەبووەو خەڵکی ئەم شارە بەر لە هەزاران ساڵ ئەو چوار خوایەیان پەرستووە، شەنگت نەبوو وەك هەموو جار بزەیەك لێوانت لێکدی بترازێنێ، چ پیسی و پاشەرۆك و پۆخڵی و زبڵ و زاری شار هەبوو سەر جادەکانی داپۆشی بوو، دەبێ لافاوەکەی (نوح) کوو بوو بێ؟ رووەو رۆژهەڵات سەرت هەڵبڕی، سوور سوور خوێناوی لێ دەتکا، حەزت دەکرد خۆر زوو دەربکەوێ و دڕ بە هەورەکە بداو دونیا کزر بکاتەوە، هەڵمێکی گەرم لە خاك بەرز بێتەوە، ڕەوە سەگێك بە ناوەڕاستی جادەکەدا کەوتبوونە دوای یەکدی و دەوەڕین و پاشەڵی یەکدیان بۆن دەکرد، دوو گۆلەسەگ، یەکێکی سپی و ئەوی دیکەیان رەش، تاوتاو لمووزیان لێك گیر دەکردو شەڕیان لەسەر دێڵەسەگێك دەکرد کە لەوەدابوو بە با هاتبێ، ببوونە قاندڕو پاش شەڕێکی گەرم سپییەکە بەزیو گۆلەسەگی رەش بێ هیچ حەیاو شەرمێك لەگەڵ دێڵەکە جووتبوون، لە بەرچاوی ئاپوورەیەکی تێك قژقژاو گۆلە تەکانی دەداو سەگانە دەیژەند، بێ ئاگا لە تۆو لە خەڵك و لە لافاو، عەیبە هیچ دیمەنێك لە هەمین غافڵگیرت بکا، بۆنی (چا)یەك کەللەی تاساندی، بەیانیان چ جوان و رەنگین (چا)ی دێم دەکرد، بەیانیان خەمێکی قورس دڵی دەخواردی، خەمی ئەوەی رۆژێك بێ و بێیتەوە ماڵی خاڵی، ئێواران بە تاسووقەوە دەهاتیتەوە، چەند جوان بوویت کە درۆت

دەکرد، شەوانە بە درۆکانت دەکەوتە سەرپشت و قاقای ژوورە خامۆشەکەی داگیر دەکرد، هەمین ئەوشۆ لەگەڵ (ئیمامی عەلی) زۆرانێمان کرد، دوای یەك مل لە بەر مل نان پشتیم لە زەوی دا، ئیدی هەر شەوە و ئیمامێکت لە زۆرانبازیدا دەبەزاند، هەر شەوە و لەگەڵ پێغەمبەرێك قسەت دەکرد، هەمینی سەلارو سەنگین دەیزانی بەم درۆیانە پاساوی مایەپووچیت دەدەیتەوە، مایەپووچیت لە راوە ریشۆڵەدا، شەوانە تا درەنگ چیرۆکی یوسف و زولەیخا و.. خورشیدو خاوەر.. دێوو درنجت دەگێرایەوە، ئەویش بە دەم پینەو پەڕۆکردنەوە بە درۆ گوێی لێ دەگرتی.. دەترسان.. دەبوو یەکێکتان لەو ژوورەدا، لەو کاولەدا، قسە بکەن دەنا لە تەنیایی و ترسدا دەتۆقین...

ژنێك تیژ بە تەکتا تێپەڕی و تەشك و تیریژی، لە پشتەوەڕا، کت و مت لە هەمینێ دەچوو، تاوێ ڕەدووی کەوتی و سێ جاران هاوارت لێ کرد: هەمین.. هەمین.. کچێ هەمین.. ژنەش بە دەم بای غارەوە شێتانەو بە پەلە ئاوڕی لێ دایتەوە، بێ ئەوەی ورتە بکا لە پێچپێکدا ونبوو، تەمەکە نەیهێشت رووخساری ببینی، رۆینی بە لۆقەی هەر لەو دەچوو، تەریق بوویتەوە، تاك و تەراش لێرەو لەوێ دەرگا دەکرایەوە و دەرگا دادەخرا.. ئەوەتا ماڵی (خدری پاشا)، پلت بە زەنگەکەوە نا.. زۆری پێ چوو تا پیاوەکانی بە چەکەوە دەرکەوتن، زۆرتری پێ چوو تا (پاشا) خۆی دەرکەوت، ئا کوڕینە جەمەدانی و قۆندرەی لۆ بینن، هەر هەنووکە پیاوەکانی خۆم دەنێرم، خۆ دەرزی ذیە بزر بێ، هەر هەنووکە لە هەموو مزگەفتەکانی هەولێرێ جاڕ دەدەین، ناکرێ پاشا.. ناکرێ..

هەمین حەیای گەورەیە، چاڕدانیش بۆ منداڵە، نەك ژنێکی گەورەو گران.. راستە.. راستە ئەتوو ئاگات لە خۆت نیە.. ئەوشۆ سێ جاران بەس لە دەرگای مەت دایە، تۆ بڵێی وابێ؟ سەرکزو شەرمەزار خدری پاشاو پیاوەکانیت بەجێ هێشت، کەڕتر بووی لەوەی گوێت لە هاوارەکانیان بێ، دەروێش.. مەڕۆ.. وەرەوە.. قسەمان پێتە.. هیچ.. تۆ بڵێی تەواو شێت بووبیت، کەواتە گەر بچیتەوە بەر قاپی کۆشکەکەی چەلەبی، سمایل بەگ، عەولا قەدۆ، برایم بەگی سەرکەپکان، عەونی موفتی زادە، کوڕەکانی مەلا عەبدی، قەسری زەرد، قەرەنی جامباز، کوڕەکانی چەلەبی.. رەنگە ئەوانیش وەك خدری پاشا پێت بڵێن: ئەوشۆ سێ جاران هاتیە بەر ئەم قاپیە.. بۆ نا؟ نەهاتنەوەی هەمین گێژو وێژی کردی، وڕێنەو خەیاڵی خەراپ، بە دەم ڕێوە کابرایەکی پێمەڕە لەسەر شان رایگرتی: کووە دەروێش سەرکۆت و پێ خواسی؟ نەتناسی.. (هەمین)م بزر کردیە، سەرێکی باداو غەیب بوو، لە ژنێکت پرسی، ژنێکی سەرکۆت، ئەتوو (مەیاس) نیت؟ مەیاسی کەنگرفرۆش.. دۆستی هەمینێ؟ سەری راوەشاندو فەرامۆشی کردی، بە گومانەوە تا بزر بوو ئاوڕی دایەوە، ئەوەش ماڵی (قازی)یە، لە دەرگات دا، لە هەمینت پرسی.. کارەکەرەکەیان کردیەوە.. لێرە نەبووە.. لێرەش نەبووە؟ دەرگایەکی داخراوو پرسیارێکی مردوو لەسەر زارت، دەرگا نەما لێی نەدەی، هەتا چوویتە لای ئەو ژنە قەرەجەی کە فاڵی دەگرتەوە، لە فنجانی قاوەدا بۆ بەختی خەڵکی دەگەڕا، وتی: پەلە مەکەو هەر هەنووکە لە ناو فنجانەکەی مندا دەردەکەوێ.. هەتا چوویتە ماڵی (فاتە

کوڕانی) کە دەیانووت تاکە ژنێکە لەم شارە گەوادی دەکا، تۆ بڕوات نەدەکرد، هەمین پێ بزانێ خۆی دەکوژێ، کەوتیتەوە غایەلە، خەیاڵ وەك کۆترێکی تەرەو ماندوو کە دوور ڕۆیشتبێ، دەهاتەوە، نەتزانی چۆن گەیشتیتەوە کن ئاشەکەی چەلەبی، ئاشەکەش دەتووت سەرمای بووەو وەك پیرە پیاوێکی سیلدار دەکۆکی، دەیەها ساڵە لەو کۆکینە ناکەوێ، وەك مێشکی تۆ هەسانەوەی بۆ نییە، تا نزیکتر دەبوویتەوە لە ناو کاسەی سەرتدا هاڕەی دەکرد، کەوتیتە نێوان ئەو دوو هێڵە ئاسنینەی شەمەندەفەرەکە بە بنی دونیاوە دەگەیەنێ، چەند کەسێك تا هەنووکە قیتارەکە کوشتوونی، جگە لە چەند کەرو مانگاو سەگە بەڕەڵلا، دەڵێن هەندێك لە تاو خەفەتو قەهری زەمانە خۆیان فڕێ داوەتە بن پێچکەکانی، لە پانیو بەرزی دیواری کۆشکەکە رامای، ئەو کۆشکەو قەسری زەردی کوڕەکانی دونیایەك عەردیان داگیر کردووە، بە نەشئەوە لقو پۆپی درەختەکان دەشنانەوە، قاژەقاژی ریشۆڵەکان ئەو ناوەیان پڕ کردبوو لە قەڵەبالغی، ئەم ناوە چۆڵە.. وەلێ لە دوورەوە خەڵکی وەك شارە مێروولە بەسەر جادەو کۆڵانەکاندا رژاون، شپرزەیی پاش لافاو خێڵو ئەبڵەقو سەرسامی کردوون، چەند ژنێك بە هەڵەداوان بە قەراغی سکەکەدا عەبایان لە دوو دەخشا، خۆزگەت دەخواست یەکێکیان هەمین بێو بۆ تۆ بگەڕێ، لەو هەراو غەڵبەغەڵبە هیچ حاڵی نەبووی، وەك رەوە قەڵەڕەشێك چینە بکەن لێت تێپەڕین، ئەوەتا دیسانەوە هاتیتەوە بەردەم کۆشکەکەی چەلەبی، لەوە دەچێ جارێکی دیکە، یان دەیەها جاری ترو لە زەمانێکی زۆر زوودا بەردەوام ئاواهی

واق‌ورِماو لێرە وەستابیت، هەر هەمان دیمەن، جەنجەڕێك لەو ناوە کە هەتاوی چەندین هاوین‌و بارانی چەندین زستان گەڕو ژەنگاویان کردووە، ئەسپێکی بۆرو بێ ئاگا لە دونیا سەری لە ئاخوڕەکە ناوەو کاوو جۆ دەکرمێنێ، پیاوەکانی لە بەردەرگاو سەگەکانیش لەو ناوە لە جریت بازی نەدەکەوتن، دەقاو دەق وەك هەنووکە ترساویو هەمینت لێ ون بووە، لە خەیاڵێکدا، یان لە چەندین خەیاڵو ختوورەی هەڵبزڕکاوی ناو شەوو رۆژەکانتدا بە دوایدا گەڕاویت، هەمیشە وات هەست کردووە گەر هەمین لەم دەرگا پان‌و بەرینەوە بچێتە ناو ئەم کۆشکەی کە سەد ژووری تێدایە جارێکی دیکە نایەتە دەرەوە، ئەو کۆشکەی لە کۆشکی ناو حەکایەت‌و ئەفسانەکان دەچێ، تا هەنووکە جگە لە (مەلیك فەیسەل) کەس ناو ئەم کۆشکەی نەدیوە، شەوی وا هەیە هەمین بە سەعات باس لە تاق‌و پەنجەرەو رایەخ‌و شتە عەنتیکەکانی ناو ئەم کۆشکە دەکاو، دەیگوت (ئاودەستەکەیان لەم ژوورەی مە خۆشترە.!)، دەرگاوان‌و پیاوان تووڕەو تۆسن، بە گومانەوە، لە تۆ رامان، مەگەر دەرگاوانەکانی دۆزەخ وا ناشیرین‌و دڕدۆنگ لێت بخوڕنەوە، ئاواهی بەسەرتدا هاوار بکەن، بۆ ئەوەی رووی خۆتیان لێ بشاریتەوە شلکە دارێك کە وەك حەیزەران داتاشرابوو بۆی نووشتایتەوەو هەڵتگرت‌و پشتت تێ کردن، لە شەرمانا بڕبڕەی پشتت ئارەقەی کردەوە، ئەمشەو هەر هەمووان حاشایان لەوە کرد (هەمین)یان دیبێ، هەر دەتووت عومرێکی درێژە بە دوایدا دەگەڕێی، تا لە گەڕەکی خۆتان نزیکتر دەبوویتەوە سووکتر هەنگاوت هەڵدێنا، بە ئومێدی ئەوەی هەتا دەچیتەوە نان‌و

قاوەڵتی ئامادە کردبێ، دوای لێك دابڕانی شەوێکی بێ کۆتا بە یەکدی شاد ببنەوە، هەر دەڵێی ئەمشەو شەوێکی دەعبایەو سەد شەوی دیکەی لە ناو هەناودا بووە، بە دەم ڕێوە سەدەها ڕستەو قسەی پچڕپچڕ لە مێشکتدا دەزرنگایەوە، تێکەڵ دەبوون: ژن‌و مێردێکی کۆك کەس قڕەی نەبیستبوون، ژنەکەی بەدعەمەلە ئەوەندەی دیکە شێتیان کرد لەسەر شەرەف هەردوو عەشیرەتەکە یەکدیان بڕاندەوە ژنێك شەو ڕۆژ شێت بوونی براکەی کە هێنایانەوە لە دەشتێ مەسڵەتی دەکەن لە پشتەوە خەنجەر دوێنێ نا پێڕێ بەستر پیرێ نەماندیتی‌یە سەفەریکردبێتەوە.. خزماندە شتێ ئەگەر بڕۆمنامدۆزیتەوە.. لە دوورەوە ئاپوورەی ژن‌و پیاوو منداڵانی گەڕەك بەرەو پیرت هاتن، ها دەرویش ئەمشەویش نەتدیتەوە؟ دەنێو بازنەی مەزن‌و منداڵی گەڕەك، ژن‌و پیاوی شپرزەو شێواو بزر بوویت، تا ئەو وەختە بە پەقرەج‌و جام‌و تەشت‌و مەنجەڵ‌و کتڵی ئاویان لە حەوشەو ناو ژوورەکان دەردەدا، بازنەی ئاپوورەیەکی دەم بە هاوارو ناڵەو زەنا تۆیان گەیاندەوە بەرقاپی کەلاوەکەتان، غەریبانە تێ‌ی ڕامای، ناکرێ تەنها یەك شەو بێ ئەو ماڵەتان جێ هێشتبێ، لافاو دیوارێکی لا تەنیشتی چەپی ڕماندبوو، دەرگاکە کراوەو زنجیرێکی ژەنگداریش تا ناو قوڕاوەکە درێژ ببۆوە، دەتووت عومرێکە ئەم ماڵە کاولە ئاشەو دەنگ‌و ڕەنگ‌و بۆنی ئادەمی نەبینیوە، زۆر ترسایت وەژوور بکەویت، لە دواوە پاڵەپەستۆی خەڵکەکە لە دەرگاکەوە تۆیان پەڕاندەوە حەوشەکە، پێت شەرم بوو بپرسیت: ئەرێ چەندە هەمینم بزر کردی‌یە؟ تۆڕەکەت دەنێو قوڕو لیتاوی

حەوشـەکەدا زیـواڵ زیـواڵ رزابـۆوە، لـق و پـۆپی دار هـەنجیرو هەنارەکەت لە دە لاوە شکابوو، سەدەها ریشۆڵەی مردوو، سەرئاو کەوتوو، ژێر ئاو کەوتوو لە نێو حەوشـەکەوە تا ناو کۆڵانیش بێ ناز پەرش و بڵاو ببونەوە، لەوە دەچوو خنکا بن و لە بن دەست و پـێی منداڵـە هـارو هاجەکانـدا پـان و پلـیش بووبێتنـەوە، لامپـاو فـانووس و قەندیلـە داگیرسـاوەکانی شـەویش کوژابوونـەوە، شووشـەی لامپاکـەش شـکابوو، بـۆنی نـەوتی رژاو دەهـات، واق ورمـان و بـێ دەنگیـت هـەراو زەنـای ئـاپوورەی دەرو دراوسـێیەکانتی خامۆشتر کردبۆوە، شمشـێرو زەرك و دەفەکـەت کەوتبوونـە خـوارەوە، دەروێش نـەمان هێشـتووە کـەس دەست لـە شتەکان بدات، دەم و چاوەکان بە تۆ نەناس بوون، تۆ بڵێی ئەوانە خەڵکی گەڕەك بن؟ نێرەکەرو مانگاکەشت بزرن، ئەوەتان لە ماڵی سمەی قەساب، کەسێك هاواری کرد، مەترسە بێ ئالیك نەبوون، هـیچ شتێك لـە شـوێنی خۆیدا نـەماوە، زۆپاکـەش، دەتـووت سـەد ساڵە کوژاوەتەوە، خۆڵەمێشێکی زۆر بەو ناوەدا رژابوو، باڵـەکانت کـردەوە وەك کەسـێك بیـەوێ بفـڕێ یـان خـەڵکی لـە خـۆی دوور بخاتەوە تا هەناسەیەکی پاك هەڵمژێ، هەستت کرد هێشتا دەنێو لافاوەکەدای، ئەمجارەیان لە بری ئاو خەریکە خەڵك دەتخنکێنـێ، رادەچـڵەکیت و خـۆت رادەپسـکاند، وەك ئـەوەی بتـەوێ لـە شـەپۆلێکی ترسـناك خـۆت قورتـار بکـەی، شـەپۆلێکی نـاقۆڵا کـە بیەوێ بتبات، ویستت هەموو شتەکانی ئەو کەلاوە کۆنە بەسەر بکەیتـەوە، بـێ کـەرو مانگاکـە حەوشـەکە ئەوەنـدەی دیکـە بـۆنی خـاپووربوون و مـەرگی لـێ دەهـات، دەنگێـك هاتـە بـەرگوێت:

---

مریشکەکان و جووجەڵەکانت وان لە ماڵی بابە شێخ، سەیرە دەتوت ئەو ماڵە میرات بووەو لە یەک شەودا دابەش کراوە، برسی و ماندوو، دوای برینی ئەو رێ نەبڕاوەیە لە بەردەم زۆپاکەدا، بێ شەنگ و هێز، وەك ئازیز مردە بەسەر ئەژنۆکانتا کەوتیت، لەسەر لبادێکی شڕو تەڕدا مردووانە لە خۆڵەمێشەکە رامایت کە هیچ پشکۆیەکی تیا نەمابوو، هێدی هێدی بە شەرم و ترسەوە خەڵکی لێت تەکینەوە، تاو ناتاوێك تارمایی ژنێك دەهات و بێ دەنگ قاپێك چێشتی لە تەك قاپێکی دیکە دادەنا و، ون دەبوو، ریزێك لە قاپ و لەگەن کە پتر لەوە دەچوو بۆ ماڵی پرسەدارێك ریز کرابن و دەیەها پیاویش لە گوندە دوورەکانەوە بۆ سەرەخۆشی هاتبن و لەو قاپانە بخۆن، بۆنی گەرمی چێشتەکان رۆژگارێکی پر لە ئولفەتی خۆت و هەمینی بیر هێنایتەوە، داتە پرمەی گریان، نەتتوانی شپرزە بوون و خەمی خۆت لە ژنەکان بشاریتەوە، کەس نەیوێرا هیچ بڵێ، ژنان هیچیان نەوت، تەقەللایان نەدا، زانیان بشمری بە بێ هەمینێ نان ناخۆیت، نەیاندەزانی چی بکەن و چۆن چۆنی دڵنەواییت بکەن، هەستی ژنانە پێی دەووتن کە دەروێش لەو نێرەکەوانە دەچێ کە لە دوای بزربوونی ماکەوەکەی دەمرێ، تا دەهات دەورت خامۆش و چۆڵتر دەبوو، لافاوەکەش هەموویانی شپرزە کردبوو، دەبوو دەورت چۆل بکەن، هیچ نەبێ دوای ئەو خۆڕەتاندنەو گەڕان لەو ماڵ بۆ ئەو ماڵ، لە هەزار دەرگا دان و کردنەوەو داخستن، وەڵامی زۆری پڕ لە نائومێدی و تێرامانی پڕ گومان و سەرسامی و زار داپچڕین و عەقڵ تێکچوون و وڕێنەی دڵ پڕوکێن، دەبوو سەرخەوێك بشکێنێ، ژنان

پیاوەكانیان بانگ كرد، چوار دەستە هەڵیانگرتیت، وەك تەرمێك بەرز بكەنەوە كێلیان كردیتەوە، لە پاڵ دیوارەكەو لە بنە بانێ جێو بالینگانێكی وشكیان بۆ راخستی، تەمێكی كشاو بەسەر چاوتدا نەیدەهێشت بزانی كێن، بێ شك دەرودراوسێی چاكو جگەرسۆزو دڵ بە تۆ سووتاون، غەڵبەغەڵبێكی غەمهێنو جەرگ چزێن لە ئاسمانی بەرتەنگی حەوشەكە دەهاتە بەرگوێت، هەراكە لە گوێتدا دەبوو بە نووزە وەك ئەوەی ئاوزینگ بدەیتو لە گیانەڵادا بیت، ئەم ماڵەش لەوەتەی هەیە هەروا پەرپووت بووە وەك ئەوەی لەم دونیایەدا هەردووكتان سەفەری بووبن، تیشكێك لە ئاوێنە شكاوەكەوە چاوانتی بە شەوارە دەخست، تیشكێكی باریك بەقەد دەزوویەك، ئەو رۆژەی ئەو ئاوێنەیە شكا هەمین حەجمانی لێ برا، دەرویش ئاوێنە شكان واتا كۆستو كارەسات، با خێرێك بكەین تا تووشی نسكۆیەك نەبووین، هەر دەتووت لە تەكتایە دەتدوێنێ، دەرویش بۆ ئەوەندە كەلەكە دەگۆڕی.. بنوو.. بنوو.. ئەتوو گەلەك هیلاكو شەقی، خەونی راستەقینە بوو یان زیندە خەو، تارمایی ئەو بوو هاتە ژوورێ، هاتیتەوە هەمین؟ تارمایی ئەو پڕ بە ناو دەرگاكە وەستا بوو، بە یەك باز خۆت گەیاندێو پرت پێدا كرد، رەوەیەوە، وتت: هەنووكە دێتەوە.. ناتوانێ تا ئەبەد تەوەللا بێ، وابوو، چاو تروكانێكو تاوتاو سێبەری سپی ئەو بە بەرچاوتا گوزەری دەكرد، بێ شەنگو توانا لێی رادەمای، لە پێ وردیلەكانی ورد دەبوویتەوە، ئەو دوو پێیانە قەڵەشتی بوونو سەرماو گەرما هەلاهەلای كردبوون، ئەو دەستانەی سەرماو ئیشی زۆر گرژی كردبوون، دەستی دەخستە

سەر نێوچەوانت و دەیپرسی: دەروێش خۆ گرانەتات نییە؟ کت و پڕ هەمینت لێ بوو بە کار ئاسکێك.. نا.. مامزێك کە هەردوو سمی سم نەبوون، پەنجەی نەرم و نیانیان لێ رسکابوون، چاوانی زۆر رەش و جوان و بێ خاڵ و گەردی دەدرەوشانەوە، دوو چاوی بێ بیلبیلە، دوو گەوهەر لە بری گلێنەکان قووڵ، لەوێدا، دوور وەك ئەوەی لە بنی بیرێك بن دەدرەوشانەوە، وەك ئاسکێك خۆی لە نێرییەکەی هەڵبسوێ نەرم نەرم خۆی تێ هەڵدەسوویت، موچڕکەی لەزەتێك بە دەمارەکانتا مێرووڵەی کرد و لە ناو هەردوو چاوتا رۆشنایی پڕشنگ لە دوای پڕشنگ فڕێ دەدا و ژوورەکەی رووناك دەکردەوە، رووخسار رووخساری هەمینە و پشت و بەرسکیش هی ئاسك، سەرپشتی بە رەنگێکی سوورباو دەبریسکایەوە، بن سکی سپی سپی وەك چوڕی شیر، بە هەردوو لاتەنیشتیدا پشتێنەیەکی قاوەیی کە لە ژێریدا پەراسووە زۆر ناسکەکانی یەکە یەکە دیار بوون، ئەوەندە ناسك کە تۆ نەتدەوێرا لە باوەشیێ بگرێ نەبا دەندە و پەراسووەکانی بشکێن، لە سپیاتی سەر لووتی ورد بوویتەوە کە لە نێوان سوورایی رووومەتی لە تێکەڵبوونی بەفرو خوێن دەچوون، سوورایییەك کە تا دەگەیشتەوە ژێر چەناگەی باریکی رەش دەبۆوە، وەلێ رەشێکی تا بڵێی دڵگیر، تۆ مرد بوویت یان خەتبوویت، هەر کامیان بێ نەدەجووڵای نەبا ئەو مامزە جوانەت بڕەوێتەوە، بە لەنگاز بێ، تۆ هەمیشە ئاواهی راوچییەکی شارەزای دەشت و دەر بووی، هەر ئاواهی هێمن و لەسەرخۆ بوویت، بە حەوسەلە و پشوو، نێچیر ئاواهی خۆی نەهاتبێتە ناو پارێزی تۆ خۆت لە دوای شەقی

نەکردووە، ئەوەی کە بەزۆر راوبکرێ یان دەمرێ یان ئەوەتا زوو تەوەللاو هەڵەتە دەبێ ،نەتدەوێرا پێی بڵێی: ئەرێ لە کێندەرێ بووی؟ ئەوەندە هیلاك بوو گەزارەی دەردەکێشا، کە زاری دەکردەوە زمانی یەك پارچە خوێناو بوو، لە نیگای ماتو پڕ ترسی لافاوەکەی ئەمشەوت بیرکەوتەوە، لە لەرینەوەی زۆر ناسکی بەرسکی رامابوویت، شەلاڵی ئاوو ئارەقە، ویستت دەست بە لەش و لاری دابێنی و بزانیت ئاخۆ هیچ برینێك، گۆشتی هەڵتەقیوی ساچمەو گوللەیەك نادۆزیتەوە، لە تەوێڵیەوە بۆ سەرملی و.. پشتی و.. تا گەیشتیتە گوانەکانی، بە دەستی راستە گوانەکانیت هەڵدەگلۆفی و نێرانە بە سەری پەنجەکانت دەتخوراندن، بێ ئاگا لە خۆت گەمەت لەگەڵ دەکردن، سەرت خستە بەرسکی، ئەوەندە تینوو بوویت هەر دەتووت سێ شەوو سێ رۆژە ئاوت نەخواردۆتەوە، تفی ناو قورگت وشك ببوو، دەمت لە گوانی پڕ شیری نزیك خستەوە، بە هەردوو لێوی وشكو شەقارت گوانی تەڕو سووربایوت گرت، حەزت نەکرد گوانەکانی لە نێوان ددانەکانتا گیر بکەیت نەبا ئەزیەتی بدەی، دوو سێ تکە شیری خەستو شیرین رژایە ناو زارت، لە تاو تینوێتییەك کە خەریك بوو بتخنکێنێ بە ئاستەم لێوەکانت لەسەر گوانەکانی توند کردو مژیت، مامزەکەت راجفری و باڕاندی و هەڵبەزییەوە، چاو تروکانێك و گوانی لە دەمتا راپسکاند، بەسەر سینگتا بازرەقەی کردو، بە چوار لۆقە تێی تەقاندو رەوییەوە، کە ئاوڕێکی پڕ ترس و ئاسکانەی دایەوە جگە لە هەمین کەسی دیکە نەبوو، بۆ نەیهێشت زاری تاڵت، دەمارە وشکەکانت تەڕ ببنەوە، هەزار

حەیف و موخابن کە ئاواهی ڕەوییەوە، بە شەرمەوە کەوتیتە دوای، لە ناو حەوشەکەدا گێرەت پێ دەکردو راوت دەنا، کەچی ئەوەندە سرك بوو نەدەگیرا، بە ئاستەم لە دواوە پەنجەکانت، ئەو وەختەی لەپەو روو دەکەوتیت، بەر نەرمایی پاوو پووزی دەکەوت، وەك حەیوانێك حەز بە گەمە بکاو بیەوێ خۆشەویستانە هیلاکت بکاو ئەوسا لە پاش تامی تامی‌یەکی زۆر خۆی هەڵداتە ناو باوەشت، لەوە وشکتر بووی ئارەقە بکەیتەوە، ئەویش بێ مروەتانە خونچەی دەمی دەکرایەوەو قریوەی حەوشە تەنگو تاریکەکەی دەکردەوە بە دەشتێکی پڕ لە نێرگزەجاڕ، دواجار بازێکی داو لە دەرگای حەوشەکەوە خۆی هەڵدایە ناو کۆڵان، کەوتیتەوە دوای، خەونە یان راستی؟ بەردەمی کەلاوە کۆنەکەتان ساکە دەشتێك بوو، دەشتێکی کاکی بە کاکی، هەر دەتووت هەموو خانووەکانی گەڕەك بە فوویەك، بە سیحرێك چوونەتەوە ئاسمان، تا تۆپتر غارت دەدا مامزەکەت دوورتر دەکەوتەوە، تا دوورتر دەکەوتەوە دەبۆوە بەو کارمامزە تۆقیوەی ناو حەیرانەکانت، دوورتر لەوەی کە بیگریت، لەوە نەدەچوو هەرگیز پێی بگەیتەوە، تاوتاویش بە ترس و دڵەڕاوکێوە، ترسی پیاوێکی راوەدوونراو ئاوڕت لە کەلاوەکە دەدایەوە، خاپوورو وێران، لە دوورەوە وا دیار دەکەوت کە دارو پەردووی بەسەر یەکدیدا رمابێ، تاکە کەلاوەیەکی داڕووخاوی ئەو ساکە دەشتە کە جوانی سەد بەهار بشێوێنێ، دەشتێکی پڕ لە سەوزەگیاو گوڵاڵەسوورەو هەڵاڵەو حاجیلەو بەیبوونو نێرگزەجاڕ، چ زوو زستان نەماو بەهار هات، ماندووت کرد، کەوتە نەرمە لۆقەو دڵت

بەوە خۆش كرد كە تاوێكی دیكە گەر تەكان بدەیت و هیلاكی نەتبەزێنێ دەیگەیتێ، لەو دوورەوە هەر ئاوڕی لێ دەدایتەوە، چاوانی رەشی دەدرەوشانەوە، هەر دەتووت دەیەوێ لەو شارە لەعنەتی‌یە دەرتكا، دوا ئاوڕت دایەوە، كەلاوەكەت لێ بزر بوو، ساتمەیەكت كردو لەپەو روو كەوتیت و یەك تەختە راكشایت و خۆت بەسەر پشتدا وەرگێڕا، كە بە پەلە هەستایتەوە نەبا كارمامزەكەت لێ وێڵ بێ، شێتانە بە هەر چوار دەوری خۆتدا روانیت، خۆت و كارمامزەكەت كەوتبوونە ناوەڕاستی بازنەی سەدەها راوچی تفەنگ بە دەست و لوولەی سەدان ساچمەزەن لە بەر هەتاودا دەبریسكانەوە، هەڵقاو هەڵق گەمارۆ درابوون، بە قەد بالاّی زەلامێك خۆیان لە قۆرت و چالاّن نابوو، جارجارە بەیەكەوە سەد.. نا تۆ بڵێ.. هەزار جەمەدانی وەدەردەكەوتن و بزر دەبوون، هەزاران چاوی سوورو تووڕە لەسەر سیرەی تفەنگەكان گڕی غەزەبیان بەر لە گوللەكان بۆ تۆو بۆ كارمامزەكە دەنارد، پەنجە داگرتن و تەقینەوەی هەزاران گوللە.. جاروبار دە دوانزەیەكیان بەیەكەوە لە چاڵەكان دەهاتنە دەرێ و وەك بزن مشك و سەگسارو گۆڕهەڵكەنە خۆیان لە چاڵەكاندا دەشاردەوە، بێ پەنجەو دەست لەرزین نیشانەتان لێ دەگرنەوە، لەوە دەچوو هەریەكەو جێ و سەنگەری خۆی خۆش بكات، لەو ساكە دەشتەدا جگە لە تۆو ئاسكە هەمین و راوچی‌یە دڵڕەقەكان هیچ خەڵقەندەو فرندەیەك نە لە زەوی و نە بە ئاسمانەوە نەمابوو، تا دەهات لە ترسانا هەردووكتان بەرەو لای یەك دەخشین، لەسەر لەپ رووەو یەكدی، مامزی گوێ سووك بە هەر چوار لادا دەیڕوانی، گوێ بیستی

چرپەچرپی راوچی‌یەکان بێ ئۆقرەی کردبوو، تۆش لەگەڵیا گوێت قولاغ کرد، زانیت هەر تاوێکی دیکەیەو یەکەمجار بە یەك فیشەك مابەینی هەردوو چاوانی دەتەقێنن.. بە سەرو ملێکی شلو خوێناوی‌یەوە، کە هێشتا لەشی گەرمە، غار دەدا.. دوو بازو لەتر دەداو هەر چوارپەلی دەشکێن.. مامزەکەت لە خوێندا دەگەوزێو سەرو ملی دەکەوێتە بن دەستو پێی خۆی.. کەچی راوچی‌یەکان بسکەی سمێڵیان دێو شاگەشکە بە شکاندنی ئەو نیشانەیە قاقاو قریوەیان لەو ساکە دەشتە دەنگ دەداتەوە.. گوێت لێ بوو بە دەنگێکی پڕ لە رقو کینەو ترسەوە کە تێکەڵ بە خۆشی‌و لەزەتی کوشتنی مامزیك بێ.. بە قورگێکی نووساوەوە بە یەکدیان دەگوت: نەکەن گوللە بە خەسار بدەن.. هەریەکەو نیشانە لە شوێنێکی کاریگەری بگرێتەوە.. ئەمن دەفەی سنگی.. ناوچەوانی بۆ من.. کەللەسەری لۆ توو.. ئێوەش هەریەکەو پەلێکی ببێژن.. گەر پیاوی چاوی چەپی لۆ منو چاوی راستەشی ئەتوو نیشانەی لێ بگرەوە.. وای لەو کافرانە دەروێش.. پیاوانی تووڕەو داخدار.. لەوە ناچێ کوشتنەکەیان مەبەست بێ.. لەزەت لە راوەکەیە نەك لە نێچیر.. ئەمن لێرەوە دەمەوێ گوللەکەم گوێی چەپی ئاگر بداو لە گوێی راستەیەوە بێتە دەرێ.. هێی کوڕینە دەستتان نەلەرزی.. حەیامان نەبەنو وا نەبێ بە برینەوە لە دەستمان قورتاری بی.. ولاخ جغەرەکەت بکوژێنەوە.. لە لای (با)وە نەچیتە پارێزی.. پارێز گرتن لە مامز وا نابی مالۆسینە.. ئەوە دەنگی (هۆمەری سەرکار)ە، خۆیەتی، بابی هەمینێ.. گۆتم جغەرەکانتان بکوژێننەوە نەفامینە، راو وا نابیتن، ئاخر

سەگبابینە وام لێ مەکەن لە جێی مامزەکە یەك دووانێکتان سارد کەمەوە، لە دووری دوورەوەش لەگەڵ تۆزو بایەکدا هەر ئەسپ سوارەو کەندو لەندی دەبڕی، زورگێك دەیدایە دەست زورگێکی دی، تەلانێك رووەو تەلانێکی دیی دەیفڕاند، سوارەکان هەر هەموو گەیشتنە پارێزەکەو بوون بە هەڵقەیەك بە دەوری ئەو پیاوانەی دەست لەسەر پەلاپیتکەی تفەنگ خۆیان دابووە پشت تەپۆلکەکان، یان جێی ئەژنۆیان دەنێو چاڵەکاندا خۆش دەکرد، هاواری خدری برای هەمینێ دەگەیشتە گوێی هەمووان: جغەرەکانتان بخەنە ژێر خۆڵو گڵەکان، (با) بۆنی تووتنەکەی لۆ ببات لە دەستمان قورتار دەبی.. هێشتا زووەو تەرەی مەکەن، هەڵقاو هەڵق سوارو پیادە ڕووەو لاتان دەهاتن، هێی هەمین ئەوە سەری چەند ساڵانە ئەو راوچییانە لە نیچیرێکی وا دەگەڕێن، هێی کوڕینە کە ئەمن دەنگم دا ئەنگۆ هەنگینێ بیکەن بە هەڵڵاو هاتو هاوارێك تاوەکو سەری لێ بشێوێ: ئەو هاوارە پڕ لە داخە پڕاوپڕ دەڕژایە گوێی هەمینێ، هاواری هۆمەری بابی، راوێکی گەلە خۆشەو تێکی مەدەن، راوی هەموو عومرەو ئەوەی پارێزەکە بپەڕێنێو ئەو راوەمان لێ بدۆڕێنێ پیاو نییە لە گوندیش ترۆ دەکرێتن، یان خوینی نگۆ.. یان هی ئەو مامزە، ئەو هاوارەش هی (کانەبی) برای بوو، هاوارو قاوو غەزەبی باوكو برایان ئەسپەکانی خستبووە سەرحیلەو سمکۆڵان، لە دوورەوەش هەوهەوی سواران بە دەم بای غارەوە هەردەهات، لە دە لاوە کوڕگەلی گوندی بەسەر ئەسپەکانەوە دەلەنگینەوە.. ئەمن حەز دەکەم یەکەم کەس بم کە مامزەکە هەستێنم، هەر هەموو بەتەمای

رکێف لێدان بوون.. ناڵەی (هۆمەری سەرکار) هەر هەموو پیاوەکانی سڕکرد: لە بن دەستیو پێی هەر ڕاوچییەك قورتاری بی.. لە جێی ئەو مامزە ئەمن ئەو کەسە دەکوژمو دەیخەمە بەر لموزی توولەو تاژییەکان، لەگەڵ ئەو هاوارە راوچییەکانی نێو چاڵەکانو پشت تەپۆلکەکان خۆیان کێل کردەوە، هەر دەتووت مارمێلکەو ڕەشەمارو بزن مشکن سەر دەردێننو دەیخەنەو ناو دەفەی سینەیان، هەر هەموویانت دەناسییەوە، خۆیان بوون، پیاوە توورەو تۆسنو دەمارگیرەکانی کۆنە گوندەکەی خۆتان، ئەو تۆلازو جحێڵانەی گوندی کە بەدزییەوە حەزیان لە کچانی ئاوایی دەکردو لەگەڵ حەیرانێکی تۆ دەمردنو زیندوو دەبوونەوە، هەر هەموویانن، لە قاوەچییەوە بیگرە تا مەلاو فەقێیەکان، کەریم مەیتەرو وەسمانە خێڵو کوڕانی ئاغا.. لە گوندەکانی دیکەشەوە هاتبوون، هەموویانت دەناسییەوە.. هەتا لاوك بێژو حەیران بێژەکانیش هاتبوون ئەو حەیرانە بکوژن کە لە قورگتایەو بۆ هەمینە، ئەوەتان: مارخۆی هاودیانێ، مەلا وسوی چاوەش، ئەحمەدی کامەلا، عالی مێرەمە، رسو خۆشناو، رەشاغە، بوداغ بەگ، مامێسی گاوان، مەلۆکی میر حاج، میری روستێ، عەلی عەجەم.. هەر هەموو فەرماندەو سەرهەنگەکان، قوماندارو سەرقۆڵان.. هەر هەموو دەستیان داوەتە تفەنگەکانیان، خۆیان دابووە دەست شارێگەو توولە ڕێگەکان، کەندو لەندەکان، بە هەردوو چاوان لە (باپیر ئاغا) دەگەڕای، خۆی پیشان نەدەدان، دەتزانی هەر تۆزێکی دیکەیەو بە خۆو بە ساچمەزەنەکەیەوە دێو وەك ئەوەی نیشانە لە کەڵەکێوییەكو مامزێك بگرێتەوە، نیشانە

لە تۆو لە هەمینی دەگری، لە خوێناویدا دەتانگەوزێنی، بە بریندای دەست لە ملی یەکدی دەکەن، دەمریت و دەمت ناگاتە مێخەك بەندی بەرملی، خەزێمی لا کەپووی، گوارەی هەردوو گوێیانی، ئارەقەی نێو سینەو مەمکانی، دەمریت و حەسرەتی راموسانێك دەبی بە خوێن و لە دڵتەوە دەڕژێتە سەر پنچکە گیایەکی ئەو دەشتە.. لە خۆت وایی.. لە هەمین وایی.. لەوان سواران، زری داران، مشکی و هەوری بەسەران، سەرشکێنان، چاو سوورو داخ لە دڵان، زگ دڕێنان، ها ئێستا نا.. ها تۆزێکی دیکە دەگەنە سەرتان، بە تاوە غارو نەرمە غاران، لەوە دەچی باپیر ئاغا بۆ ئەو راوە زۆر دانسقەیە لە هەر هەموو ئاغاو بەگلەرو شێخ و مەلاو پیاوانی گوندەکانی دیکەی گێڕابێتەوە، لە میرو عگیدو قاوەچییان.. خەڵات.. خەڵات.. هەرکەسەکی بایز بکوژی و بە زیندێتی چاوان هەمینم لۆ دەستگیر بکات لە کۆشك و باڵەخانەی من سەرپشك بی، وەی لەو هەموو کوڕو کاڵانەی گوندی کە بۆ ماچێکی هەمین ملی خۆیان لە تیغ هەڵدەسوون، هاوار دەکا: کوڕینە زۆر عەیبە کچمان بە دووی شایەرو لۆتیان بکەوی، لە هەر چوار لاوە رێتان لی دەگیری، ئابلووقەی پیاوە تووڕەو تووشەکان، وەی لە زەلیلی دوو عاشقە رووتەی بن دەست و پێیان، سمی ئەسپان، وەی لە بریسکەی جەرگبڕی لوولەی تفەنگ و ساچمەزەنان، لوولەیەك و.. دوو.. دە.. و.. سەد.. دەست رێژێك و دوو.. دەو.. سەد دەست رێژ.. تۆ دەکوژێن و ئەوسا دەبی هەمین لە خۆی حەرام کا خواردن و خەوی نیوەشەوان، لە دوای بایزی حەرامە سەداو چریکەی لاوك بێژو حەیران بێژان، حەرامە کل و

کلچوك، خەزیمو گوارە، فندو فانۆس، چارۆگەی زەردو رەفتەی شین، کەوشی سووری عەجەمی، حەرامە مانەوە لە تەویلەی باوكو برایان، مردەنی‌یە کەوتنو دەخالەتی بەگلەرو ئاغایان، هەر دەڵێی هەمووانی ناردووەو خۆی دوا راوچی‌یە دەگاو بەزمو هەنگامەی راو خۆش دەکات، دەبێ کێ بێ کە یەکەمین کەس شێتو شەیدای ئەوەیە یەکەمین گوللە بتەقێنێو هەوا ئاگرداو دڵی ئەو مامزە کون بکا، دڵی تۆ؟ باپیر ئاغا؟ هۆمەری سەرکار؟ خدر؟ کانەبی؟ کەریمی مەیتەر؟ بوداغ بەگ؟ یان یەکێك لە پیاوە هەرە هیچەکانی گوندی؟ کەسیان لە (کەریم مەیتەر) چروکتر نی‌یە.. هەرکێ بێ؟ دواجار هەر هەمووان خەونیان بەو راوەوە دەبینی، لەوە دەترسی بە زیندوێتی چاوان هەردووکتان بخەنە بەردەمی سەگەلو توولەو تانجی‌یەکانیان، ئەو توولەو تانجی‌یانەی پەلەوەریان لە ئاسمانەوە دادەگرت، تانجی‌یە مل بە قەرێتەکانی ئاغا راوتان دەکەن، هەروەکو کەڵە کێوی‌یەكو مامزێکی برسیو هیلاكو پەلو پۆ شکاو، بە شەوارە کەوتوو لە تاو بریسکە بریسکی لوولەی تفەنگەکان، ملتان دەشکێنن، تانجی‌یە رەشەکەی باپیر ئاغا، مل بە زەنگوڵی زیو، مێخەکبەندو حەمایلی هەمین بە کەڵبەکانی دادەپچڕێنێ، کەپووە قنجەکەی بە خەزێمەوە دەخوات، هەردوو پەرەی ناسکی گوێی بە گوارەکانەوە قووت دەدات.. تانجی‌یەکانی دیارنو خۆی بزرە، پیادەو سوار بە دزە دزە لێتان نزیك دەکەوتنەوە، هەر هەمووو براکانی هەمین دەیانویست هەتا زووە پارێزەکە بشکێو بە گوللەیەك نێوچەوانت ئاگر بدەن، تێپەڕێنی ئەو هەزارەها رۆژو مانگەو داخی تۆڵە پیری

کردبوون، پیرتر لەوەی بتوانن تفەنگ بتەقێنن، لە ژێر تیشکی هەتاودا بە غەزەبێکی گەرمو دێرینەوە رەش رەش دەدرەوشانەوە، دەنێو خوێنی هەرکامیان تۆڵەی ئابڕوو تکان گەرمتر بوو لە رۆژی یەکەمی شەرەف دۆڕان، گینگڵو خۆ خواردنەوەی هەزاران شەوو رۆژ وای کردبوو بیانەوێ بەقەد ئەو عومرە پڕ لە قەهرو چاوەڕوانیەیە پارێزو کوشتنی نێچیرەکانیان درێژتر بکەنەوە، هەردووکتان، لەوساکە دەشتە، کەوتبوونە بەر رەحمەتی ئەو راوچیەیە دڵڕەقانە، دڵڕەقترین، کە لەوەتەی زەویو پیاوو راو هەیە، دڵڕەقی وا هیچ نێچیرێك نەیدیوە، پڕ بەو ساکە دەشتەو بەقەد ژمارەی دارو بەردو پنچکەکان، گەردیلەی خۆڵەکان.. ترسیان دەچاند.. لە ناکاو پڕ بەو دەشتە هاوارت کرد: راکە هەمین.. راکە.. خۆیانن، هەتا زووەو نەیان کوشتووی، وەرە باوەشم، یەکە یەکە گڕی غەزەبێك لە چاوانیان چەخماخەی دەداو پووشو پەلاشی ئەو ناوەی دەسووتاند، سەیرە.. هەتا لێتان نزیکتر دەبوونەوە گەنجتر دەردەکەوتن، گەنجو قۆزو سمێڵ بابڕ وەك ئەو رۆژەی کە لە شاییەکەی (کەریم مەیتەر)دا هەڵدەپەڕین، مامزە کەشت سەرسامو ئەبڵەق بە دیار مەرگی خۆیەوە بە هەر چوار دەوری خۆیدا وەك ئەوەی بریندار بێ دەخولایەوە، گیاوو گوڵو نێرگزو حاجیلەو بەیبوونی دەشێلا، چەندە پتر دەترسا ئەوەندە زیاتر چاوە رەشەکانی دەدرەوشانەوە تا دەبوون بە دوو دڵۆپە قەترانی رەشتر لە رەش، بە چرپەی بکوژێکەوە کە لە هەموو تەمەنیدا چاوەڕێی ئەو نیشانەیە بووبێ پیاوە سمێڵ بابڕەکەی ئەو پەڕی دەستە راست بڵماندی: لە منەوە دەست پێ بکا.. گەر

ئەمن نەمپێکا با دوای من باوکە خۆی سازدا.. جوان پارێزی لێ بگرن.. هەقی هەموومانە.. هەر.. یەکەو.. گوللەی.. خۆی.. لە.. لەشی گەرمیدا.. لە.. لەشی.. گەرمیاندا.. سارد.. بکاتەوە.. کورینە.. ئەوەتا.. شەرەفی.. هەموومان.. بوو.. هەمووتان.. کت‌و پڕ چرپەو سرتە نەما، ئەو ناوە کپ‌و خامۆش.. خامۆش.. ئەوەندە خامۆش کە ئیدی بەندی دڵی نێرترین پیاو بپچڕێنێ.. لە دوورەوە تارمایی ئەسپ سوارێك دەرکەوت، تیژ دەهات، تیژتر لە (با)، بە تاوتر لە مەرگ، پڕمە پڕمی ئەسپەکە لەو دوورەوە پیاوەکانی سڕ کرد، پەنجە قرساوەکانیان بەسەر پەلەپیتکەی تفەنگ‌و ساچمە زەنەکانەوە رەق‌و وشك بوون، قۆڵ‌و باسکیش وەك تەختەو داری ساردو سڕ، خۆی بوو، باپیر ئاغا، تۆزی دەکرد، ئەو پیاوەی حەسارێك لە تانجی‌و توولەی دەڕستاند، دیار بوو دەمێك بوو خۆی بۆ ئەو مامزەی دەشتی قەراج مەلاس دابوو، سالانێکی زۆرە پارێزی لێ گرتووە، لە دوورەوە (با) دەنگی کەرخی هانی، هێی پیاوینە.. کوڕگەلی گوندی.. نەکەن نیشانەیان لێ بگرنەوە، پەنجەتان لا ببەن لەسەر پەلەپیتکەی تفەنگەکانتان، دەمەوێ بە زیندوێتی بیگرم.. ئادەی رادە.. هەڵقەی راوچی‌یان لێکدی دەپچڕا، بەر لە خۆی هاواری دەگەیشتە کنیان، تیژ دەهات هەروەکو باوو بۆران، وەك غەزەبێك لە ئاسمانەوە بێ، وەك گڕکانێك لە بن پێی تۆو هەمیندا بتەقێتەوە.. تەقی‌یەوە، ئەسپە رەشەکەی بە دەم بای غارەوە پڕیشکی ئاگری لە بەردەکانی ژێر هەر چوار سمی‌یەوە دەپژاند، دەتووت باڵی لێ رسکاوەو دەفڕێ، بێ شومار توولەو تانجی بە دەم قروسکەوە پێش

______

سوارەکە کەوتبوون.. هەر هەموو ناساز دەیانقروسکاند، راکە هەمین.. هەتا تانجی‌یەکانی ئاغا لێمانەوە دوورن.. راکەو.. وەرە باوەشم.. ئاغا دڕی بە پیاوەکانی داو بە شریخەی قامچی زراوی مامزەکەی بردو دڵی پیاوەکانی خستە لەرزە، ئادەی کوڕینە بکەونە دووم، مامزەکەت بە چوار لۆقە ئەو هەردوو وەردەی دەبڕی‌و سەگ‌و توولە تاژی‌یەکانی ئاغاش سەریان لە دوو نابوو، بێ ئەوەی بۆن بە تۆوە بکەن لە تۆ رەت بوون‌و راوەدووی ئەویان نا، لەبەر هیلاکی‌و هەردوو کەفەڵی پڕی هەمینی مامز نەیدەتوانی لەوە تیژتر رابکات، کەوتبوویتە ناو گەردەلوولی سەگ‌و تاژی‌یەکان، ساتمەتان لە یەکدی دەکرد، کە هەمین بە دۆڵێکدا غل بۆوە، لە چالآیی‌کەدا بە سەدەها مامزو کارمامزی دیکە بێ ئاگا لە سەگ‌و تاژی‌یەکانی ئاغاو پیاوە تفەنگ بەدەستەکان دەلەوەڕان، لەسەر گردەکەوە هاوارت لە هەمین‌و لە کار مامزەکانی دیکە کرد، هاواری جەرگبڕی تۆو قروسکەی تانجی‌یەکان‌و قاوو قیژی راوچی‌یەکان شێتی کرد، دەنێو ئەو تاوو ترسەدا بە هێزی یەك رەوە مامز تەکانیان دا، بە نێو یەکدیدا تێك قژقژان‌و ساتمەیان لە یەکدی دەکرد، کە بە دەم غارەوە لە هەمین‌و لەو رەوە کارمامزە نزیك بوویتەوە بە دەم هەناسەبڕکێ‌وە هەر هاوارت لێ دەکردن کە بفڕن، بۆ ناکرێ وەك لە ئەفسانەکان‌و حەکایەتەکان روو دەدا باڵیان لێ بڕسکێ، لەگەڵ دەنگ‌و هاوارەکەت بە ترسەوە هەر هەموو ئاوڕی ئاسکانەیان دایەوە، ئەی خودا ئەوە چی‌یە کە دەیبینی، ئەوەتان هەر هەموو کارمامزەکانی دەشتی قەراجی، ئەوانەی کە بە بریتداری لە دەست راوچی‌یەکانیان هەڵەتە بوون،

کچە نازدارەکانی ناو حەیرانەکانت، کچانی غەمکین و دڵساردی گوندەکەی خۆتان، ژنان و کچانی نامرادی هەر هەموو گوندەکان، دوور لە چاوانی باوك و براو مێردو کوڕ، دوور لە چاوانی ئامۆزاو خاڵۆزاو پلکەزا لەو دەشتەو دەنێو مێرگەکاندا بێ ئاگا لە نیازی پیسی راوچی‌یان دەلەوەڕان، چ سەیرە.. سەریان، سەری کچەکان و ژنەکانە و لەشیش هی رەوە مامزێکی سۆرغەرە، یەکە یەکە لە تۆو لە هەمینێ رادەمان، دەیانناسیتەوە، ئەوەتا ئەسمەرێ زراری، خەجیجێ رەحمانی، رەوشەن سۆری گەردیان، جەواهیری باریناان، ئامینەی کوڵەبن، زولەیخای زولف سۆر، زەینەبی کابایزی، بەسێ و فەهیم و ستی و رابی لە گۆلاوێکدا ئاویان دەخواردەوە، چ گوناهێکی گەورەیە کوشتنی کارمامزێك لە عانی ئاو خواردنەوەدا، مریەم و عەنبەرو موعتێ خۆیان دابووە بەر تاوو تینی هەتاوێ و لەسەر لا کەوتبوون و بۆرژابوون، ئەستێرەو هوما و بەلقیس و مینا لەگەڵ هەناسەبڕکێی هەمینێ هەستانە سەر پاشووان، هەر هەموویانن، ئەوانەی هەر لە ئەزەلەوە تا هەنووکە رەدوو کەوتوون، چ زەحمەتە خۆشاردنەوە لەو ساکە دەشتە، چ بە ترسەوە، هەترەش چوو.. زارەترەك و زەندەق چوو ئاوڕ لەو پیاوە تووڕەو داخدارانە دەدەنەوە، ئەو پیاوانەی لەوەتەی هەن لە راوە مامز پتر هیچی دیکە نازانن، گۆشتی مامز نەبێ ناخۆن، کەوڵی مامز نەبێ لەسەری دانانیشن، سەد مامز بەیەکەوە دەکوژن تا تۆزێك مسکیان دەست کەوێ، مێشکی پژاوی هەر بە خاوی دەخۆن تا شەهوەتیان پتر بێ، گوێ لەو حەیرانانە دەگرن کە تیایدا هەر مامزەو دەکوژرێ:

---

ئەمن سەردەمەکێ راوکەر بووم،
دەگەڕام لە راوێ،
کارمامزەکم هەلدەستاند بەوێ سبیانێ..
جۆتە تاژیەکانی قورە بۆشینکەم بەردانێ..
وەکی دەڕوا لەبەر عەوەت عەوەتێ سواران..
چەپڵە کوتانێ..
لەبەر نوسکە نوسکێ تاژیان..
لەبەر قاژەیێ بڕنۆیان..
ئەوا ئاوێ خۆی دەخواردەوە..
دەپەڕییەوە لە جۆگەی هەولێرێ..
میرێ کیژان دەیگۆ:
کوڕەتیم لاوە..
حەیرانەکەی توو گەلەك عاشقە..
بە چ پیسە راوکەران نایەتە گرتنێ..
بە دەستی خۆت نەبی..
بە کەسەکی دیکە ناگیرێ..

هەریەکەو دەیویست راوچیەکی ناو یەکێك لەو حەیرانانە بێ.. لەگەڵ نەعرەتەی باپیر ئاغادا هەرچی راوچی ناو چاڵەکانو پشت تەپۆلکەو تەلانو سەرپشتی ئەسپەکان هەبوون کردیان بە هەو هەویێكو.. هاتو هاوارو.. ناڵەو نرکەیەك کە هەر چوار پەلی مامزو کارئاسکەکان بشکێنێ، بە دەم بای غارەوە هەر رەوە مامز بوو تێکەڵ بە رەوەکانی دیکە دەبوو، هەر هەموو ئەو مامزو کارمامزانەی کە رۆژگارێك لە نێو تەویلەو گەوەڕو زنجیرەکان

وەڕس بـــوون و.. رووەو ئـــەو دەشـــتە هەڵەتـــەو تـــەوەللا بـــوون، ژمارەیـــەکی زۆر لـــەو مامزانـــەی کـــە هێشـــتا زنجیرو قەریتـــەیان بـــە ملەوە بوو، پەڵەی وشکەوەبووی خوێن بەسەر سەرو مل و پشت و چـوار پەلیانـەوە، تـا دەهـات ژمـارەی سـوارەکان زیـادی دەکـرد، دەتووت لە ژێر هـەر پنچکێکدا، هـەر دارو دەوەن و تـەڕاش و گاشـە بەردێکـدا سـوارێك دێتـە دەرێ، لـە کـوێوە ئـەو هـەموو راوچـی‌یە هاتوون؟ بە خۆو بە تاژی‌یەکانەوە سەریان لە دووی هەمین و باقی ئاسکە کچ و مامزە ژنەکانی دیکە ناوە، ها لێرەو ها لـەوێ، باپیر ئاغا بەسـەر ئەسـپەوە دەلەنگی‌یـەوە، لـە شـانی کردبـوو رمبـەکی دەمڕەشـی هـەژدە قەفی‌یـە، وەك هەمیشـە خەنجـەری دەبـان لـە بەرپشـتێنی، بـوو بـە هـەڵاو گرمـەگرمی سـواران، رەوە مامزەکـان تێکـەڵ دەبـوون و پاشـان پـەرت دەبوونـەوە، لـە قـەراخ هـەر گۆمـە ئاوێکدا هـەر مامز بوو رادەپـەڕی، بوو بە تـەڕاد لێدانی سـواران.. هـەرجارەکی بـاپیر ئاغـا بچـێتە راوو شـکاران لـە چـل رۆژ کـەمتر ناخایـەنێ، هـەمینی مـامز دەگـەڵ رەوەیەکـدا بـە باسـکەیەکی سـەرکەش و ڕکدا هەڵگـەڕان، بە هانکە هانکـەوە قاچ و قولیـان لـەو خۆڵـە نەرمـە دەردەهـانی و دەیانقوچـاند، کـت و پـڕ بیسـت سـوار بەیەکەوە بە خۆیان و تانجی‌یەکانـەوە لە بەرامبـەر ئـەو رەوە مـامزە وێڵەدا راست بوونـەوە، تانجی‌یـەکی دەمڕەش و هـار گەیشـتە سـەر مـامزە هـەمینێ و راپێچـا و لـە بـەردەمی سـوارەکاندا لـە خۆڵـێ‌ی وەردا، تانجی‌یـەکانی دیکـەش هـەر بـە تـاوی غـارەوە.. هەریـەکـەو مامزە ژنێك و ئاسکە کچێکی خسـتە ژێـر چـەپۆك و ددان، بـە گـۆڕێ وەربوون سەدەها دانـەی مرواری لـە ملوانکـەی پچـڕاو.. دوگمـەو..

گوارەو.. تۆقەو تەلەسمان.. کرمەك و.. زەنجەقان.. لیکی لینجی تاژی‌یەکان دەڕژایەوە سەر گژنێژەی گواران.. بە گوڕێ وەربوون خەزێم و حەمایل و مێخەك بەندان.. برسی‌یانە قەپیان لە لووت و کولم و چەناگەی کارمامزەکان دەگرت، زیوال زیوال بوون سوخمەو کراس و کەوا و چارۆگەو دەسرۆکەکان، کەوتنە بەر پێ‌ی سواران هەوری و هیزاری شەکرە ژنان، وەك لە خەونەکاندا روو دەدا خۆت دەنێو گێژەنی سوارەکان و تانجی‌یەکاندا بینی‌یەوە، هەرسوارەو لە زین دادەبەزی و دەیویست کارمامزی جوان لە نێو کەڵبەی تانجی‌یەکەی دەربێنێ، هاوارت کرد: هەمین ئەوەتام.. دەستم بگرە.. وەرە باوەشم.. سوارەکان سەرگێژو غافڵگیر بوون، بۆ تاوێ هەریەکەو سەرسامی ئەو کارمامزەی بن دەست و پێ‌ی ئەسپەکەی بوو، وەك ئەو راوچی‌یانەی بە موورادی خۆیان دەگەن و دادەسەکنێن، هەر پێنج پەنجەی دەستی راستی کەوتبوونە نێوان کەڵبەو ددانی تانجی‌یەك و خوێنیان لێ دەتکا، کە تۆی بینی شەنگ و هێزی هاتەوەو هەستایەوە سەرپێ، کەوتە نەرمە غارو تا دەهات تیژتر تاوی دەداو.. تۆش لە سەگ و سوارو تانجی‌یەکان دەتپاراست، تانجی‌یەکانی ئاغاش یەکراست شوێن پێ‌ی ئێوەو.. بۆنی ئێوەیان لە حەوادا راو دەکرد، لە دە لاوەش دەتدی هەر رەوە مامزەو کەوتوونەتە ناو گەردەلوولی راوچی‌یەکان و تانجی‌یەکان، زریکەو هاوارو ناڵەی ئاسکە کچەکان ئەوەندەی دیکە پیاوەکانی سەرمەست و شاگەشکە دەکرد، لەوە دەچوو هەندێکیان بخورێن، بۆنی خوێن و گولاڵە سووره تێکەڵ دەبوون، چ بەهارێکی خوێناوی‌یەو چ راوو شکارێکی دڵڕەقانە، ئەوەتا تانجی‌یەکان لە

سـەد لاوە گـەمارۆی کارمامزەکـان دەدەن، راوچـی‌یەکانیش بـۆ زەنـدەق بـردن تەقـە لـە دارو بـەردو ئاسمـانیش دەکـەن، ئـەو کارمامزەی خۆی لە نێو کەڵبەو ددانی تانجی‌یەك رادەپسکاند لە دووری دە هـەنگاوەوە دە راوچـی بەیەکـەوە بـە گوللـە دایـان دەبێژاو.. لە خوێنی خۆیدا دەیانگەوزاندو.. پاشانیش تانجی‌و توولەو سەگە برسی‌یەکانیان تێ بەردەدا، چی لەو هەموو مامزە کوژراوە بکەن؟ لەو هەموو کارئاسکە مردارەوەبووە؟ کە لە مەودای گوللەباران‌و تانجی‌یەکان دوور دەکەوتنەوە.. تەواو دەبوونەوە بەو کـچ‌و ژنانـەی گوندەکـەی خۆتـان.. دەتـووت ژن‌و کچـانێکن هـەر هـەموو سـیپاڵی بـەریان.. دەرپـێ‌و کـراس‌و کـەواو سـوخمەو دەسماڵیـان، هـەر هـەمووی پینەیـەو لەگـەڵ هـەر تـەکانێك‌و هەنگاوێکدا یەکە یەکە ئەو پینانە دەکەون، ئەو دەشت‌و دەرە پڕ ببوو لە گوارەو خەزێم‌و کرمەك‌و گەردانەو بازن‌و کلچوك، پڕ ببوو لە تیلمەکراس‌و کەوا.. لە دۆخین‌و دەرپێی هەلا هەلا.. خودا ئەوە چ راوێکە..! تا دەهات تانجی‌یەکانی ئاغا لە تۆو لە هەمینێ نزیك دەبوونـەوە.. لـە بـای غـارت داو پـێی گەیشـتی.. دەسـتت بێنـە هـەمین.. راسـتەم برینـدارە.. دەروێـش.. هـەموو ئـازا..م برینـدارە.. شێتانە باسکت لە ناوقەدی‌یەوە ئاڵاندو لە زەوی بەرزت کردەوە، لەگـەڵ هـات‌و هـاواری ئاغـا و نەعرەتـەی بـێ ئامـانی‌و قیـژەی راوچی‌یەکان‌و لوورەی جەرگبڕی تانجی‌یەکان‌و حەپینی لە هەوادا بـڵاوی ئـەو هـەموو سـەگە هـەمین رەتـی بـردو تـۆش بـە دوایـدا ساتمەت کـرد.. لە بەردەمتـەوە ماندووانـە.. کوژراونـە سـەرو ملی تێك شکاو درك‌و داڵی ئەو ناوە روومـەتی ناسکی ئـەمیان زامار

کـرد، گـورج هەسـتایەتەوەو لـە باوەشـێت کـردو خسـتتەوە سەرپێیان.. بە دەم نووزەوە.. بە قورگی پڕ لە گرین و برینەوە تکات لێ کرد: غاردە دەنا دەمانخۆن.. لە دواتانەوە هەر راوچی بوو کارمامزێکی کوژراوی بە تەنگەی ئەسپەکەیەوە بەستبوو.. وەك سـێبەر کەوتبوونـە دوای ئاغـا.. و.. ئـەویش پێشـەنگ.. هاوارت کرد.. هۆ خودای ئاسمانان ئەگەر.. ئەگەر ئەمن و هەمین دوو عاشقە رووتەی پاك و بێ چارە بووین دەهەڵمانکێشە بەرەو بن پەڕی هەورەکان، پڕ بە دوو چاوی رەش و خوێناوی مامزەکەت تێت رادەما، بۆچی نیتە کڵاوی سەخرە جن لەسەر بکەیت و خۆت و مامزەکەت لە چاوان ونبن؟ بۆچی دەنێو هەورەکاندا.. لە بنی پەڕەکەی ئاسمانێ بزر نەبن و یان ببنە دوو بەردو بکەونە ژێر زەریایەکی پڕ لە گێژەنە؟ بۆچی وەك دوو مەلی باڵ خوێناوی رووەو ئەستێرەیەکی دیکە نافڕن؟ ئەوەندەی نەمابوو لموزی تاژییەکان بگاتە بسك و شابسکی هەمینێ.. پێ و پلی.. پاژنەی خوێن لێ تکاوی.. ئاغا بەسەر ئەسپەکەیەوە لە خۆشیانا دەیقروسکاندو لەو ناوە بەخۆو بە تاژییەکانەوە گێرەی پێ دەکردن، باوك و براکانیشی یەکە نیشانەشکێنی گوندی بوون و تۆزیان دەکرد، ئاغا عومرێك بوو تەنگەی زینی ئەسپەکەی شل نەکردبۆوە، چ زەمانێکە باوك و براکانی ئەسپەکانیان لغاوەو جڵەویان وا بەدەستەوە، عومرێکە لەو راوە دەگەڕان، ئاغا تانجییەکانی دەنگ داو هاواری کرد: قەستەم بە خودا بە زیندویتی نەیگرن هەر هەمووتان تۆڕی دەکەم، ئەو سەگەو توولەو تانجییانە لە ترسی ئەو هەڕەشەیە باڵیان لێ رسکا، لە

هیلاکیی و مردەنی ئەو هەلاّت هەلاّتە سەرت هەلّبڕی، ڕەوە ڕەوە ریشۆلّەت بینی کە لەوە دەچوو بەو سەرەتای بەهارە بچنەوە کوێستانێ، سێبەرێکی گەلەك پانیان بە سەر ئەو دەشتو دەرەدا پەرت دەکرد، تا دەهات نزمتر دەنیشتنەوە، ئەوەندە نزیك کە وەك قەلەڕەشێکی زۆر زەبەللاح دەنووكو چڕنووکیان لە پرچی هەمینو لەسەری کۆتی دەخشاند، قروسکەقروسکی تانجییەکان زەندەقی بردن، هاوارت کرد: هەمین وەرەوە باوەشم! باسکت لە ناوقەدییەوە وەرێنا و تکات لە ریشۆلّەکان کرد.. دواجارەو فریامان کەون.. دواجارەو ئەنگۆ دلّ ڕەش مەبنو بمبەخشن، سوێندی شەرەف کە تا ماوم راوتان نەکەم، بە هەزاران دەنووكو چڕنووق ئێوەیان هەلّگرتو بە نێو قوولاّیی ئاسماندا دەیانبردن، تانجییەکان لمووزیان بۆ حەوا هەلّدەبڕی، بە دەم کلکە لەقێوە لە ترسانا هەلّدەپەڕین، ترس لە ئاغا و لە پیاوەکانی، قروسکە قروسکیان عومری زەلیلی سەگانەی دەڕژاند، لە دوورەوە.. لەو پێ دەشتەدا کە بۆنی خوێنو خۆلّی لێ دەهات هەر بابا بوو تفەنگو ساچمەی دەتەقاند.. ئاغا بەسەر ئەسپەکەیەوە دەخولایەوە، پیاوەکانیشی وەك گەردەلوول بە دەوری ئەودا دەخولانەوە، تووڕەو داخدارو دۆڕاو قامچی لە دارو بەرد دەوەشاند، لە پیاوەکانی، لە تانجیو توولەکانی، لە داخانا راوەدووی تانجییەکانی دەنا و لە ژێر نالّی ئەسپەکەیدا سێ چوارێکی شێلا، رووەو ئاسمان سەری هەلّدەبڕیو تفی هەلّدەدا، جنێوی بە جنسی ریشۆلاّن دەدا، پیاوانی ئاغاش تەڕ دەستانە کەوتنە خۆیانو ئاسمانیان گڕ دا، چەندین ڕەشۆلّە وەك بارانی

رەش هــەڵوەرین، گوللەیــەك ســەر چــیغ قــۆڵی ڕاســتەتی سمــیو برینــداری کــردی، بــۆ ســاتەوەختێ تانجیـیــەکانیان حەپەســاندو بۆنیــان بــەو فڕنــدە خوێناویانــەوە دەکــرد، تــا دەهــات تــۆو مــامزە برینــدارو هیلاکەکــەت لــە مــەوداو مــەدارو بۆســەی تفــەنگ بــە دەســتەکان دوور دەکەوتنــەوە، ریشــۆڵەکان تــاویٚ قۆزاخــەیان بــە دەورتــا کــردو بــە گــویٚی یەکدیــدا خوێنــدیان، لــە دڵتــەوە شــوکرانە بــژێر بــووی، بمبەخشــن کــە مــن بــیٚ مــروەتو غــەدار بــووم، قــەت نەمــدەزانی ئێــوەی رەشو بــرش ئەوەنــدە دڵپــاکن، ئیــدی تــەواو راوکردنی ئێوەو سەربڕینتان، ئاخ گەر جارێکی دیکە دەکەوتمەوە ســەر ئــەرز، بــۆ خــوارەوە روانیــتو لــە دوورەوە شــارێك دەرکــەوت، شــارێك لــە ژێــر تــەمێکی خەســتدا کــە لــە دووکــەڵ دەچــوو خــۆی شــاردبۆوە، هەســتت دەکــرد تاوتــاوە رەوە ریشــۆڵەکان بــە دەم فڕینەوە باڵێك یان دوو باڵ دادەخزانە خوارێ، تۆ بڵـێی ماندوو بنٚ؟ لە پاش چەندین نزم بوونەوەو بەرچاو روون بوونەوە دەیەها مینــارەت بینــی کــە بــە ئاسمانــدا رۆچــوو بــوون، لــە دوورەوەش قەڵایــەك وەك کیســەڵێکی پــانو گەورۆنــەو مــردوو لەپــەو روو کــەوتبوو، هــاوارت کــرد: رەشــۆڵە خۆشەویســتەکانم چــاوم درۆم لەگەڵ نەکات ئا ئەوەتا شارەکەمان.. هێدی هێدی رەشۆڵەکان یەك لــە دوای یــەك دەنووكو چڕنووقیان لــیٚ بــەردەدان.. ریشــۆڵەیەك.. دوو.. دە.. ســەد.. بڵــێ هــەزاران.. هــاوارت کــرد: نەکــەن.. تــا هەنووکــە فڕنــدەی چاك بــوون.. بــە یەکــەوە، بــە نەغمەیــەکی پــڕ لــە تــرسو خرۆشــەوە، قیژانــدیان.. قیژەیــەکی تیــژو دڵ پــڕوکێن.. زانیــت کــە ئیــدی دەســت بــەردارت دەبــن، لــەوە دەچــیٚ لــە کەڵبــەو

ددانی تووڵەو تانجی‌یەکان و بۆسەی تفەنگ بەدەستەکان رزگاریان کردی تا بۆ خۆیان لە کەوتنە خوارەوەو ترس و مەرگت رابمێنن، ئەگەر ئەمنیش راوم کردوون.. هەمین چ گوناهی نی‌یە..! دوا ریشۆڵە کەوتە قاژەو دەنووك و چڕنووقی لێ بەردای، نەتزانی هەنووکە بەسەر ئاسمانی کام شارو گوندەوەن، لەوە دەچوو ئەو شارەتان جێ هێشتبێ، شاری ژێر تەم و دووکەڵ کەوتوو، نەتزانی لە کوێ دەکەونە خوارێ، دەکەونە ناو کام رووبارو دەریاچە، سەرتان لەسە کام بەرد دەپژێ، کام سەربان و کام کۆڵان، لقی کام درەخت لە ناو هەناوت دەچەقێ، تۆ لە کوێ دەکەوی و هەمین لە کوێ؟ کە روانیت سەر بەرەوخوار.. ئۆ هۆو.. هێشتا عومرێکی ماوە وەك دوو مەلی باڵ شکاو.. دوو فریشتەی پەل بەست و باڵ کراوو لە بەهەشت دەرکراو بکەونە سەر رەقەنی خاکێك، هێشتا مامزەکەت وا لە باوەشدا، بە ترسەوە خۆی بە تۆوە قرساندبوو، تا لە زەوی نزیکتر دەبوونەوەو لە ئاسمان دوورتر لە سەرو رووخسار بە خوارەوە، لە مل و گەردنەوە، لە قۆڵ و باسکەوە، لە قاچ و قولەوە دەگۆڕاو دەبۆوە بە هەمینەکەی جاران، ترس لە کەوتن و مەرگ دەیکردەوە بە ژنە پیرو ماندووەکەی جاری جاران، هەردوو باسکت هیلاك بوون و ئیدی چیتر شەنگ و توانات نەما، بە هەموو حەزو حەژمەتی پاش لێك دابڕان توند نووساندت بە دڵتەوە، خەریك بوو پەراسووە ناسکەکانی تێك بشکێنی، زانیت هەر تاوێکی دیکەیەو لە باوەشت دەکەوێتە خوارێ و هەر خودا خۆی دەزانێ سەری بەر چ تاشە بەردێك دەکەوێ و خوێنی ئاڵی دەپژێ، دواجار نیگای پڕ لە سۆزو خەم و عیشق و هەوەس و

حەسرەتی تێ بڕیت، لێوانی دەلەرزین‌و هۆن هۆن دەگریا، ئەوەیان دوا نیگای ماڵئاوایی بوو، ئەگەر خەون نەبێ مامزەکەی تۆزێ لەمەوبەر ببۆوە بە هەمین، خودایە هێزو توانا و بڕستم لێ مەبڕە، تا دەهات باسکت بەسەر کەمەرییەوە شل دەبوو، ڕژانی خوێنێکی زۆر لە قوڵی راستەت هەمینی لە خوێندا سوور کرد، سووکێ وەك گوڵێکی پەژموردە لە دەستت هەڵبوەرێ.. هەڵوەری.. دڵت بە دوایدا خورپەی کردو کەوتە خوارێ، تیژتر لە تۆ رووەو زەمین بۆشایی حەوای دەبڕی، لەو ئاسمانە قوڕقوشمییەدا رەدووی کەوتبووی، دەتویست بەیەکەوە بکەونە ناو دڵی دەریایەك، سەر درەختێکی پڕ چڵ‌و پۆپ، سەربانی ماڵێك، ناو حەوشەیەك، دۆزەخێك، یان قەدپاڵی شاخێك‌و تا دواجار خوێنتان تێکەڵ بێ، کت‌و پڕ کەوتنە نێو تاریکی، تاریکی شەوی ئاسمانێکی دیکە یان تاریکی بیرێك، بیرێکی بێ بن، بیرێك لە بیرەکانی دۆزەخ، تا جارێکی تر کەوتنەوە نێو ئاسمانێکی رووناکتر یەکدیتان نەدیتەوە، تا پتر دەفڕین، سەر بەرەو خوار، پترو پتر لە یەکدی دوور دەکەوتنەوە، ئەمجارەیان شارێك لە خوارەوە دەمی بۆ کردبوونەوە، لە دەعبایەکی زەبەللاح دەچوو کەپکەی کردبێ، شارێك کە لەوە دەچوو پێی ئاشنا نەبیت، شارێك کە کت‌و مت وەك شاری نێو حەکایەتە کۆنەکان‌و ئەفسانەکان وەدەرکەوت، بەر لە تۆ کەوتە خوارێ‌و لێت بزر بوو، دوو چاوت هەبوو.. (دە)ت قەرز کرد، بۆی دەگەڕای، ترسایت لەوەی سەراوسەر بەسەر خاکێکی رەقەنی‌دا بکەویت‌و کەللەت بپژێ، هەر چوار پەلت بپەڕێ، بێ ئەوەی کەس بتبینێ کەوتیتە

نێو گۆلاوێك كە نیو بەژن قوڕو لیتە بوو، ئەگەر خەون نەبێ بە بەرگی تەڕەوە، غەریقی سیان و قوڕو لیتە خۆت کێل کردەوە، تەکانت دا تا لەو قوڕە دەربێی کە تێی چەقی بووی، چ قەدەرێکی ناشیرینە.. دیسانەوە لە هەمینێ ون بووی، شێتانە رووەو گەڕەکەکانی دەرەوەی شار غارت دەداو هاوارت دەکرد، لە کێندەری هەمین؟ ئەتوو لە نێو کام کۆڵان.. بازاڕو قەیسەری.. کام حەوشەو سەربان.. کام گۆلاوو کام گۆڕستان کەوتیت؟ ئیدی دیسانەوە کەوتیتەوە گەڕان و سۆراغ و هەواڵ پرسین: هەر لە یەکەم دەرگای خانوویەکی پەڕپووتی سەرپەڕی شار تا ناوجەرگەی.. هەر لە قەرەجە دەوار نشینەکانەوە تا دەگاتەوە بە ماڵی ئاغاو بەگلەرو پیاو ماقووڵەکان.. بەردەمی مزگەوتەکان.. سینەماکان.. چایخانەو مەیخانەو دەلاڵخانەکان.. کوچەو کۆڵانی خانووە قوڕەکان، هەر پەنجەرەو دەرگابوو دەکرانەوەو.. پاشان دادەخران، گەڕەکی کۆشکە بڵندەکان، ناو بازێڕی قاچاغچییەکان، بەردەمی حەمام و مەغازەو کۆگا خۆشەکان، لە بەردەمی کەبابچی و لۆقنتەکاندا دەرۆژەکەر ئاسا دەکەوتیت و پاشماوەی خەڵکیت دەخوارد، جاروباریش لە بەردەمی قاپی ماڵە دەوڵەمەندەکاندا خەو دەیبردیتەوە، مناڵە هاروهاجەکانی شار بەردیان تێ دەگرتی، کە ماندوو دەبووی رووەو دەرەوەی شار غارت دەداو لەسەر دارو بەردی ئەو ساکە دەشتە لەسەر چاو دەنووستی، وێڵ گەردو عەوداڵ بە دوای هەمینێدا، هەلا هەلاو ماڵ وێران، پیاوێك لە پینە، رۆژەکانت بە دەم یەکەوە گرێ دەدان، شەوەکانیشت پڕ لە خەونی ناخۆش، زۆر جارانیش وەك

نەخۆشێك کە دەردێکی گرانی گرتبێ بێدارو وەئاگا دەتنالاند، لە ژێـر هـەیوانی مزگەوتـەکان‌و لەسـەر تەختـەی چـایخانەکان سـەرخەوێکت دەشکاند، سینەی رووتـت دەدا بـەر بەفرو باران‌و هـەتاوو رەشـەبا، گـڕی هـاوین هەڵیپرۆکانـدی‌و سـەرمای زسـتان سڕی دەکردی، تـەنها بـە دامـاڵینی پێـستی هـەردوو پێت‌و کرێژی پشتی هەردوو دەستت دەتزانی چەند جادەو کۆڵانت بە دوای ئەو ژنـەدا بڕیـوە، سـوێندت خـواردووە تـا نەیدۆزیتـەوە پـاك خـۆت نەشۆی، تا هێزت هەبێ بە دوای‌دا بگەڕێی، دەبوو چاوانت بۆ پـارووە نانێـك نـز بکەیتـەوە، ئیـدی شـوێنەکان‌و کاتـەکانت لـە لا تێکـەڵ دەبـوون، لـەڕو لاواز قاچـەکانت غـەدریان لـێ دەکـردی‌و لـە دووت نـەدەهاتن، هـەزار جـار چوویتەوە بـەردەمی ئـەو دوکانـەی مەزەنـدەت دەکـرد هـی سـلێوە بـێ، کەچـی دراوسـێیەکانی بـێ مروەتانە دەیانووت: چوویتە بەغدایێ‌و نایەتەوە، هـەر شـەوەو لـە مزگـەوتێك‌و کەلاوەیـەك‌و کولخـانی حـەمامێك‌و ژێـر چـەتری دوکانێك، جاروباریش بن دیواری قەسری زەرد، بۆنی هەمینێ لەو ئاقارە دەهات، سەرت بە تەواوی رووتایەوە، لە بەردەمی ئاوێنـەی ناو چێشتخانەکان دەوەستیت، وا هەست دەکەی ئەو کەسەی تێت دەڕوانـێ بـە تـۆ غەریبـە، ناینـاسیتەوە، گـەر شـاخیش بوویتایـە لـە ژێـر بـەفرو بـاران‌و هـەتاودا دادەڕمـای، دوو پـێی خوێنـاوی دوات دەکـەوتن، لـە ترسـی منـالانی هاروهـاج دەنێـو قەیسـەری‌و بـازاڕی قەڵـەبالغ‌و مزگەوتەکانـدا خـۆت دەشـاردەوە، چـەندین عاقڵیـان لـەو شـارە کـردە دەللـی، بـە بەرچـاوی دایـك‌و باوکـە بـێ باکەکانـەوە جـادەو کۆڵانـەکانی شـاریان پـێ تـەی دەکـردی، بـەرد بارانیـان

دەکردی، بە دەم بای غارەوە بەر سەدەها پیاوی توورەو ژنی عەبا بەسەر دەکەوتی و پشتاوپشت دەتخستن و خۆیشت رەتت دەبردو لەپەو روو دەکەوتی، سەرت دەیدا لە رۆخی بەردینی شۆستەکان، ویڵ دەبووی دەنێو کەندو لەندەکان، دەکەوتیتە ناو جۆگەکان، قوڕاوو چڵپاوو سیان و گۆلاوی ناو گەڕەکەکان، لە دە لاوە زامار دەبووی، پەڵەی خوێنی وشکەوەبووی سەر دەم و چاوو پشتی هەردوو دەستت قەتماغەیان دەکردو مەگەر باران بیشۆریبایە، لە بەندی‌یەکی هەڵاتووی نێو زیندانەکان دەچووی، لە دزێکی بچوکی ناو بازاڕو قەیسەری‌یەکان کە لەسەر بردنی سەرکە توورێك یان هەنارێك راوەدوو بنرێ، لە تاو هەراو زەناو فیکەو جڕت لێدانی مەزن و منالانی شار رووت دەکردە ئەو دەشت و دەرەوەی شار، ئەو شوێنانەی کە راوە ریشۆڵەت تیا کردبوو، بێزار لە خۆت و لە دونیا بە بەردە فڕەکانێ راوەدووی رەشۆڵەکانت دەناو دەماو دەم بەسەر کەستەکی کەڵەکراوو قوچەکی بەردەکاندا دەکەوتی، غارت دەداو رەتت دەبرد، پەنجەت لە خوێنی رەش و رژاوی سەر بەردەکان وەردەداو لەزەتێکت لەو ئازارە دەکرد، پەنجە خوێناوی‌یەکانت وەك دە قامکی لەت و پەت بۆ ئاسمان هەڵدەبڕی و دەگریای.. کچێ هەمێن ئەتوو لە کێندەری؟ پڕ بەو ساکە دەشتە دەتبۆڕاندو پەلەوەرەکانت دەترساند، مارو مێرووی نێو درزی خاك و کونەکان، وەك پیاوێکی شێت، تەواو شێت گازت لە مەچەکی خۆت دەگرت و خوێنت لێ دەهێنا، وەك گیانلەبەرێکی برسی و خەستە گەڕ ببووی، لە تاو خورشتی پێستی لەشت خۆت رووت دەکردەوەو خۆت لەو قوڕو خۆڵە تەڕەی ناو کێڵگە تازە

تۆوکراوەکان وەردەدا، فێنکی و تەڕی خۆڵەکە کەمەکێ ئۆخژنی پێ دەبەخشیت، هەڵدەستایتەوەو رات دەکردو تا بایەکی سارد لە لەشی بە خوڕشتو گەڕو گڕ تێبەربووت بدا، لێرەو لەوێ پنچکی ئەو دەشتو دەرە لە هەردوو پێتەوە دەئالاْن و سندمیان دەکردی، پەل وپۆ شکاو دەکەوتی، بە دەم هەناسەبڕکێ و هانکەهانکەوە سەرت لەو خاکە دەچەقاندو بۆ عومری بە با چوو.. بۆ دووری هەمینێ هەنسکت هەڵدەدا، راوچی‌یەکانی دیکە بە هەڵەداوان رووەو لای تۆ غاریان دەداو بەزۆر سەری لە خاك چەقیوی تۆیان بەرز دەکردەوە، یەك دوانێکیان بە قەهرەوە فرمێسکی خۆیان دەخواردەوەو بەیەکەوە دەیانپرسی: دەروێش هەتا کەنگی وا دەکەی؟ لۆ نایەیتەوە راوێ.. وەکی جاران؟ بە هەمووان وەك ئەوەی لاشەی مردوویەك لە کەرێك بار بکەن دەیانخستیتەوە سەر پشتی یەکێ لە گوێ درێژەکان و رووەو شار دەیانبردیتەوە، بەزۆریش نەدەچوویتە هیچ ماڵێك، لەسەر سەکۆکان و ژێر چەتری پاسەکان هەناسەیەکی حەوانەوەت دەدا، تا سەرت نەتەقێ بە هەردوو دەست دەتگوشی، ناو مۆخی ئێسقانەکانت ئارەقەیان دەکردەوە، ئەوە هەمینە پێت دەڵێ: لەبەر خاتری من بژی.. مەمرە دەروێش تا دەمدۆزیتەوە، ئەمن هەر لێرەمو نەمردیمە، هەمیشە لە نێو پەناو پەسێوی شاردا خۆت حەشاردەدا، لە کەلاوە کۆنەکانیش منداڵ و تاڵ دەوریان دەدای، چیتان لێم دەوێ؟ خۆ ئەمن نە کەسم کوشتی‌یەو نە دزیشم، نەتدەزانی کێیە ئەو پیاوەی هەموو جارێك دەنگی دێتە بەر گوێت: بەس ژن هەڵدەگری؟ مەلای نیوەڕۆ بانگی دەداو لە مزگەوتی خانەقاو لە

بەر سێبەری هەیوانەکە بە دەم وەنەوزەوە سەرخەوێکت دەشکاند، بە سەرەسم لەقەیەك و دووو سێ و دە بەر کەلەکەت دەکەوتن، ئەوەندە لەقەت بەرکەوتبوو وات دەزانی کە کەلەکەت کون بووە، لە چاوی کەس رانەدەمای، هەمووان جگە لە تارمایی هیچی دیکە نەبوون، لە پاش بزربوونی هەمینێ هەموو شارەکان و گوندەکان، شارو گوندی مردووانن، لە چاوانیان رقێکی بێ ماناو قێزوبێزو بەزەیی یەکی نائادەمیانە ببووە تانەو تۆیان رەش دەکرد، بەزەیی یەك کەمتر لە بەزەیی بۆ پشیلەیەکی کوێرو سەگە بەرەڵڵایەکی گەرو وێڵ گەرد، کچانی کراس کورت و ژنانی عەلمۆدەو عەبا بەسەر لێت دەڕەوینەوە، هەندێ جار وەك کەسێکی نابینا بیت یەکێك دەهات و دەستی دەگرتی و لە جادەکان دەیانپەڕاندیتەوە، تۆش بە گومانەوە لە یەکەیەکەیان ورد دەبوویتەوە، لە ناکاو خۆت رادەپسکاندو لێیان دەتەکیتەوە، تۆیان بە سەرگەورەی شێتەکانی شار دەزانی، شێتێك کە بەردەوام وەك ئەوەی زیکری خوا بکاو لە چرکەیەکدا لە بەر خۆیەوەو لە بەردەمی دەرگای ماڵەکاندا، لۆقنتەکان و گەرماوەکان و دوکانەکان و مەیخانەکاندا دەیەها جار بڵێ: هەمین.. هەمین.. هەمین.. دەنێو چایخانەکان و لە ژێر چەتری پاسەکان و هەیوانی مزگەوتەکاندا بڵێ: هەمین.. هەمین.. هەمین.. کە لەسەر جادەو ناو کۆڵانەکان دەردەکەوتی سەد منداڵ بەیەکەوە، سەدەها گەنجی مل هوڕو تۆلازی بێ شەرەف بەیەکەوە هاواریان دەکرد ئەوەتا هەمین.. هەبوو دەستی بە ناو گیرفانی‌دا دەکردو دەیووت هانێ ئەوەتا هەمین.. هەبوو سەرسەریانە دەستی بۆ ناوگەڵی دەبردو

دەیـووت: هانـێ هـەمین.. هەنـدێ لـە دوکانـدارانی سمـێڵ بـابڕ دەستیان بۆ قوونی خۆیان دەبردو دەیانووت: ئەوەتا هـەمین.. بە تـۆوە گشـت شـێتەکانی شـاریان بـە نـەفرەت دەکـرد، راوە دوویـان دەنای، ئەو کاتەی کتو پڕ بەردی وێڵی منالێك جامی قەمەرەیەك، شووشـەبەندی چـایخانەیەك یـان جامخانـەی کۆگـاو مەغازەیـەکی دەشکاند، گوناهی شکانی هەر پەنجەرەیەكو جامخانەی کۆگایـەك لـە هـەر کـوێ بووایـە لـە ئەسـتۆی تـۆ بـوو، رۆژێکیـان خـاوەنی جـوانترین کۆگـای شـار کـە لاوێکـی قـۆڵ ئەسـتوور بـوو بـەرزەفتی کردیـتو بـە بەرچـاوی سـەدەها کـەسو ڕێبـواری تیـژ تێپـەڕو پۆلیســـەوە دەمتـــی پـــڕ کـــرد لـــە وردە شووشـــەی شـــکاوی جامخانەکـەیو هـەردوو لا رووومـەتی تـۆی بـە زللـە ئـاگر دەداو هەڕەشەی لێ دەکردی کە ئەگەر وردە شووشەکان نەجوویی بەرت نـادات، دەیـووت: مەگـەر دەروێـش نیـت، هـەر هـەمووان، بـە پۆلیسـەکانەوە، قاقـا پێدەکـەنین.. زللەیـەكو دوو.. دە.. تـۆش لـە ترسانا کەوتیتە شووشە جاوین، پاشان ئەێی دەدایتو دەیووت: ئەوجا هەنووکە بڵـێ: هـەمین.. هـەمین.. تـۆلازێکی لـەو کـەرتر تـۆی گـرتو هەڕەشـەی لـێ کردیت کـە بـە زنجیر دەتبەستێتەوە گـەر بـە پـێی پـەتی بەسـەر وردە شووشـەکاندا هەڵنەپەڕیت، هەڵپـەڕین بـە مـەرجی خـوێن لـێ هـاتن، یـەکێکی دیکـەیان درهەمـەکانی لـە گیرفانـەکانتا دەردەهـانیو دەیـژماردنو دەیـووت: ئـەوەیان هـەقی جامخانە شکاوەکەمە، ئەو پارەیـەش هـی ئـەو خێرەومەندانـە بـوو کـە بـە دزییـەوە دەیانخسـتە نـاو گیرفانـەکانت، یـان بـەردەمت ئـەو وەختـەی لـە ژێـر پـەنا دیوارێکـدا یـان هـەیوانی مزگەوتێکـدا

دەبۆرژای، زۆربەی دەمەو ئێوان منالآنی بیژمۆت سووکێ دەستە باریکەکانیان دەئاخنیـیە نێو گیرفانە قوولەکانی شەڕواڵەکەت و درهەم و دینارەکانیان لێ دەدزیت، کەیفت پێ دەهات کە ئەوەندە لێت نزیک دەکەوتنەوە، ئەو ساتەوەختە تاکە وەختێکی ئولفەتی نێوان تۆ و منداڵەکانی شار بوو، لە ترسی تەم و تاریکی دەمەو ئێوارەو تەنیایی حەزت دەکرد منالێك، ژنێك، پیاوێك، سەگێك یان هەر رۆح لەبەرێك خۆیت تێ هەڵسوێ، بۆنێکی ئادەمیانە بەسەرتا بێ، گوێت لە هەناسەی کەسێك بێ لە نزیکەوە، راکەڕاکەی بەیانی تا ئێوارە لە پەل و پۆی دەخستی، خامۆشی دەکردی، بە درۆ وەك ئەوەی کە شێت بیت خۆت بۆ دەست و دزینی ئەو هەتیوانە شل دەکرد کە سەرەتا بە دزییەوە.. بە ترسەوە لێت نزیك دەبوونەوە، دەستیان لە گیرفانەکانتا ون دەکرد، یەکەمجار بە پەلەو پاشان کە دەیانزانی لەوە ئارام و شلتری دەستت بوەشێنی بە شێنەیی دوا فلوسیان لە گیرفانت دەردەهانی، دەتزانی رۆژی دواتر بەو پارەیەی تۆ دەچنە سینەماو قاچ رادەکێشن و جرت و فیکە لێدەدەن و جگەرەی زەلیش دەکێشن، لەسەر کورسی چایخانەکان جامانە بەسەرو ئەفەندی تێت رادەمان و بە گوێی یەکدیدا دەیانچرپاند، قەستت دەکرد بزانی ئەو کەرپیاوانە چ دەڵێن، ئەوانەی بە شەو وەك نێرەکەر سواری ژنەکانیان دەبن و بە رۆژیش تا ئێوارەیەکی درەنگ تاوڵەو دۆمینە دەکەن، دەگەڕای.. دەگەڕای.. دەتویست بزانی هەمین لە نێو کام کۆڵان و لەسەر کام بان کەوتۆتە خوارێ، بێ شك لە شوێنێکدا لە خوێنی خۆیدا گەوزیوەو کەس نەیناسیوە، وەك فریشتەیەکی پیرو

ـــــــــ

پەروباڵ کراو کە خودا لێی تۆرابێ و لە ئاسمانەوە هەڵیدابێ، خوویەکی سەیرت گرتبوو، دەچوویتە سەر دیوارە هەرە بڵندەکان و دەتڕوانی، سەر تەپۆلکەو گردۆلکەکان، منداڵانە بەسەر درەختەکاندا هەڵدەگەڕایت و دوورتر لە مەودای بینین دەتڕوانی، جارێك و دوو، دەو.. هەزار.. دەچوویتە سەر قەڵاو سێبەرت لە چاوانت دەکرد، نیگاکانت لەودیو تەنکە تەم و تاریکی و دووکەڵەوە بەسەر کۆڵان و شەقامەکاندا هەڵدەفڕی، بێ هوودەیە.. بێ هوودە.. هەر دەرگایەکی داخراو گومانی لە لا دەخولقاندی، کۆشکە داخراوەکان، تەقەت و داخراو چون قوتوو، ژێر زەمینە تاریکەکان، بنی بیرە سەر داپۆشراوەکان، رووخساری هەر ژنێکی کەنگر فرۆش و کاردوو فرۆش تۆلەکە فرۆش و هێلکە فرۆش و شیر فرۆش تێکەڵ بە سەرو سیماو هەیکەلی هەمینێ دەبوون، لێیان نزیك دەکەوتیتەوە، ئەرێ کێهاتان (هەمین)ن؟ هەمین کێیە براله.. تێکچووی؟ کارمامزێکی دەشتی قەراجەو لە منی ماڵ وێران بزر بووە، بە شەرمەوە، شەرمی ژنانی دەشتەکی، لە ژێر لێوەوە دەم و لێویان بە چارۆگە دەشاردەوە، بە دزییەوەو خنکاوانە دەتریقانەوە.. کوو.. نایناسن؟ نەتاندیتێیە؟ هەمینی من.. بێ ئومێد رادەوەستای، وەك کۆمەڵێ قەلەڕەشکە لە قیغەقیغ بکەون خامۆش و مردووانە بە دوو چاوی پڕ لە سەرسامی و ترسەوە لێت رادەمان، کە دەخزانەوە پاڵ دیوارەکەو دەچوونەوە ناو یەکدی، دەبوونەوە بە دیوارێك لە ژنی سەرسام و زەندەق چوو.. تۆ دەڕۆیشتی.. حەزت دەکرد بگەڕێیتەوە کەلاوەکەتان و بۆ دواجار بۆن بە دارو بەردو خۆڵ و هەنارو هەنجیرە زڕەکەوە بکەی، دەرگا

داخراوەکانی حەوشەو ژوورەکانو گەنجینەکە بکەیتەوە، جارێکی دیکە لە بەردەم کۆلیتی مریشکەکاندا کرۆشکە بکەیتو بە یادی جاران دەست بە نێو (کا)ی تەڕو ریقناویدا بگێڕیو لە هێلکە بگەڕێی، ئەگەر کەرو مانگاو مریشکو جووجەڵەکان زیندوو بن بیانگێڕیتەوە، هەرچییەکی کە دزراوەو براوە، لەوانەیە هەر بە موعجیزە (هەمین)یش کتوپڕ لە ئێوارەیەکی ناوەختا بگەڕێتەوە، رەنگە هەناسەی هەمینێ لە درزی دیوارەکان بەجێ مابێ، خەونێکی جوانی لە سەر یەکێ لە بالیفەکان، قریوەیەکی شەرمنانەی لەناو حەمام ئەو وەختەی کە بە بیانووی پشت شۆرین نقورچت لێ دەگرت، بێ شک لیفەکەیەکی کۆن، بەردە پێیەک، کەرتە سابوونێکی وشکەوەبوو کە ئەو دواجار دەمو چاوی خۆی پێ شۆریبێ، سندوقی بوراقەکە دەکەیتەوەو دەمو چاوت لە جلە جێماوەکانیدا غەرق دەکەیتو تا دەمری بۆنیان دەکەی، ئەی خودا لەو بۆنە خۆشو دەگمەنە کە بۆنی هیچ ژنێک لە دونیادا نایگاتێ، بۆنیان بکەیتو بگری، بگری.. لەوانەیە چەند تاڵێک لە پرچی بە سەر سەرپۆشە سپییەکەوە جێمابێ، ئەو سەرپۆشەی بە تەنها لە پرسەکاندا سەرو پرچی پێ دادەپۆشی، خۆ لەوانەشە لوولەیەک لە قژی لە نێو ئەو قوتووە ژەنگاوییەدا بێ کە هەمیشە لە سووچێکی حەمامەکە دانرابوو، بێ شک جێ دەستو پەنجەی ئەو بەسەر دارو بەردی ئەو کەلاوە کۆنە جێماوە، ئاخێک.. هەنسکێک.. قوڵپی گریانێکی خنکاو لەنێو لوولەی دووکەڵکێشی زۆپاکە، جێ پێیەک لە ناو حەوشەکەدا، وێنەیەکی زەردو رزیو دەنێو قوتووی متومورووەکانی، ئەنگوستیلەیەک،

گوارەیەك یان خەزیمێکی سەردەمی کچێنی، بەو ئومێدو خەونەوە زۆر گەڕای، شەوو رۆژ بەدەم زینده خەوەوە، چەندین جار خۆر هەلات و خۆر ئاوا بوو، لەوە هیلاکترو گەڕیدەو کاستر بووی شەوو رۆژەکان بژمێری، لە بەردەم کەلاوەیەك و دەرگایەکی شەق و شڕدا خۆت دۆزییەوە، بە پێی ئەو زنجیرە قەف ئەستوورو لەیەك بەستراوە خۆیەتی، وەك دواجار کە مامزەکە لە باوەشتا هەڵەتە بوو ئاوڕت دایەوە، هەروەك بڵێی لەو ساکە دەشتەدا بە تەنها کەلاوەکەی تۆو هەمین دارو پەردووی بەسەر یەکدیدا رمابێ، وەك دوا ماڵی رماوی ئەم دونیایە، رماو بە دوو چرکە بەر لە لێدانی شەیپورو هاتنی قیامەت، بە چوار دەوری خۆتدا خولت دەخواردەوە، بە چوار دەوری کەلاوەکەدا، کوانێ فڕندەیەك بە ئاسمانەوە.؟ خەڵقەندەیەك بەسەر خاکەوە؟ مارو مێرووولەیەك؟ کوانێ.. بۆ کرمێك لە بەر پێتا ناجووڵێ؟ چڵە گیایەك نالەرێتەوە.؟ هاوارێك.. ناڵەیەك.. قریوەیەك.. گریانی منالێك.. قیژەی ژنێك.. کۆکێنی پیرەمێردێکی وەرەم دار؟ کوا هەراو زەنای ئاژاوەیەك.. جنێوی زۆری پیاوە تووڕەو داخدارەکان.؟ زیکری دەروێشە لە خواترساوەکان؟ هەلهەلەی فڕیوی ژنێك لە زەماوەندێکدا؟ زریکەی لە ناکاوی یەکێکی دیکەیان لە پاش هەواڵی کت‌وپڕی مەرگی ئازیزێك؟ ئەتۆ چۆن بزانی ئێرە گەڕەکێکی قەڵەبالغی ناو شارێکی زۆر گەورەیە؟ کوو بزانی ئێرە خاکەسارێکی چۆڵ و خامۆش و قەفرانێیە تا بنی دونیا؟ پەنجەکانت لەو خۆڵ و تۆزەی ناو حەوشەکە وەرداو چنگێکت هەڵگرت و وەك شەکرۆکە خستتە ناو دەمت، گەرد بە گەردیت جوویی و قووتت دا، بێ شك پێیەکانی

هـەمینێ ڕۆژانێـك یـان سـاڵانێك لەمەوبـەر بـەر ئـەو خـۆڵو تـۆزە کەوتوون، ئاە.. خودا هاوار .. خۆ هیچ ئاسەوارێکی تێدا نەماوە بەڵگەی ئـەوە بێ کـە دوو کەسـی کڵۆڵ، ژنو مێردێکـی ساویلکەو ڕەنج بەخەسارو دەشتەکی لێرە ژیابن؟ دوو عاشقی وێڵ گەردو ڕەشۆکی ئا لێرەدا گریاونو پێکەنیون، ئەی خودا مانەوە دوای هـەمینێ چ مەینەتیـیـەکی گـەورەو دەردێکـی گـرانو.. چ خـەو زڕانێکی ئەبەدیـیە؟.. ئەوەندەت هاواری (هەمین)ێ کرد تا دواجار وەك ئەو کەسەی کلی دەرخوارد درا بێ دەنگت نووسا، ترسایتو لەو کەلاوە کۆنە دەرپەڕیت، کتومت وەك ئەو ڕۆژەی هـەمین هاتـە خـەونتو هـەر لـەو ساکە دەشـتەش لێـت بـزر بـوو، بـێ بـاك لـە دەورانـی فەلـەك، لـە لێکدی ئـاوس بـوونی شـەوو ڕۆژەکـان، تـەنها خۆشـیت ئـەو گەڕانـە بێهوودەیـە بـوو، گـەڕان بـە دوای هــەر تارمایییەك لە هەمینێ بچێ، ماڵی ئاغاکانو کوێخاکانو بەگلەرو بازرگانەکانت هەراسان کرد، ئەوەندەی لە بەرقاپیـەکانیان کزۆڵـەو سـەرکز خۆت گرمۆڵـە بکـەی، بووی بەسـەر قافڵەچـی شـێتەکانی شار، هـەر بـە تـەنها خۆت خـەمی هـەموویانت دەخـوارد: هـەیاس.. محێگن.. کەسـكو سـۆر .. چورچـە.. بەخۆکـە.. جوعـە.. کسـۆ.. حەمە شێت.. سابیر مارات.. خدە لیکن.. خاتە کوڕانی..بەسێ بێ دەرپێ.. دەلی حوسنی.. دەیەها کە ناویانت نەدەزانی.. کارەساتی ڕاوکردنــی تـۆو شــێتەکان هــەر لــەو شــەوەدا تەقییــەوە کــە حەسحەسـەکان دەنێـو قەیسـەریدا دەنگـی پیاوێـك دەدەنو.. ئـەم ناوەسـتێ.. میلـی تفـەنگی لێ ڕادەکێشـنو.. ئـەم ڕادەکـا.. دەسـت ڕێـژێكو لــە خــوێنی خۆیــدا دەیگــەوزێنن.. کــە دەچــنە ســەری

(پیرداودە شێت)ەو کەس نەناس بۆ بەیانی شارەوانی ناشتیو تۆ تەنها کەسێك بووی لەسەر گۆڕەکەی دەگریای..

تەواو.. هەر هەموو بەگزادەکانو پیاوماقوڵانی شار مەزبەتەیەکیان نووسیو.. خرا بەردەمی (موتە سەریف)، وا بڕوا شێتەکانو سەگەبەڕەڵڵاکان دەمانخۆن، ئەم شارە کە عومری هەزاران ساڵە خەریکە شێتەکانی لە عاقڵەکانی پتر دەبێ، ئەوە شارە یان شێتخانە .. دوکانداراو لۆقنتەچیو خاوەن کۆگاو موغازەکان لە ترسی بەردە فڕکانێ بۆ کوێ بچن؟ هەر هەموو پۆلیس و سەربازو خەفیەکان و یاساوڵەکانی شەوو پیاوانی حوکمەت کەوتنە خۆ، هەر هەمان رۆژ سەگ کوژەکانیش ئاگادار کرانەوە، یەك هەڵمەتی دلێرانەو شار پاك دەکەینەوە، نابێ شێتێك قورتار بێ, هیچ سەگێکیش لە دەوروبەری قەسابخانەکەش بمێنێ, جێگەو رێگەی شەوو رۆژیان تۆمارکرا, قوربان لۆ دەرۆزەکەرەکانیش نە پێچینەوە؟ ناشوکری نەبێ خەڵکی ئەوانیشیان شێت کردیە.. بیاننووسن.. کێ زەرەری هەیە بینووسن..

لە رۆژێکداو لە ئانو ساتێکی دیاریکراودا بوو بە قاو.. شار خرۆشا.. سەدان پۆلیسو سەربازو باشبۆزغ کەوتنە سەر جادەو نێو کۆڵانەکانو گوزەری دارتاشو ئاسنگەرانو قەیسەرىو بازاڕو بەرهەیوانی مزگەوتەکان ناو گۆڕستانەکان, بە هەزارەها منالْ کە لە بەزمێکی وا دەگەڕان.. دەستگێرە مایەپووچەکان, گەنجی دەست بەتاڵو تڕۆ, پیاوانی بێ دەماغ کە لە تاوڵەو دۆمینەی نێو چایخانەکان بێزار بوون, هەر هەموو بوون بە دەلیل و چاوساغی

پیاوانی دەوڵەتی, ناویان نا ڕۆژی ڕاوکردنی شێتەکان, دەیەها دەرۆزەکەرو بێ ماڵو دەرەتان وەبەر کەوتن, پیکەب و جیب و کامیۆن و لۆریەیە قەفەزدارەکان گران وەك دەعبایەکی لە ئاسن دروستکراو ناڵەو گرەگری مەکینەیان تێکەڵ بە هاوارو زەناو فیکەو جرت لێدانی گەورەو بچووك دەبوو, منالانی سەرکەو بنکە دەکەوتنە بن دەستو پێی ئەسپی سەگوژەکان و نەدەرەوینەوە, تا دەرەوەی شار دەکەوتنە دوای سەگە بەرەڵلاکان و بەدەم بای غارەوە هەر سەگوژ بوو نیشانەی دەگرتەوە, تا دەهات کەلاکی سەگە کوژراوەکان زیادی دەکرد, لە دوورەوە لە کەرنەڤالێکی عەجایب دەچوو, ئەو ڕۆژە پیاوانی بێ ئیشی بەردەمی دوکانەکان ئەوەندەیان جرت لێدا, لەوەدا بوو گوپیان بدرێ, دەبوو پۆلیسەکان بە دارحەیزەران منالەکان لە خۆیان پاس کەن, تا دەهات تەکانی شێتانەی ئەو مەحشەرگەلە لە هەموو کون و قوژبنێکی شاردا دەتەنییەوە, لافاوی ئەو خەڵکە کت و مت لە لافاوی ئەو شەوە دەچوو کە هەموو شتێکی ڕادەماڵی, لە بڵند گۆکانەوە جاڕ دەدرا کە ئەوڕۆکە تا ئێواری هەرچی شێت و وێت هەیە دەبێ بگیرێ و هەر هەموو سەگە بەرەڵلاکانیش بکوژرێن, هەر منالی چلکن و چلمن بوو, هەر لاوی مل هوڕو دەست بەتاڵ بوو, بە خۆڕایی دەبوو بە دەلیل و بە نەرمە غارێکەوە کەوتبوونە پێش لۆری و جێب و پیکەب و ئەسپ سوارەکان و شێتەکان و سەگە بەرەڵلاکانیان قاودەدا, تۆش بێ ئاگا لەخۆت و لە بڕیاری شێتانەی شارەوانی، بێ ئاگا لەو هەراو زەناو زایەڵەو قاوو قیژەی کە ئاسمانی شاری پڕ کردبوو لە دەنگەدەنگ و قەڵەباڵغی, ئەو هات و

هاوارە دەڕژایە ناو کۆڵانەکان و حەوشەکان و سەربانەکان و سەر جادەکان, دەڕژایە سەر گومەزو منارەکان, لەوە دەچوو یەك شار راوکردنی شێتەکانی کردبێ بە بیانوو تا وەکو شێتی و هاربوونی خۆی فرێ بداتە ناو هەواو سەرجادەکان, کوشتنی سەگەکان بکا بە بیانوو تاوەکو ئارەزوویەکی کوشندەو خوێناوی خۆی لە خوێن رشتن تێر بکات, ئەوەندەی نەدەما سوار ئەسپەکان و ماشێنەکان ئەو منالانە بشێلن کە ساتمەیان لە یەکدی دەکرد, یان بەدەم پاشقوڵ لێ گرتنەوە دەکەوتن, منالەکان لەپەو روو دەکەوتن و هەڵدەستانەوە, تا دەهات لافاوی مەردووم پڕ بە جادەکان شەپۆلی دەدا, رۆژی ئەوە بوو گەورەکان بوزو تیلك بە گچکەکانەوە بکەن, گچکەکانیش بە گەورەکانەوە, کوڕو کاڵ خۆ بەژن و کچانەوە بنووسێنن, نقورچ لە لاڕان و سمتیان بگرن, ئەو شێتانەی فامیان بەو راوە دەکرد بە چوار لۆقە بە نێو کۆڵان و جادەکاندا غاریان دەدا, هەندێکیان وەك بێچووە قەتێ هەر بە کلاو گیران, لە سەد لاوە بەریان پێ دەگرتن و پەلبەست دەکران, راوێکی خۆش و بەلەزەت, بە پاڵ و شەق و پێلەقە سەردەخرانە ناو ماشێنەکان و وەك کۆنە جل فرێ دەدران, دەنێو قەفەزەکانەوە وەك کۆمەڵێ گیانداری کێوی بە هەر چوار دەورەی خۆیاندا خێل و خوار دەیانڕوانی, بێ ئەوەی لە هیچ تێ بگەن و.. بە هیچ بزانن.. (کسۆ)یان لە قەسابخانەکە هێنایەوە, ئەو شێتەی ئولفەتی بە سەگە بەرەڵاکانەوە گرتبوو, (هەیاس) دەنێو کولانەی سەگەکانی پشت دیواری قەسری زەرد دۆزرایەوە, بە دە زەلام تێیان هەڵدەداو بەرزەفت نەدەبوو, تێی هەڵدەن تا هەنووکە دە کچی

فەساد کردی‌یە, (خدە لیکن)یان لە ژێر هەیوانی مزگەوتی خانەقا دەرهانی کە بێ ئاگا لەخۆی دەنکە شقارتەی بە دەنکە شقارتە دادەگیرساند, حەمەیان لەژێر گردێك لە ئاسن‌و پاسن‌و تەنەکەو سکراب دۆزییەوە کە پاشەڵی رووتی لە مناڵەکان کردبوو بەو نیازەی ئێی بگەڕێن تا گوو.. دەکا.. (بەخۆکە) خۆی بە دارتەلێکەوە شۆڕ کردبۆوەو وردەی بۆ مناڵان هەڵدەدا، (جوعە) چووبووە سەر دیواری یەکێ لە کەلاوە رماوەکانی ناو قەڵاو مەملەکەتێکی لە خۆی کۆ کردبووە، خوتبەی دەداو.. هاواری دەکرد: نەدەبوو کۆمارە گجکەلۆکەکەمان بڕوخێنن.. لە عەرزو ناموسی "ستالین" ببەم.. خوشکی کەر بگێ.. وتیان.. حوسنی دەلی کە ساڵ دوانزەی مانگ لە شۆفیرەکان ئاوس بوو بە دەم بای غارەوە کەوتووەو مناڵی لەبار چووەو مردووە، تۆ لە هەموویان بێ ئاگاتر لە بەردەمی هەیوانی مزگەوتی زەرد، دوای شەوێکی درێژی خەوزڕان‌و وێڵ گەردی خەوە کۆتکە دەیبردیتەوە، سەرت بە کڵاوەی ئەژنۆت دەکەوت‌و رادەچەنیت، قیژەو زریکەی بێ ئامان لە دوورەوە دەهاتە بەرگوێت، تا دەهات نزیکتر دەبۆوە، حەزت کرد بزانی چی بووە، بە پرتاو بازێکت داو گەیشتیتە بەردەرگای دەرەوە، وەستایت‌و روانیت.. تۆ بڵێی تەرمی پیاوێکی گەورە ببەنە سەر قەبران؟ هەزار کەس بەیەکەوە هاواریان کرد (ئەرێ وەڵڵا خۆیەتی.. دەرویشە) ئیدی تۆ ئەوەندەت پێ کرا بەر لەوەی ئەو ئاپوورەیە دەستی بتگاتێ رابکەی، ها لێرەو ها لەوێ، لە هەر دوو ریان‌و سێ ریان‌و چوار ریانێك سەرت لێ دەشێواو لە بەرخۆتەوە دەتپرسی: کامەیە رێی نەجات؟ دوعات

دەکرد رێت نەکەوێتە کۆڵانێکی داخراو، خەڵکێکی تێکەڵو پێکەڵ کە ساتمەیان لە یەکدی دەکرد، جلی جیاو رەنگاوڕەنگ، مناڵان وەك چۆلەکەی باڵ شکاو باڵیان لێك دەدا، شاد بوون بەو هەرایە، ئوتمبێلەکان دەنێو ئاپوورەی خەڵکدا گێژیان خواردو بزر بوون، خۆیان لە عەرەبانەو ئەو سندوقانەی سەر شۆستەکان دەداو قڵپیان دەکردنەوە، هەر هەموو گۆزەو کوپەی ریزکراوی گوزەری گۆزەکەرەکان شکان، مناڵانی سەر دار سنۆبەرەکانی لا رێگاکان بەردو مازوویان دەگرتە ئەو حەشاماتە، هەر بابا بوو دەیویست قەپەنگی دوکانەکەی دابداتەوە نەبا دزی لیٚ بکریٚ، کە کەوتیتەوە ناو گوزەری کەوبازەکان چی قەفەز هەبوون لە ژێر دەستو پیٚی ئەو هێرشی مەردوومەدا وردو خاش بوون، چەندین بولبولو کەوو کۆتر فڕین، ژمارەیەکیش مردن، کە دەتدی لە بەرامبەرتەوە ئاپوورەیەکی دیکە دەرکەوت، بە لای چەپ یان راستدا رێت دەگۆڕی، هەبوون هەر بۆ مەزاق کڵاویان بۆ ئاسمان هەڵدەدا، بیٚ سەروبەر بە ناو یەکدیدا دەخولانەوە، هەندیٚ لە پیاوەکان مناڵە وردیلەکانیان خستبووە سەر قەڵاندۆشکانو پڕ بە قوڕگ هاواریان دەکرد، لە هەڵچوونو داچوون نەدەکەوتن، بە هەر چوار لادا ئەو خەڵکە دەستی رادەوەشاند، یەکێك دەکەوتو یەکێك هەڵدەستایەوە، پیٚ دەکەنینو دەتریقانەوە، هۆی هەلەلە.. هۆیها..
لە رقی مەزاقی ئەو عەزازیلە پۆلیسەکان جنێویان بە دارو بەردو ئاسمانیش دەدا، گوو بە شەرەفی ئەو کەسەی ئەم بەزمەی خوڵقاند.. ئەو گەوادانە با خۆیان بێن ئەو راوە شێتە بکەن، لە عەرزی موتەسەریف بەم...

لـە دواتــەوە هــەر هــەموو هاواریــان دەکــرد: (هــەمین ئــەوەتا دەروێـش بگـەڕێوە)، نەتـدەزانی سـەیری کـام لا بکـەیت، بـە چـوار چاو دەتڕوانی، کە یەکێك بەری پێ دەگرتی وەك کەرتە شاخ خۆت پێدا دەدا، نەتدەزانی ئەو هێزو شەنگەت لە کوێ بوو، ساتمەت لـە دارو بـەرد دەکـرد، جەمـەدانی و کـڵاوت فـڕین، کەوتـە بـن دەسـت و پێی مەوجێك لە بەشەر کە تا دەهات زۆرتر دەبوون، کەس گوێی بەو منالانە نەدەدا کە دەکەوتنە بن دەست و پێیان، بەو سـەگانەی کـە لەسـەر جـادەو لاکۆڵانـەکان دەکـوژران، ئەوانـەش کـە ژەهـر خواردوو کرابـوون، ئەوەنـدە وێنـەکان بـە نـاو یەکدیـدا دەچوون تـا هـەر هـەموویان بـوون بـە یـەك بوونـەوەری زەبـەللاح، دەعبایـەك کـە هـەزار چـاوی هـەبێ، هـەزار دەم بـۆ جنێـوو جـڕت لێـدان و هووی‌ها کێشـان، هــەزار دەسـت بـۆ شـەپازللەو.. هــەزار پـێ بـۆ غـارو ڕاوەدوونـان، ئـەو هـەموو وێنـە زۆرو کـت و پـڕ گـۆڕاوە کوێریـان کردی، ئەو هەموو هـاوارە کـەڕیان کـردی، هـەزار وێنـەی ترسناك و دوو گلێنەی تەقیو، تەقیو لە تۆقین و ترسدا، دەتخواست دوو باڵـت لـێ بڕسـکێ، هەنـدێ جـار سـووك ڕیشـۆڵە ئاسـا دەفڕیـت و هەنـدێ جاریش وەك خەرتەل باڵە خوێناوی‌یەکانت لـە زەوی دەخشـان، لـە کوێوە دێ ئەو هـەموو قـاوو قیـژەو قریوەیـە؟ دەتـووت بـۆ دواجـار دەیانەوێ بە هەموو شاردا بتگێڕن و ئەوسا بتگرن، بتکوژن، کـەس پەنات نادا، هیچ مزگەوتێك، هـیچ کەلاوەیـەك، هـیچ دوکانێـك، هـیچ ماڵێك، هیچ چایخانەیەك، مەیخانەیەك، هـیچ.. هـیچ.. هـیچ کـەس.. لە ناکاو کاروانی حەشاماتێکی ڕاکردوو بە دوای شێتێکی دیکـەدا کەوتـە نـاو شـارێك لـە گـەنجی مـل هـوڕو منـاڵانی چـەتوون کـە

______

کەوتبوونــە دوای گۆلەســەگێکی قــاچ شـکاو.. وەك دوو دیــواری ئەستوورو پان لە مەردووم یەکدیان دەبڕیو لە یەکدیان دەدزی، بە سەدەها وازیان لە راوەدوونانی گۆلەکە هانیو کەوتنە دوای شێتەکە، بە سەدانی دیکەش بۆ راوی گۆلەکە وازیان لە شێتە هانی، ئەو رۆژە منالـە هارو تۆلازە بەلانگەزەکان حەزیان دەکرد ببنــە دوو لــەت، لــەتێکیان ســەرگەرمی راوەســەگ بــێ و لــەتێکی دیکــەی بکەوێتــە دوای شــێتەکان، ئەوانــەی لــە غارغــارێنی دوای ســەگەکان شــەکەت دەبــوون دەکەوتنــە دوای شــێتەکان، ســەگە بەڕەڵلاکان خۆشبەزتر بوون، خۆ بەیەکەوە بەردە باران دەکران، بەیەکەوە بەر لەقە دەدران، بەیەکەوە لە پەناو پەسێرەکاندا قاو دەدران، بەیەکەوەش دەنێو دوکانو ناو حەوشـەی دەرگـا وازی ماڵەکاندا دەردەهێنرانو بۆ بەزمو زرمەزلێو قۆشمەو عەزاب فڕێ دەدرانەوە سەر جادەکان، جادەی سیخناخ بە مرۆڤو ماشێنو ماتۆڕو عەرەبانەو پاسکیل، هەر دەتووت شار دەعبایەکی بێ دڵەو کوێرایی داهاتووەو هیچ نابینێ، کەڕەو هیچ نابیستێ، لە پاڵەپەســتۆی ئــەو هــەموو گۆشــتو ئێســقانەی چــوار دەورت هەناسەت لە بەر بڕاو لەوەدا بوو بخنکێی، لەو هەموو بەریەکدی کەوتنە، لەو هەموو فڕکان فڕکانو دەستاو دەست کردنە، لەو هەموو راکێش راکێشەدا جلەکانی بەرت کە هەر خۆیان هەلاهەلاو پرزۆڵ پرزۆڵ بوون پینەیان لێ دەکەوتە خوارێ..

(خودا هاوار.. فریام کەوەو بە تەنیا جێم مەهێڵە..)

چ لەزەتو خرۆشانێکە ئەو هەموو ترسو تۆقینو زەندەق چوونە دەنێو چاوانی سەگەکانو شێتەکان، هەندێ لەو کچە

بەندەوارانەی نێو ماڵە تەنگو تاریکەکان بە بیانووی دەردانی بارناوی ناو حەوشەکان چڵکاویان بەسەر سەرو قامەتی ئەو رەشە خەڵکەدا دەڕژان، هەر ئەو رۆژە مناڵان دەیەها تەنەکەیان بە کلکی کەرو پشیلەو سەگە بەرەڵڵاکانەوە بەست، لە سەد لاوەش بە دارو تێڵا تێیان بەر دەبوون، ئەوەیان کە خۆش نەدەبەزی لە هەمووان پتری بەردەکەوت، تۆش لەوان گێژتر بۆ هەر لایەك ملت دەنا.. دیوارێك لە مەردووم رای دەگرتی.. دەکەوتی.. دەخەوتی.. دەمردی.. وەلیّ نا.. یەك هەزار دەست بەیەکەوە لە خەوی دەکردی.. لە مەرگی دەکردی.. چیتر پێیەکانت، دەستەکانت، چاوەکانت، رۆحت هی خۆت نەبوون، کەس ئەو هەموو قەهرو فرمێسکەی نەدی، بە لەقە لە بن گونیان هەڵدەدای تا زووتر راست بیتەوە، سەری دارێکی تیژیان لە پشتی ملت گیر دەکرد تا بناڵی، تفیان دەکردە ناو چاوت تا بگریت، شێتێکی دیکەیان دەهێناو لە بەردەمتا بە دەیەها کەس دەیان گرتو تەنەکەی زبڵیان بەسەردا قڵپ دەکردەوە تا وەك سەگێکی تەڕ خۆی راوەشێنێ، لەو هەترەش چوونو ترسو تۆقینی باریوی ناوچاوانی ئەو" تۆش هەترەشت دەچوو، هەرکەس لەو رۆژەدا دەیویست دەستی بە شێتێك بگا و تێی بسرەوێنێ، هەر دەتوت خودا ئەو کەسە نابەخشێ گەر تفێك نەکات، جنێوێك نەدا، دەستێك نەوەشێنێ، دەمەونیوەڕۆ کە قوتابیەکان بەرەڵڵا بوونو فەرمانبەرانیش رژانەوە سەر جادەکان، ئاپوورەی خەڵك لێرەو لەوێ جۆشی دەسەندو.. هەر تاوێكو سەر جادەکان پڕ بوون لە قەڵەمو پەرگاڵو راستەو لاپەڕەی دڕاوی دەفتەرو کتێبەکان کە بە دەم

فڕینـــی ســـەدان (پــێ)وە دەفــڕین، ئــەو هــەراو هۆریــا و هــەڵڵاو هەنگامەیە بیانوویەکی ڕێك ڕەخساو بوو کە کوڕیژگە برسی و لاوە لۆتی‌یــەکان خــۆ لــە ســەبەتەی میوەجاتــەکان بــدەن و بــە گــۆڕێی وەبکەن، خۆپێدادان بە جامخانـەی کۆگاکـان، خـۆ نووسـاندن بـەو ژن و کچانەی بـە ڕێکـەوت دەکەوتنـە نـاو بازنـەی ئاپوورەکـان، لـە ئاسماندا (با) بەر (با)و بەرد بەر بەرد دەکەوت، دواجار لـێ گـەڕای وەك گەلاّیـەك بکەوێتـە بـەردەمی لافاوێك لەگـەڵ خۆیانـدا ڕاتمـاڵن، بـەر دیـوارو مەردوومـەکان دەکـەوتیت و بـەر دەبوویتـەوە، هـەر بـەو کەمــە قــژە درێــژەی پشــتی ســەرت ڕاســتیان دەکردیتــەوە و.. دەیانووت:

(ئەوەتا هەمینمان دۆزییەوە)

وەك لــە خــەودا بیــت لــە خۆشــیانا ڕادەچــەنیت و ئــەوان دەتریقانـەوە، وەك سـەگە ڕاوەدوونراوەکـان لیکـت دەکـردو لەسـەر چـوار پـەلان دەخشـیت، لەسـەر ئـەژنۆ، لەسـەر ئەنیشـکەکانت، دارستانێك لـە قاچ گـەمارۆی دابووی، زوو زوو بـە نووکـە شـەق لـە کەلەکـەیان هەڵـدەدای، نەتـدەتوانی بپارێیتـەوە، زمـان لـە دەمتـا ئاوسابوو، لە دوورەوەش شەقژنی گوللەو قروسکەی غەمهێنی بەر لە کوشتنی سەگەکان دەڕژایە خەرەندی ڕۆحتـەوە، گریـان و ناڵـەو هاواری شێتەکانی دیکە کە تاو نا تاوێك بەلاتدا تیژ تێ دەپـەڕین کە هەر دەتووت سواری شـەپۆلێکی زۆر گـەورەی مـەردووم بوون و ڕووەو کەنــداوێك دەڕۆن، لــە هــەر چــوار لاوە (بــا) هــەڵیکردبوو، دەنگــــەکانی.. ناڵــــەو هاوارەکــــانی.. جــــڕت و جنێوەکــــانی.. قروسـکەکانی تێکـەڵ دەکـرد و دەیهـانی، کـت و پـڕ هـەناوت تێـك

هەڵهات و بەسەر پێڵاوی دەیەها کەس رشایتەوە کە هەر زوو لێت تەکینەوە، پاشان بە غەزەبەوەو بە پرتاو لە بن چەناگەیان هەڵدای، پتر رشایتەوە، لە ناکاو گوللەیەکی وێڵ بەرتەختی تەوێڵی یەکێك لەو ئاپوورەیە کەوت، هەر هەموو خەڵکەکە لە ترسانا تەکینەوەو هەر دە هەنگاو لە دووری تۆوە پیاوێکی شرۆڵ خوێنی لەبەر دەڕۆی، راستەپێ هەستایتەوەو کەوتیتەوە غار، بەردیوارو دارتەل و دیوارەکان دەکەوتی، دەتووت بە دە کەس چرنوق لە دەم و چاوت گیر دەکەن، ناو دەمت تاڵ، هەناسەت لەبەر بڕابوو، وات هەست دەکرد تاوێکی دیکە مێشکت لە کونە کەپووتەوە دەڕژێ، کەوتیتەوە سەر ئەو جادەیەی پڕ بوو لە سەبەتەی نێرگز، سەدەها منداڵ بەیەکەوە هاواریان دەکرد: ((نێرگزی ئەوەل بەهارێ))، کە تۆیان بینی هەر هەموو هەستانە سەرپێ، تۆ بڵێی وا زوو بەهار هاتبێ و نەتزانیبێ، دیسانەوە لافاوی دیکە لەو عەزازیل و مەحشەرگەلە کەوتنەوە دوات، لێت نزیك دەکەوتنەوە، جارێکی تر لۆرییە قەفەزدارەکان دەرکەوتنەوە، لە دواتەوە هەر سەبەتەی پڕ نێرگز بوو بەر لەقەی خەڵکی دەکەوت و چەپکەکان دەکەوتنە ژێر پێیان و دەیانشێلان، دەتویست بگەیتە دوکانەکەی (سلێوە) و فریات بکەوێ، ئەو سوێند بخوات کە تۆ شێت نیت، پڕاوپڕی کۆڵان و جادەکان خەڵکی خۆیان بە دیوارەکانەوە نووساندبوو نەبا ژێر پێی ئەو زریانی مەردوومە بکەون، نەبا بەر رەشەبای شێتی ئەو عاقڵانە بکەون، سێی ساڵە راوە ریشۆڵە دەکەیت و هەنووکە خۆت راو دەکرێی، راوە بەراز.. راوە ئاسك.. راوە کەروێشك.. راوە

سمۆرە.. هەموو جۆرە راوێکت بیستبوو.. بەڵام راوە مرۆڤ..؟ نەخێر.. تۆ بڵێی تۆ دوا شێتی ئەم شارە بیت کە ماوەو راو نەکراوە؟ خۆت لە ماڵەکان دەکوتاو سەر قاڵدرمەکان دەکەوتی، سەربان‌و سەربان وەك پشیلەی تۆقیو بازت دەدا، دەتقوچاند، لەودیو تاق‌و پەنجەرەکانەوە، لە ناو بالکۆنەکانەوە لەو حەشاماتە سەر شێتە رادەمان، ماسولکەکانت شلتر دەبوون، چاوانت لێڵ‌و وێڵ، گرێك لە سەرتا، دوا ئاوڕت دایەوەو زانیت مەحاڵە دەرچوون، لەو دوورەوە لەوە دەچوو سەما بکەی، لەترت دەدا، سەرسمێك‌و دەکەوتی، تا دەهات بە هەر چوار دەورتەوە هاڵاوی گەرم‌و گەنیوی هەناسەو هاڕەی هەمووان دەتپروکێنێ، چەقۆت پێ نەبوو دەنا خوێن بەرەیەکت دەبڕی تا چی زووە لەوێوە هەناسە بدەی، سەرت هەڵبڕی‌و ئاسمان هەر بەقەد سینییەکی مسین لە نێو هەردوو چاوانی پڕ ترس‌و سامتدا تیژ دەخولایەوە، تەکانێکی دیکەت داو وا گەیشتیتە نزیك دوکانەکەی (سلێوە)، دوا هاوارت بۆ ئەو بوو بتبینێ، وەلێ ئەو هاوارە تاساوە لە قورگتا خنکاو هەر دەرنەهات، لەپەو روو کەوتیت، وایت لە ژێر دەست‌و پێیان، تەواو.. شەکەت‌و ماندوو نەتدەتوانی کێل بیتەوە، دەیەها پۆلیس‌و سەربازو سەگوڕو باش بۆزغ گەیشتنە سەر سەرت، بە دار دڕیان بەو خەڵکە دەدا، لە دە لاوە سەدەها دەست بەرزی کردیتەوە، دەتووت یەك شار دوژمنتەو دەیەوێ دەستی بتگاتێ، بە شەقێك.. بە تفێك.. بە جنێوێك تۆڵەیەکی نادیار لە تۆ بکاتەوە، ئەفسەرێك بە دارەوە لە خەڵکەکەی دەخورییەوە، لۆرییەکی قەفەزدار گران جادەکەی دەبڕی نەبا

یەکێك بشێلیّ، دەرگای قەفەزەکەیان کردەوە، هەر بە شەق و پاڵ سەریان خستی، گرەو چەقەچەقی ماشێنەکە تێکەڵ بە هەراو هۆریاو زریکەو زەناو فیکەو جرتو چەقەنەی ئەو حەشاماتە بوو، زۆر گران ریّی خۆی دەکردەوە، لەودیو شیشەکانەوە لە بازاڕو دوکانو موغازەو خەڵکە دەم بە هاوارەکە ورد دەبوویتەوە، بایەکی کزر ئارەقەی لەشتی سارد دەکردەوە، چاوانی لێڵت رەشکەو پێشکەیان دەکرد کە ویستت بزانی ئەوانە کێن دەنێو قەفەزەکەدا، هیچ کامیانت نەدەناسییەوە، هەر هەمووان بەسەر یەکدیدا تلیسابوونەوە، هێشتا هی ئەوە نەبوو بەرچاوانت روون بێتەوە، تەواو.. شار بەدەر کران.. هەر ئەو رۆژە لە خەستەخانەیەك کۆیان کردنەوە کە پتر لە سەربازگە دەچوو، لەو قەفەزەوە بۆ ئەو قەفەز، لەو پیکەبەوە بۆ ئەو جێب، لەو ژوورەوە بۆ ئەو ژوور، لەو قاوشە بۆ ئەو قاوش، بە پەلە قژیان بۆ داپاچین، هەر شێتێكو کەوتە نێو دەستە جلێکی تازە، بە راڕەوەکاندا یەکدیتان دەدی، باڵبەست کراو، شێتە هارەکانیش بەسەر عارەبانەکانەوە شەتك درابوون، لە قاتی یەکەمەوە بۆ دووەم، لە دووەمەوە بۆ سێیەم، شرینقە دوای شرینقە، هاوارەکان دەنگی دەدایەوە، ئەو دوو کەسەی لە هەردوو لاوە چنگیان لە هەردوو قۆڵت کردبوو بە هەڵقە خەریك بوو پەنجەکانیان بگەنە سەر ئێسقانەکانت، لە هەر ژوورێکدا تاوێك رامانو لیّ ورد بوونەوە، ورتە ورتێكو پەنجەمۆرو کەوتنەوە نێو راڕەوکان، لە دوورەوە کەسێك وا دەیقریشکاند کە پتر لە قریشکەی پێش سەربڕین بچێ، ئەو هەموو ژنو پیاوە بیّ دەنگو سپی پۆشو غەمگینە بۆنی

مەرگیان لێ دەهات، یەك شەو مانەوە یان لە دوای لە هۆش خۆچوونێکی درێژخایەنی چەندین شەوو رۆژ بەسەر تۆو شێتەکانی دیکە تێپەڕیونو نەتانزانیوە، بەو سکە برسییەت بێ لەوە دەچێ یەك سەدەی تاریك بێ لێرە بەندکرابیت، بەو هەموو چڵکەی کە هەر هەموو گیانتی خستۆتە سەر خوروو، بەو هەموو ئەسپێیەی لێت دەکەونە خوارێ، بەو هەموو تینوێتییەی وا لە قورگتا، بەو هەموو برینە زۆرو وشکەوەبووەی سەر دەستەکانتو پێیەکانتو هەر هەموو ئازای جەستەت.. لەوە دەچێ لە زەمانێکی زووەوە لێرە خزاویت، جگە لە زرەی زنجیرو چەقەچەقی قوفڵو کلیلو ترپەی پێی یاساوڵەکان هیچ نەدەگەیشتە گوێت، لە شریقەی راکێشانی میلی ئەو هەموو تفەنگە لەوە دەچوو سوپایەك لەودیو دەرگاکانەوە بەتەمای جەنگ بن، لە بارستاییو چڕی ئەو هەموو تاریکییەی دەڕژێتە ناو چاوان مرۆ گومانی ئەوە دەکات کە بیانەوێ هەمووتان کوێر بکەن، بە پێی ئەو هەموو ناڵەو نرکەو گریانە بێ، ئەو هەموو لاوانەوەو هەنسکە دەبێ ژمارەیەکی زۆر لەودیو شیشەکانەوە، لێرەو لە دەرەوە، مردبن.

ئەو رۆژە هەموو شتێك زۆر خێراو بە پەلە جێبەجێ کرا، وەك ئەوەی زوو بیانەوێ ئاسەواری تاوانێك بسڕنەوە، تا درەنگانێ، دەنێو شاردا، لێرەو لەوێ گوێت لە شەقژنی گوللەکان دەبوو، لێرەو لەوێ خاوەن کۆگاکان گەسکیان لە وردە شووشەی شکاوو رژاوی جامخانەکان دەدا، کۆمەڵ بە کۆمەڵ لەسەر شۆستەو ناو چایخانەو مەیخانەو دوکانو بازاڕوماڵەکاندا دەیەها رووداوی سەیری عەنتیکەی ئەو رۆژەیان دەگێڕایەوەو دەتریقانەوە.. هەر

---

کەسەو بە جۆرێك چیرۆکەکانی دەگێڕایەوە، بەدەر نەبوو لە درۆو فیشاڵی زۆر، هەموو شتێك وردو باریك پێچرایەوەو حەکایەتی شێتەکانی شار سەرقاپی نرایەوە، لەو شەوەدا خەڵکی گوێی هەڵدەخست تا بزانن وەڕینی سەگە بەڕەڵڵاکان کەمتر بۆتەوە، تا شەوخەوتنان باس هەر باسی راوی سەگە بەڕەڵڵاکان و مەزاقی خۆشی سەگوژەکان بوو.. چیرۆکی شار بەدەرکردنی شێتەکان..

دەمەوئێوارە بوو.. ئەو وەختەی مەلەکان دەگەڕانەوە نێو دارستانەکان، خۆرەتاوێکی خوێناوی دەڕژایە ناو ئەو حەوشەیەی لۆرییە قەفەزدارەکانی لێ وەستابوو، مەلەکان بە خەمەوە دەیانچریکاند، وەك ئەوەی لە هاتنی شەو بترسن، یەك دووانێ لەو شێتانەی لە بەردەم لۆرییەکان باڵ بەست کرابوون و دەخرانە ناو قەفەزەکان سەرییان هەڵبڕی، بگرە لە کەلێنی شیشەکانیشەوە هەوڵی ئەوەیان دەدا مەلەکانیان لێ بزر نەبێ، تۆش بۆ تەنها ریشۆڵەیەك دەگەڕای، دوا پۆل تا دڵنیابێ لەوەی زستان بارگەو بنەی تێك ناوەو بەهار هاتووە، تاك و جووت سەریان دەخستن، یەکەیەکە قەفەزەکان پڕ دەبوون، ئەو دەرمان و دەرزییانە هەر هەمووانی سست و تەمبەڵ و خەواڵوو کردبوو، پاش سەرکەوتنی هەر هەموو شۆفێرەکان و خۆقایمکردنیان لە پشت سوکانەکانەوە بەیەکەوە گڕیان لە مەکینەکان بەرداو کەوتنە دوای یەکدی، گران وەك ئەوەی تەرمێك بەرەو گۆڕستان بەرن بەنێو جادەکانی شاردا رووەو بەغدا رێیان دەبڕی، بۆ دواجار غەمگینانەو گێلانە لە درەختەکانی لاڕێگاو دارتەل و ماشێن و ماتۆڕو پاسکیل سوارو

دوكـانو بـازاڕو خـانووە كپـەكان ورد دەبوونـەوە، لـە ڕێبـواری هـیلاكو مانـدووی سـەر ڕێگاكـان، لـەو منالانـەی لـە دەرەوەی قەفەزەكان لە هەلەكە سەمادا بوون، بە پەنجە ئاماژەیان بۆ نێو قەفەزەكان دەكرد، دەرویش.. تۆ دەتزانی ئەمەیان دوا نیگاو دوا مالئاواییە لە شار، لە دوورەوە گوێت لە زریكەی بێ ئامانی شەمەندەفەرەكە بوو، وەك ئەوەی ئەو هاوارو زریكەیە بۆ خەمو پرسەو دەردی تۆ بێ، هەر هەموو دەردو خەفەتو قەهرو حەسرەتو حەژمەتو خۆشی سالانێكی زووت لە دلدا پێچایەوە، بە جادەو كۆلانو بازاڕو قەیسەریو مالەكانەوە، كە یەكەمجار هاتیتە ئەم شارە، لە دوورەوە قەلا دەركەوت، دەتووت كیسەلێكی زەبەللاحەو لەپەر روو كەوتووەو ناجوولێ، هەنووكەش دەنێو تەمو مژێكدا دوا شت قەلایە ون دەبێ، وات زەن دەكرد كە هێشتا وایت دەنێو حەشاماتەكەو شانو پیل دەكوتی، لە قۆرتێكەوە دەكەویتە ناو قۆرتێك، سەرت بەر دارتەلەكان دەكەویو رادەچەنیت، لە چالێكەوە بۆ چالێك، لە دەستێكەوە بۆ دەستێك، ژوورەكان، ڕاڕەوەكان، قاوشەكان، دەمو چاوەكان.. سەرو كەللەت.. دەمو چاوت.. نەرمایی گوێت.. لچو لێوو زمانت.. سەر دەستەكانت.. قۆلو باسكت.. پێو پلو.. هەردوو بەلەكو لاڕانت جێ برین بوون، هاوارەكان لە گوێتدا.. لە نێو كاسەی سەرتا دەزرنگانەوە، هۆی هاكان، قاژەقاژی سەدەها پۆلە ریشۆلە لە ئاقارێكدا، گوێت لە هاواری خۆتە.. هەمین.. هەمین.. لە ئاسمانەوە بەر دەبیتەوەو ناكەویتە سەر زەوی، دەكەویتە ناو

بیرێك بنی نییە، لە زیندە خەوێکی دیکەدا دەکەویتە ناو دەمی کراوەی ئەژدیهایەك، لە خەوێکی دیکەدا دەکەویتە سەر مارێکی پەپکە خواردوو لە بنی بیرەکەدا، تۆ وەئاگای یان خەوالّوو؟ بەسەر ترۆپکی چیایەکەوە رووەو دۆڵێك غل دەبیتەوە، بەر گاشە بەردەکان دەکەویت‌و رایان دەماڵی، لە هەموو شوێنەکانەوە، شوێنە دوورو نزیکەکانەوە، لە هەموو زەمانە زۆر دێرینەکانەوە خۆت دەدزیتەوە، دێیتەوە ناوخۆت‌و راوەدووی ئەو ئازارە دەنێی کە رۆحت هەلاهەلا دەکا، لەو دوورەوە لەوە نەدەچوو شارێك کە وا غەرقی تەم‌و مژە.. وا کپ‌و خامۆشە ئەو هەموو قیامەتەی دیبێ، تۆ هەر چاوت بە دواوە بوو، تۆ بڵێی هەمین، چ مردوو.. چ زیندوو، هۆ لەوێ بێ؟ لەوە دەچوو هەر هەمووی خەونێکی ناخۆش‌و ئەبەدی بووبێ.. خەونێك کە تا هەنووکەش لێی وەئاگا نەهاتبیت، خەونێك لە خەونەکانی پیاوێکی پیرو شەقی، تۆ کە هەنووکە بەندەواری قەفەزێکی، لە تەك کۆمەڵێ شێتی دیکە کە بێ ورتەو خامۆش لە تاو هیلاکی راوەڕاوی ئەو رۆژەو سیحری دەرزی‌و دەرمانەکان مات‌و مەلوول سەریان بەسەر سینەو شانی یەکدیدا کەوتبوو، هەموو شتێك‌و یادێکت لەگەڵ خۆتدا پێچایەوە، وەك رێبوارێك کە بۆ دوا سەفەری ئەبەدی، سەفەری بێ گەڕانەوە.. توێشەبەرەیەك هەڵبگرێ، بوخچەیەك.. هەگبەیەك بخاتە سەرشانی: ئاواهی لە دڵتا هەر هەموو کوڵان‌و بازاڕو قەیسەری‌و منارەو قەڵا و بگرە جۆگەلە پڕ سیانەکانت هەڵگرت، هەر هەموو ریشۆڵە مردووەکان، حەزی هەمین‌و حەیرانە

کوژراوەکان، لاوکە بە ئێش و بریندارەکان، هەر هەموویانت خستە نێو دڵتەوە، نێو ڕۆحتەوە، سەرت هەڵبڕی، جادەکە بەرەو دواوە دەکشا و دەگەیشتەوە شارێك کە کۆنە جووتیارێکی نەحەواندەوە، پڕشنگی خۆری دەمەوئێوارە تیشکێکی ڕەشی عەکس دەکردەوە، جادەکەش وەك مارێکی ڕەش و زەبەللاح دەکشا و هەردەکشا تا لێت دوور دەکەوتەوە لە پنتێکدا.. لە خاڵێکدا وەك ونبوونی خۆت و هەمین، وەك هەموو شتەکانی ئەو دونیایەت ئاودیو دەبوو، لە دووری دوورەوەش تا چاو بڕ دەکا بەراست و چەپدا هەر ساکە دەشتە و لێرە و لەوێ وەك ئەوەی زەوی قونێری دەردابێ زورگ و گردۆلکە دەردەکەوتن، بە بەری ڕۆژئاوادا و ڕووەو ئاسۆیەکی دوور کە لە خوێناوی خۆردا نقوم ببوو تەمێکی ئەرخەوانی دەهات، دەهات.. تا دواجار لە نزیکەوە ئەو هەرد و دەشت و گرد و زورگ و سەوزاییەی دەنێو ڕۆناهییەکی سووربادا دەلەرانەوە: وەك ئەوەی سەرئاو کەوتبن، لە دووری دوورەوەش خانووە هەرە بەرزەکان یەکە یەکە غەرقی تەنکە تاریکی و تەمی ئەو ئێوارەیە دەبوون، ئەو تاریکییەی دەتووت خودا و فریشتەکانی بە پەلە و خێرا چنگ لە دوای چنگ لە ئاسمانەوە هەڵیدەدەن و پەرتی دەکەن، هیچ پنچکە گیایەك و گاشە بەردێك نامێنێ کە پشکی خۆی لەو تاریکییە نەبات، دەیرژێننە سەر شارێك کە مەگەر تاریکی شەو بە میهری خۆی گوناهەکانی داپۆشێ، شارێك لەو شارانەی کە لە خەونێکی هەڵبزڕکاودا ببینی، شارێك کە بە درۆ دروست کرابێ، شارێك لە شارەکانی نێو حەکایەتە کۆنەکان کە

پیرەژنێکی ددان کەوتوو وەسفی بکات، قەڵاکەی لەسەر ئێسكو پروسكی هەژاران بێو.. منارەکەشی کەللەسەری عاشقەکانی، چاوت تێ بڕی، لەو دوورەوە گڵۆپەکانی دەبوون بە گڕی کزی.. زەردو لەرزیوی چراکانو.. تا دەهات شەپۆلە تەنکەکانی ڕۆناهی دەمردن کە وەك نواڵە دەردەکەوتن، دەتووت کۆمەڵێ چرانو بە دەست هەزارەها خنکاوەوەن دەنێو دەریایەکی پڕ گێژەنە، دەنێو گەرداوێکدا یەکە یەکە دەکوژێنەوە، دواجار قەڵاو منارەی چۆڵی کەوتنە ئەودیو زەریاوە، ئەودیو دونیاوە، ئیدی شار بێ شێتەکانی چ دەکا؟ لێیان رامایت.. خامۆش.. خامۆش.. ماتو مەلوول، کتو پڕ لەوە ترسای هەر هەموویان خەوتبن.. مردبن.. دەبوو چەندین شەو بنوون تا هیلاکی راو راوێنی ئەو ڕۆژە لە گیانیان دەرچێ، لە ناکاو یەکێکیان دایە پرمەی گریان، گریانێکی پڕ حەسرەتو قووڵ، بە دەم هەنسکەوە قرخەقرخ لە قورگییەوە دەهات وەك کەسێك کە تەقەللا بدا نەخنکێ، دەتووت لە هاتنی تاریکیو سەفەری نادیارو ئەو ڕێیە دوورە دەترسێ، بە ترسەوە دەگریا، هەروەك منداڵێکی تازە فام کردوو کە لە باوەشی دایکی بەزۆر دەریان هێنابێ دەگریا، یەك دووانێکی دیکەش هەستانەوە سەرپێو توند دەستیان بە شیشەکانی قەفەزەکەوە گرتبوو، ناوناویش سەریان دەکێشا بەو ئاسنە رەقەدا، وەك کەسانێکی ئازیز مردە بەکوڵ دەگریانو لەو ئاسۆیە رادەمان کە لە تاریکیدا غەرق دەبوو، وەك ئەوەی بەندی حەیرانێك یان لاوکێك بسەننەوە، هەنسكو گریانیان لە یەکدی دەسەندەوە، وەك ئەوەی بەندێك بە

بەندێك تەواو بکەن، وەك کۆمەڵێ کەس کە سزای مەرگیان بەسەردا درابێ و کڕینەوەی ژیانیش ئەوە بێ کامەیان لەو گریانە دەیباتەوە، تەنها یەك کەس دەژی و ئەوەی گرەوەکە دەباتەوە ئەوەیە کە تا ئەبەد ژێر نابێتەوە، ئەوانی دیکە کە دۆڕاون، هەر هەموو دەمرن.. هەر یەکە لە گریانی ئەوی دیکە دەترسا، هەریەکەو گەرووی دەبوو بە دەربەندێکی بەرتەنگ و گریانیش لوورەی رەشەبایەکی هەڵکردوو، ئەوەی کە ماندوو دەبوو لە گریانەوە دەیکرد بە قروسکە، قروسکەی سەگێکی کوژراو لەو رۆژە رەشەدا، رۆناهی مردووی ئاسمان و تریفەی تەزیوو تازە هەڵهاتووی مانگ و ئەستێرە هەرە دوورەکان تنۆکی ئەو فرمێسکانەی دەدرەوشاندەوە کە بەسەر روومەتی هەندێکیاندا دەڕژان، کەمجار دیبووت یەکێك لەو شێتانە بگری، شەوەهای شەو کە لەسەر تەختەی چایخانەکان و بەرهەیوانی مزگەوتەکان لەگەڵیانا دەخەوتی، غەمگین و خامۆش دەبوون، بە شەر دەهاتن، تووڕە دەبوون، سەریان بە دارو دیواردا دەدا، وەلێ نەدەگریان.. خەونیان دەدی، وڕێنەیان دەکرد، هەڵیان دەبزڕکاند، دەترسان، لە خەمان لەسەر چاو دەکەوتن، دەبوورانەوە، دارکاری، جنێو، تف، زاماربوون، خوێنیان دەدی، دەیاننرکاند، دەیانقیژاند، وەلێ نەدەگریان، بە دیار مەرگی یەکدی‌یەوە دۆش دادەمان، کەچی وەك ئەوەی بڵێن: (خۆش بەحاڵت..!)، بێ باکانە زەردەیان دەهاتێ، تۆ بڵێی دەنێو ئەو قەفەزەدا خۆ بە چەند فڕندەیەکی باڵ بەستکراو بزانن؟ یەکێکیان توند بە ناو لەپ لە تەوێڵی خۆی دەدا، بە پەلە

هەردوو دەستت ئاخنیيە گیرفانەکانت، لە شقارتەیەك، چەرخێك دەگەڕای، تاوەکو دایگیرسێنی.. دەتویست شەبەنگێك لە ڕۆشنایی چ لە ئاسمانەوە بێ چ گڕی بێ تینی چەرخێك وا بکات تارمایی یەکدی ببینن و، هەریەکەتان دڵنیا بێ کە بە تەنیا نییە، هەر هەمووتانن، ئەوەتان لێرە.. قەفەزێك کۆی کردوونەتەوە.. لەوانەیە گڕی دەنکە شقارتەیەك غافڵگیریان بکات، لەوەدایە لە تاریکی و تەنیایی و ئەو خامۆشییە زۆر قووڵە بترسن، کێ دەزانێ؟ لەوەدایە سەرمایان بێ، یاخود برسی بن، دەتووت هەر هەموو حەسرەت و ئاخ و هەنسك و قوڵپی گریانەکان دەنێو قەفەزەکەدا گیریان خواردووەو ڕێ دەرنابەن، هێدی هێدی گریان و هەنسکەکان دەخنکان و دەچوونەوە ناو قورگ و.. هەناوەوە.. رووخسارەکانیش، لە نێو ئەو تاریکییەدا، لە ژێر فرمێسك و ئارەقەو ئازاردا نوقمن، تاوتاوەش دەنێو تاریکی و خامۆشییەکی دڵ پڕوکێندا گوێت لە نزگەرەیەك، هەناسەیەکی خنکاو، هەنسکێك یان خەنینەوەیەکی گێلانە دەبوو، جاروباریش لایتی ماشێنێکی تیژتێپەڕ ناو قەفەزەکەی ڕۆشن دەکردەوە، قەفی زنجیری بەستراو لە دەستی راستی هەر یەکەیان دەبریسکایەوە، زنجیرەکەی دەستی خۆتت سەح دەکردەوەو دڵت دەبوو بە ئاو، تا دەهات خامۆشتر دەبوون، هەموویانت دەناسییەوە، بێ ئاگا لە تۆو، لە دونیا.. لە بۆشایی و تاریکی رادەمان، لە هیچ رادەمان، بێجگە لە تۆ هیچ کامیان نەیدەزانی دوا مەنزڵگا شێتخانەیەکی پایتەختە، کابرای شۆفێریش لە پەنجەرە بچکۆلەکەی پشتی

سەری‌یەوە لێتەوە دیار بوو کە تا درەنگانێ لەگەڵ پۆلیسێکی سیدارە خوار دەدواو ئەویش سەری بۆ دەلەقاند، تاوتاویش دەنێو دووکەڵی جگەرەدا خۆیان ون دەکرد، یەك دوو جاریش ئاوڕیان دایەوە، دوای تاوێك بێ دەنگی شۆفێرەکە میلی رادیۆکەی باداو.. لە ئاوازێك دەگەڕا، ئاوازێك دڕ بە تاریکی بداو.. ڕێی سەفەر کورتتر بکاتەوە، سەیرە.. لە ناکاو وەك داڕژانی خەمێك لە دڵدا، یان درەوشانەوەی خۆشی‌یەك لە ڕۆحدا، سەرەتای بەندێك بوو کە بە ئاهێك کۆتایی دەهات، وەك لە غەیبەوە بێ، لەو زوڵماتەوە کە دەوری قەفەزەکەیان تەنی بوو.. ئاوازێك زۆر غەمگین دەهاتە بەرگوێ، سەدایەك.. نرکەو ناڵینێك.. نووزەیەك.. ئاهێك.. کسپەو.. حەژمەتێك.. حەیرانێکی بریندار لەسەر شەپۆلی نەرمەبایەکی فێنك تێکەڵ بە بۆنی نێرگزەجاڕی ئەمبەرو ئەوبەری جادەکە دەڕژایە دڵتەوە، ئاە.. خودایە.. چ عومرێکی درێژەو تۆ حەیرانێکت نەوتووە، لاوکێکت نەچڕیوە، لەوەدایە دەنگت رزی بێ، تۆ بڵێی هیچت لەبیر مابێ؟ ها؟ ڕۆحی کلۆڵت بەیتەکانی ئەو حەیرانەی دەوتەوە، سەری کەیلت، کەللەی گێژت نەدەهات بە پیری‌یەوە، نەدەهات.. نەدەهات.. ئەو لەرەلەرەی نێو هەناسەی حەیران بێژەکە هەر هەموو کۆنە برینەکانتی کولاندەوە، دوور دەیبردیت‌و تاوێك‌و دواجار دەنێو قەفەزەکەدا بەندی دەکردیتەوە، دەتویست وەك ئەو سەداو خوێندنە کە شەپۆڵە نووستووکانی تاریکی دەشێوێنێ‌و تریفە دەخاتە سەماو.. ئازادو دوور تا جریوەی ئەستێرەکان سەفەر

دەکا، سەفەر بکەیت و نەیەیتەوە.. نا.. ئەوە حەیران نیی‌یە، برینەو خوێنی لێ دەڕژێ، بە دەم ئەو ئاوازەوە دڵت خوێن دەدەڵێنێ، خوێنێکی رەش، سەرت خستە ناو کۆشت و قوڵپی گریانێک دەیبردیتەوە ئەو ئێوارە زۆر غەمگینەی کە هەمین تا ئەبەد ئاوابوو.. نەهاتەوە.. تاوەکو نەخنکێی وەك کەڵەکێوی‌یەکی لە خوێندا شەلاڵ سەرت هەڵبڕی و هەناسەت دا، حەیران بێژ چیرۆکی عیشق و ئەوینێکی نامراد و کوژراوی دەگێڕایەوە، کافرانە دەیچڕی.. دەتووت بەو سەدا زۆر غەمهێن و یەکجار شیرینە شێتەکان خامۆش بوون، عاشقانە هەڵدەستا و شێتانە دەنیشتەوە، بۆن کروزێك لەو چریکەیە دەهات، بۆن کروزێك کە بیەوێ بۆنی نێرگزەکان وەدەر بنێ، وەك مەلێکی پێکراو دەیچریکاند، وەك شاخێکی بن کوڵ و ڕماو دەینالاند، وەك رەوەزێك بۆ ناو خەرەندێك هارە بکا دەیقریشکاند، وەك (با)یەك بەسەر باخێکی سووتاودا شنە بکات.. هەڵیدەکرد، ئەو ئاوازە بەو نەغمەوە لە قەرارێکەوە دەهات کە هەزار جار بە ئاگری دۆزەخ سووتا بێ، چ رێکەوتێکی کوشندەو زاڵمانەیە.. حیلەی ئەسپێك کە بگلێ هاتە بەرگوێت، مەلێکی کێوی بە چریکەیەك.. چریکەیەکی تاساو لە ئاسماندا وەلامی حیلەکەی دایەوە، دوور روانیت.. لە ژێر تریفەدا تا ئەو شوێنەی چاو هەتەر دەکا دەغلێك نەرمە نەرمە بە بەرچاوتەوە کەروێشکەی دەکرد و دەشنایەوە، گوێت لە ورشە ورشی نەرمی گیا بوو، دەتووت بۆ قەهری تۆ بە سووکی شین و واوەیلا دەکەن، پڕ بە هەردوو سی‌یەکانت و بۆ دواجار بۆنی

نێرگزەکانت هەڵمژی، دەتووت لەگەڵ تریفەدا دەڕژێتە نێو قەفەزو لەوێدا بەند دەبێ، تا سەر تەنکایی ڕۆح و پەڕەی دڵ بۆنیان کاس و وڕو گێژی کردی، بە چرپەوە.. چرپەیەك بە ئاستەم و دووبەرا لەگەڵ خوێنی ڕژاوی ئەو حەیرانە زامدارە دەیبردیتەوە ئەوێندەرێ، دەیبردیتەوە بۆ زۆر شوێن و سەردەمانێکی زۆر زووتر لە هەنووکە، چرپەیەکی ناسك.. ناسکتر لە هەموو شتێکی ئەم دونیایە پەردەی گوێیەکانتی بە سەما و لەرینەوەی قەهرێك دەخست.. گوێت لێیە؟

(دەروێش..

ئۆبالی منت بە ئەستۆ..

ڕۆژ بازاڕی قیامەتێ..

ئەگەر مردم تووخوا نەکەی لێرە بمنێژی..

بمبەوە.. بمبەوە دەشتێ.. گوندەکەی خۆمان..

گەردنت ئازا ناکەم..

ئەگەر لەسەر "گردی عاشقان " نەمنێژی؟

ئاخر کوڕەتیم زۆری تێدا نەژیام..

دەبا بە مردن بچینەوە ئەوێندەرێ..

ئەوجا هەموو فەسڵی بوهاران وەرە سەر گۆڕەکەم و دووسێ چەپکە نێرگز لە بەر پێیانم..

نا.. نەکەی..

لە کن سەرم دابنێ تا تێرتێر بۆنیان بکەم..

**ئەمن دەزانم بایز..**

**جارەکی دیکە ئەوێندەرێ نابینمەوە..**

**ئەمن دەزانم هەردووکمان گۆڕ غەریب دەبین..**

**ئەمن دەزانم..!)**

**گوێ بۆ دوا بەندی حەیران بێژەکە شل دەکەی، دەتویست بزانی کامەیانە: حەمەد بەگ، حەمەی حوسێنی پیرکی، رەسوول گەردی، سمایل فەللاح، عوسمان حەیران، کەریمە رەش، خدری رۆژبەیانی، مستەفا کوێر، مەجید جبرائیل..؟ نازانیت.. نا تۆ هیچت بیر نەماوە.. تەواو.. حەیرانو حەیران بێژەکانیش تێکەڵ دەکەیت.. گوێت بۆ شل کرد، شێتەکانی دیکەش سرتەیان لێوە نەدەهات، هەر دەتووت ئەو چریکەو سەدای حەیرانە خامۆشی کردوون:**

***حەیران.. چەندم گاز دەکرد***

***گوندێ مە لە من بە زورگو تەلانە***

***دەرمانی دەردان شەو راموسانە***

***بازو سەقەر لێیان کردینە هێلانە***

***لە عەوامی گوندێ مە کەیفو سەیرانە***

***چکەم لە بەژنەکی باریکو زەندەیێ بە بازن***

***ئەوسارەکە بەوێ دەرە بوهارێ***

***کۆچو بارکردنە***

***دەست لێک بەردانە***

**دەتویست دوا بەندی لێ وەربگریتەوە، سەر بەندو دوا بەندت**

لێ تێکچوو.. لێت تێکەڵ بوون، هەرچەندی کردت و کۆشات ئەو حەیرانەت بیر نەکەوتەوە، تاوە خەمێك دڵتی دەگوشی و تۆش بە چەپۆك لەسەری خۆت دەداو.. نەك هەر سەدای ئەو حەیرانەی هەوای ناقەفەزەکەی پڕ کردبوو لە خرۆشی خەم، بگرە تاکە بەندێکت بیر نەدەکەوتەوە، هەتا ئەوەشیان کە هەزاران شەو بۆ هەمینت چڕی بوو.. نا.. لەوە دەچێ چڕینی تەنها بەندێك بووبێ بە مەحاڵ، وشەکان لە نێو کاسەی سەرتا وەها تێکەڵ دەبوون کە هیچ مانایەکیان نەدەدا.. بێ هوودە بوو.. دەگەڕای.. دەگەڕای.. بۆ سەر بەندێك و.. کەچی هیچ..

ئەوڕۆ.. ئەمن دەگەڕام.. بەوێ
سبیانێ.. کارمامزەکم.. چاوی هەمینێ
بمابا.. هەردەستاند.. ئەوجا..
دونیا.. لە تەمێ.. تەم.. تومانێ
کەپرەکی بکەم.. ئەوەل مانگی.. ئەمن کولیکەك..
پایزێ.. سبەینێ لە کاولە گوندێ.. نوسکەی
تاژیان.. سەردەمەکی.. حەیرانەکەی
من.. لە دەشتی.. ی.. ی.. کا..
ولە.. قەراجی.. دەبڕی گۆشەی مافووری
بە ئاوی قەنەفرێ.. گوارێ.. خەز.. زەرد..
مەمەمکان.. لوقمانان.. قەراتی پیرە هەولێرێ..
کیــــژ.. ..
رەبی هەردوو چاوی..
— لێم بوویتە.. عەزرەت و.. قاتی

نا.. تاکە بەندێك چ‌ی‌یە نایەتەوە سەر زارت، هەر هەموو بەندەکان لەگەڵ ئاوابوونی (هەمین)ێ لە ڕۆحتا نەمان‌و ئاوابوون، بە چرپەوە، هەروەك ئەوەی هەمین لە بن پەڕەی گوێی چەپتەوە بتدوێنێ:

**(بایز..**

**هەموو جارێ کە هاتی‌یە سەر قەبرەکەم..**

**تووخوا مەڕۆ هەتا بەندەك.. دووانم لۆ دەرێی..**

**ئەو بەندەی کە خۆم حەزم ای‌یە..**

**ئەتوو گۆتنی خۆت بکە..**

**ئەمن سەد جاران مردبم‌و دەپی‌یان لە بن عەردی بم..**

**خەمت نەبی.. دەنگت هەر دەگاتە من)**

ئیدی تەواو.. دوا وەسیەتیت پێ بەجێ نایە، ناشزانی گۆڕەکەی وا لە کوێ، ناشزانی خۆت لە کوێ گۆڕ غەریب دەبیت، بەهاران دێن‌و رادەبرن، کەچی تا ئەبەد ناتوانی چەپکێك نێرگز بخەیتە سەر گۆڕەکەی، حەیرانێك بچڕی، هێدی هێدی بۆنی نێزگزەکانی هەردوو بەری جادەکە دەڕەوییەوەو بە تەنیا لە ناو قەفەزەکەدا جێ‌یان دەهێشتی:

**(دەروێش.. ئۆباڵی منت بە ئەستۆ..**

**.. لێروکانە مەمنێژە.. گەردنت ئازا.. بمبەوە..**

**ئەوجا.. هەموو فەسڵی بوهاران..**

**چەپکە نێرگزەکەم.. لە کن سەرم دابنێ.. تا تێر.. تێر**

**بۆنیان بکەم.. ئەوێندەرێ..**

**نابینمەوە.. ئەمن دەزانم کە هەردووکمان گۆڕ غەر..**

**ئەمن دەزانم..)**

تەواو.. تاریکی تۆو هەموو شێتەکانی ناو قەفەزەکەی لە خۆیەوە لوول دەدا.. خەریکە دەخنکێی.. خودا هاوار.. قوڵپی گریانێکی بەکوڵ لە شوێنێکەوە، لە ناو جەرگو هەناوتەوە دەهات، قووڵ وەك ئەوەی لە بنی بیرێکی تاریكو پڕ ئەسرینەوە بێ.. کە بە هەزار قولاپو چەنگاڵەوە لە دڵتەوە.. لە رۆحتەوە دەری کێشنو هەڵیتەکێنن، وەك مەنجەنیق دەکولای، تا دەهات ئەو قوڵپە گەرمە سەری دەکرد تا لە چاوانتا وەك دوو کانی خوێناوی تەقینەوە، بێ شەرمانە سەرت خستە ناو کۆشتو داتە پرمەی گریان، خامۆشی شەوی ناو قەفەزەکەت پڕ کرد لە هەناسەو هەنسك، بێ ئەوەی شەرم لە شێتەکانی دیکە بکەی، ئەوەندە کپو خامۆش بوون وەك ئەوەی بە شەرمەوە حورمەتی ئەو گریانە جەرگبڕەت بگرن، ئاسمانیش تا دەهات پتر چڕی تاریکی دەڕژاند، دیسانەوە وەك عەبایەکی رەش تۆو قەفەزەکەو شێتەکانو هەر هەموو دونیای لە خۆیەوە وەردەپێچا.. بە دەم هەنسك هەڵدانەوە هەر دەگریای.. دەگریای.. گریانێکی وا بە کوڵو دڵ.. وا درێژو نەبڕاوە کە تا ئەبەد لێی کڕو.. ژێر نەبیتەوە!

---

